# قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زانست

## توێژینەوەی کتێبە پیرۆزەکان لەبەر ڕۆشنایی زانیارییە نوێیەکان


دانانی

مۆریس بۆکای

وەرگێڕانی

قاسم عەلی

| | |
|---|---|
| نـــاوی کتێـــــــب: | قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زانست |
| دانـــــــــــانی: | مۆریس بۆکای |
| وەرگێڕانـــــــــی: | قاسم عەلی |
| نـەخشـەسازی ناوەوە: | کۆمپیوتەر کامران رفیق |
| نورەو ســـاڵی چـــاپ: | چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٦ |
| ژمـــــارەی سپـــاردن: | (٢٨٠) ی ساڵی (٢٠١٦) ی پێدراوە. |

هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

## مۆریس بۆکای کێیە؟

(مـۆریس بۆکـای Maurice Bucaille) پزیشـکێکی فەرەنسـاییە، وەکـو مەسیحییەکی کاسۆلیکی فرچکی گرتووە، لە ١٩٢٠/٧/١٩ لە فەرەنسا لەدایك بووە، لەبارەی سەرەتای گۆڕانی فیکرییەوە ڕووداوێك دەگێڕێتەوە: ((لە ساڵی ١٩٣٥ لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا بووم، هێشتا قوتابیی قوتابخانەیەکی مەسیحی بووم، لەو ماوەیەدا باوکە (پیرۆنییە) کە یەکێك بوو لە زاناکانی بواری هەڵکۆڵینی بەبەردبووە جیۆلۆجییەکان ڕایگەیاند: لە ئەشکەوتێکی باشوری ئیسپانیا چەند وێنەیەکی مرۆیی دۆزیوەتەوە کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ١٥ هەزار ساڵ..ئەمە لە کاتێکدا ئێمە لە کتێبی ئایین لە قوتابخانە دەمانخوێند کە گوایە دەرکەوتنی یەکەم مرۆڤ لەسەر زەوی دەگەڕێتەوە بۆ چوار هەزار ساڵ بەر لە مەسیح... تووشی سەرسوڕمان بووم و لە مامۆستای ئاییمنم پرسی: کام مێژوو ڕاستترە؟ وەڵامی دامەوە: تکایە دوو شتی جیاواز تێکەڵ مەکە: زانست لە لایەك و ئایین لە لایەکی تر، کاتێکیش ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان ئەوەی ئایین دەیڵێت حەقیقەتە! پێم گوت: ناکرێ! ئەمە ئەستەمە، ئەمە ڕاستییەکی زانستیی بەڵگەدارە، چۆن دەکرێ بۆ مێژووی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی پشت بە کتێبی ئایین ببەسترێ؟؟!))

بۆکای لە ساڵی ١٩٤٥ کۆلیژی پزیشکی تەواوکرد و لە تۆڕینگەی زانکۆ لە بواری نەخۆشییەکانی هەناو دەستبەکاربوو.

بۆکای وێڕای کاری پزیشکی و شارەزایی زۆری لە کتێبە پیرۆزەکانی یەهودی و مەسیحی، بایەخی زۆریشی بە مێژووی کۆنی میسر بە تایبەت فیرعەونەکان دەدا.

لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو بۆکای بوویە پزیشکێکی بەناوبانگ. خۆی دەگێڕێتەوە: هەر کاتێ نەخۆشێکی موسڵمان سەردانی دەکردم لەبارەی قورئانەوە پرسیارم لێیان دەکرد: لەبارەی قورئانەوە چی دەڵێی، ئایا لە لایەن خواوەیە یان موحەممەد دایناوە؟ موسڵمانەکانیش وەها وەڵامیان دەدامەوە: لە لایەن خواوەیە...منیش دەمگوت: من پێم وایە لە لایەن خواوە نییە و موحەممەدیش ڕاستگۆ نییە...من لەم پرسیارە و ئەوانیش لەو وەڵامە بەردەوام بوون تا ئەوەبوو ڕۆژێکیان (شا فەیسەڵ کوڕی عەبدولعەزیز)ی پاشای سعودییە هاتە لام و منیش چارەسەرم پێدا، هەمان پرسیارم لێی کرد، وەڵامی دامەوە: قورئان ڕاستە و موحەممەدیش ڕاستگۆیە.پێم گوت: من باوەڕ بە ڕاستگۆیی ئەو ناکەم. شا فەیسەڵ پێی گوتم: قورئانت خوێندۆتەوە؟ گوتم: بەڵێ چەندان جارم خوێندۆتەوە و لێی وردبوومەتەوە..گوتی: بە زمانی خۆیت خوێندۆتەوە یان بە زمانێکی تر؟ گوتم: تەنها بە وەرگێڕان خوێندوومەتەوە. پێی گوتم: کەواتە تۆ لاسایی وەرگێڕ دەکەیتەوە، لاساییکەرەوەش زانستی پێ نییە، چونکە دەرکی حەقیقەتی نەکردووە بەڵام شتێکی پێ گوتراوە و ئەویش بڕوای پێ کردووە، وەرگێڕیش لە هەڵە و دەسکاریکردنی بەئەنقەست پارێزراو نییە، بەڵێنم پێ بدە زمانی عەرەبی فێرببیت و پێی بخوێنیتەوە، هیوادارم ئەم باوەڕە هەڵەیەت بگۆڕێ...بۆکای دەڵێ: بە وەڵامەکەی سەرسام بووم و پێم گوت: پێش تۆ لە زۆر موسڵمانی ترم پرسیوە، وەڵامم تەنێ لای تۆ چنگ کەوت...دەستم خستە ناو دەستی و بەڵێنم پێدا لەبارەی قورئان و موحەممەدەوە هیچ قسەیەك نەکەم مەگەر فێری زمانی عەرەبی بووم و قورئانم بە زمانی خۆی خوێندەوە و بەوردی تێی ڕامام تاوەکو دەگەمە ئاکامێك بە باوەڕ پێکردن یان بەدرۆخستنەوە..

لە پاییزی ١٩٦٩ بوکای لە زانکۆی سۆربۆن دەستی کرد بە خوێندنی زمانی عەرەبی و دوای چوار ساڵ لە ١٩٧٢ بووە شارەزا لە زمانی عەرەبی.

دوای فێربوونی زمانی عەرەبی لە ساڵی ١٩٧٤ چووە میسر و دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە تەرمی مۆمیاکراوی هەردوو فیرعەون(ڕەمسیسی دووەم) و (منبتاح)ی کوڕی.

لە ساڵی ١٩٧٦ کتێبی (تەورات و ئینجیل و قورئان و زانستی نوێ)ی بڵاوکردەوە...لە ساڵی ١٩٨٢ نۆرینگە پزیشکییەکەی داخست و هەموو کاتی خۆی بۆ توێژینەوەی زانستی و لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری تەرخان کرد..لێکۆلینەوەکانی سەبارەت بە ئایینەکان و مێژووی کۆنی میسر لە فەڕەنسا و هەموو جیهان مشتومڕی زۆر نایەوە..

ئەم کتێبەی بەردەستیشت یەکێکە لە کتێبە گرینگەکانی و بۆ حەڤدە زمان وەرگێڕدراوە...بوکای دوای لێکۆڵینەوەکانی لە قورئان و دەرکەوتنی ڕاستێتی قورئان موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند..

د.مۆریس بۆکای لە پاریس لە ١٩٩٨/٢/١٨ کۆچی دوایی کرد.

لە بەناوبانگترین وتەکانی: ((قورئان لە سەرووی ئاستی زانستیی عەرەب و جیهان و زانایانی داهاتووشە، ناکرێ ئەم کتێبە لە لایەن کەسێکی نەخوێندەوارەوە دەرچووبێت، ئەمەش بەڵگەی ڕاستێتیی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدە(درودی خوای لێ بێت)..)).

# پێشەکی

هەر یەکێك لە سێ ئایینە یەکتاپەرستەکە کتێبی تایبەت بە خۆیان هەیە. ئەو بەڵگەنامانە بناغەی ئیمانی هەموو باوەڕدارێکی جولەکە یان مەسیحی یان موسڵمانێکە، هەموو باوەڕدارێك کتێبەکەی بە تۆمارێکی بەرجەستەی سروشی خوایی دادەنێت، جا لەوانەیە ئەو کتێبە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هاتبێتە خوارێ هەروەکو ئەو ڕاسپاردە و ئامۆژگارییانەی ئیبراهیم و موسا ڕاستەوخۆ لە خودایان وەرگرت. یان لەوانەیە ناڕاستەوخۆ بێت هەروەکو حاڵی پەیوەست بە مەسیح یان موحەممەد(درودی خوای لێ بێت)، مەسیح ڕایگەیاندبوو کە ئەو بە ناوی باوکەوە دەدوێت، موحەممەدیش(درودی خوای لێ بێت) ئەو پەیامەی گەیاند کە جیبریل بۆی گواستبۆوە.

بە ڕەچاوکردنی پێدراوە بابەتییەکانی مێژووی ئاینەکان وا پێویست دەکات تەورات و ئینجیلەکان و قورئان لەو ڕووەی سەرجەمیان سروشی نوسراون، لە یەك ئاست دابنێین. بەڵام ئەم هەڵوێستەی موسڵمانان دەیڵێن هەمان ئەو هەڵوێستە نییە کە باوەڕدارانی وڵاتانی خۆرئاوا پەسندی بکەن ئەوەش بە هۆی بڵاوبوونەوەی کاریگەرییە یەهودی و مەسیحییەکان تێیاندا کەوا ڕەتی دەکەنەوە سیفەتی کتێبی دابەزێنراو بدەنە قورئان.

ئەو ڕەوشانەش بە گەڕانەوە بۆ هەڵوێستی هەر گروپێکی ئاینی لە بەرامبەر دوو گروپەکەی تر سەبارەت بە کتێبە پیرۆزەکان، دەزانرێت.

کتێبی پیرۆزی یەهودییەت، تەوراتە. تەورات لە (پەیمانی کۆنی مەسیحی) جیاوازە، چونکە ئەمەی دوایی هەندێ بەشی زیاترە لە عیبرییەکەی، بەڵام ئەم

جیاوازییە پەیوەست نییە بە عەقیدەوە، بەڵام یەهودییەت دان نانێت بە هیچ سروشێکی دوای خۆی هاتبێت.

هەروەها دانی ناوە بە تەوراتی عیبری و پشتی پێ بەستووە بەڵام هەندێ زیادەی خستۆتە سەر، بەڵام مەسیحییەت هەموو نووسراوێکی کە سەبارەت بە ناساندنی پەیامی عیسا بە خەڵك بڵاوبۆتەوە پەسند نەکردووە، بۆیە کەنیسە ژمارەیەکی زۆری ئەو بەشانەی سڕیوەتەوە کە بۆ ناساندنی ژیان و ڕێنماییەکانی مەسیح بە خەڵك نووسراون، بەم جۆرە کەنیسە ژمارەیەکی دیاریکراوی (پەیمانی نوێ)ی پاراستووە، لە گرینگترینیان ئەو چوار ئینجیلەیە کە بە ڕەسمی لە لایەن کەنیسەوە دانیان پێدا نراوە. بەڵام مەسیحییەت لە لایەن خۆیەوە دان بە هیچ سروشێك نانێ کە لە دوای مەسیح و هاوەڵەکانیەوە هاتبێت، بۆیە قورئان لە سروش دوور دەخاتەوە.

بەڵام قورئان، کە شەش سەدە دوای مەسیح هاتووە، باس لە چەندان بابەت دەکات کە لە تەوراتی عیبری و ئینجیلەکاندا هاتووە، بۆیە زۆر باسی تەورات و ئینجیل دەکات. قورئان ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك دەکات ئیمان بە کتێبەکانی پێش خۆی بهێنێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا (١٣٦)﴾ النساء/١٣٦.

بەم شێوەیە قورئان جەخت دەکاتەوە لەو پلەوپایەی پێغەمبەران لە مێژووی سروش(وحی)دا هەیانە وەکو نوح و ئیبراهیم و موسا و پێغەمبەران بە تایبەتی مەسیح کە لە نێویاندا شوێنێکی دیاری گرتووە، قورئان وەکو ئینجیلەکان،

لــەدایکبوونی مەســیح وەکــو کــارێکی دەرئاســا و ســەرووی سروشــت (خــارق) دەخاتەڕوو، هەروەها بەتایبەت باسی مەریەم دەکات و سورەتی نۆزدەی بە نــاوی ئەوەوە کردووە(سورەتی مەریەم).

لە واقیعدا ئێمە پێویستە تێبینــی ئــەوە بکــەین کــە ئــەو پێدراوە تایبەتییانــەی ئیســلام کــە باســمــان کــرد بــە گشــتی لــە وڵاتــانی خۆرئــاوا نــەزانراون، ئــەوەش سەرســامــمان ناکــات ئەگــەر ئــەو ڕێگایــەمان بیرکەوتــەوە کــە لــە ڕۆشــنبیرکردنی ئەوەیەکی زۆر سەبارەت بە پرسە ئاینییەکانی مرۆڤ پەیڕەو کراوە. چۆن لــە هــەر بابەتێك پەیوەست بێت بــە ئیســلام نــەزانییان بەســەردا ســەپێنراوە، بــەم جۆرە بەکارهێنانی باوی ناوەکانی (ئاینی موحەممەدی) و (موحەممەدییەکان) تــا ئــەمڕۆ بەڵگەی ئەوەیە هێشتا ئارەزوو دەکرێت کەسەکان هەر قەناعەت بــەو ڕایــە هەڵەیــە بکەن کە دەڵێت: ئەو بیروباوەڕانە بە هۆی جیهادی پیاوێکەوە بڵاوبۆتەوە و خــودا هیچ شوێنێکی لــەو بیروباوەڕانــەدا نییــە،(خــودا بــەو واتایــەی مەســیحییەکان تێــی دەگــەن)..؟هــەروەها زۆرێــك لــە ڕۆشــنبیرە هاوچــەرخەکانمان بایــەخ بــە لایەنــە فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لە ئیسلام دەدەن بێئەوەی بە شێوەیەکی تایبەت لە سروشی ئیسلامی بپرسن کە دەبوو وایان کردبووایە. وای دەبینن کە لــە بەڵگەنەویستەکانە کەوا موحەممــەد(درودی خــوای لێ بێــت) پشــتی بەوانــەی پــێش خۆی بەستووە، ئەوەش بە مەبەستی دوورخستنەوەی مەســەلەی سروش هــەر لــە سەرەتاوە...

زێدەباری ئەوەش، هەندێ ناوەندی مەسیحی هەن سووك ســەرنجی موســڵمانان دەدەن، ئــەو کاتــە ئــەوەم زانــی کــە هــەوڵم دا دیالۆگێــك دامــەزرێنم لــەپێناو توێژینەوەیەکی بەراوردکاری لەبارەی ژمارەیەك لــەو باسوخواســانەی لــە قورئــان و

تەورات سەبارەت بە یەك بابەت هاتوون. تێبینیم کرد ئەو بابەتە تەنانەت بۆ تێڕامانیش ڕەتدەکرێتەوە وەکو ئەوەی گەڕانەوە بۆ قورئان لەو بابەتەدا وەکو پشتبەستن بە ئەهریمەن(شەیتان) بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا بۆمان دەردەکەوێ کەوا ئێستا گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لەسەر بەرزترین ئاست لە جیهانی مەسیحی هاتۆتەدی. ئەو بەڵگەنامەیەی سکرتارییەتی ڤاتیکان بۆ کاروباری نامەسیحییەکان دوای کۆڕی ڤاتیکانی دووەم بە ناونیشانی (ڕێنماییگەلێك بۆ دامەزراندنی گفتوگۆی نێوان مەسیحییەکان و موسڵمانەکان)چاپی کردووە و بۆ جاری سێیەم لە ساڵی ١٩٧٠ چاپ کراوەتەوە، گەواهی گۆڕانکاریی قوڵ لە هەڵوێستە فەرمییەکان دەدات. بەڵگەنامەکەی ڤاتیکان داوای دوورخستنەوەی ئەو وێنەیە دەکات کە مەسیحییەکان لەبارەی موسڵمانەکانەوە هەیانە ((ئەو وێنە داڕزیو و کۆنەی ڕابردوو بۆی بەجێهێشتووین یان بوختان و بڕیاری پێشوەخت شێواندوویەتی)). پاشان بەڵگەنامەکە بایەخی داوە بە ((دانبنان بەو ستەمانەی خۆرئاوای خاوەن پەروەردەی مەسیحی دەرهەق موسڵمانانی کردووە)). هەروەها بەڵگەنامەکە ڕەخنە دەگرێت لە تێگەیشتنە چەوتەکانی مەسیحییەکان لەبارەی حەتمییەتی ئیسلامی و حەرفییەت و دەمارگیریی ئیسلام و بابەتی تر. بەڵگەنامەکە جەخت لە یەکێتیی باوەڕ بە خودا لە لای هەردوو کۆمەڵەکە دەکاتەوەو باسی ئەوە دەکات کە چۆن کاردینال (کۆنیگ) سەرسامیی گوێگرەکانی لە مزگەوتی گەورەی زانکۆی ئەزهەری قاهیرە وروژاند کاتێ لە میانەی وتارێکیدا لە ساڵی ١٩٦٩ ئەو بابەتەی ڕاگەیاند. بەڵگەنامەکە باسی ئەوەش دەکات کە سکرتارییەتی ڤاتیکان لەوەتەی ساڵی (١٩٦٧)ەوە داوای لە مەسیحییەکان کردووە بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە

پیرۆزبایی لە موسڵمانان بکەن چونکە ئەو جەژنە(بەهایەکی ڕەسەنی ئاینی) دەنوێنێت..

ئەو دەسپێشخەرییانە بۆ نزیکبوونەوە، دیدارو کۆبوونەوەی نێوان دەستەی پاپەوی و ئیسلامی بەدوا داهات و لەیەکترنزیکبوونەوەی کردە دیفاکتۆ(ئەمری واقیع). لەگەڵ ئەوەشدا و وێڕای زۆریی هۆکارەکانی پەخش و ڕاگەیاندن لە ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن، کەمێکی کەمی خەڵك ئەو ڕووداوە گرینگانەیان زانی کە لە جیهانی خۆرئاوا ڕوویان دا.

هەروەها ڕۆژنامەکان بایەخێکی زۆریان بەو سەردانە ڕەسمییە نەدا کە کاردینالْ (پنیۆدۆلی) سەرۆکی سکرتارییەتی ڤاتیکان بۆ کاروباری نامەسیحییەکان لە ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٤ بۆ لای شا فەیسەڵی شای سعودییە ئەنجامی دا، وێڕای گرینگیی هەواڵەکە کەچی ڕۆژنامەی لۆمۆند تەنها بە چەند دێڕێکی کەم لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٥ باسی سەردانەکەی کرد، بەتایبەتی کاتێ دەزانین کاردینالْ نامەیەکی لەلایەن پاپا پۆڵسی شەشەمەوە گەیاندە شای سعودییە ئەوەش بە پاڵنەری باوەڕبوونی بە یەکێتیی هەردوو جیهانی ئیسلامی و مەسیحی کەوا هەردووکیان یەك خودا دەپەرستن، لەو نامەیەدا پاپا ڕێزی بۆ شا فەیسەڵ بەو پێیەی کەسایەتییەکی باڵای جیهانی ئیسلامییە دەربڕی بوو.

دوای ئەوە بە شەش مانگ، واتە لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ ، پاپای ڤاتیکان بە شێوەیەکی فەرمی پێشوازی لە گەورە زانایانی سعودییە کردو ئەو دیدارەش بووە بۆنەیەك بۆ گفتوگۆ لەبارەی مەسیحی و موسڵمانەکان لەبارەی مافە کولتورییەکانی مرۆڤ لە ئیسلامدا، ڕۆژنامەی (ئۆسەرڤاتۆری ڕۆمانۆ)ی ڤاتیکان لە ژمارەی ڕۆژی ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ باسی لەو ڕووداوە

مێژووییە کرد و لە لاپەڕەی یەکەمیدا شوێنێکی گەورەتری لە هەواڵی کۆبوونەوەی کۆتا ڕۆژی کۆڕی ئوسقوفەکانی لە ڕۆما پێدابوو..

پاشان ئەنجومەنی مەسکونی باڵای کەنیسەکان لە جنێڤ و ئیلچینگەر ئوسقوفی ستراسبۆرگ پێشوازی لە گەورە زانایانی سعودییە کرد و ئوسقوف داوای لە زاناکان کرد لە لە بەردەمی ئەو و کاتدرائییەکەی خۆیدا نوێژی نیوەڕۆ بکەن، ئەگەر ڕۆژنامەکان باسی هەواڵەکەیان کردبێت ئەوا زیاتر بۆ خستنەڕوو بووە نەك بۆ ئەو ئاماژە ئاینییەی هەیەتی. لەوانەی پرسیارم لێ کردوون لەبارەی هەواڵی ئەو کۆڕو کۆبوونەوانە بۆم ڕوون بۆتەوە کە ئەوانەی پێیان زانیوە کەمێکی زۆر کەم بوون.

بێگومان مێژووی پەیوەندییەکانی نێوان دوو ئاینەکە، بۆ لەمەودوا گیانی کرانەوە بەرەو ئیسلام تۆمار دەکات کە پاپا لە لێدوانەکانیدا گوزارشتی لێ کردووە((ئیمانی قوڵی بە یەکێتیی هەردوو جیهانی ئیسلامی و مەسیحی کە یەك خودا دەپەرستن)). بە لامەوە گرینگ بوو هەستوسۆزی سەرۆکی کەنیسەی کاسۆلیکی لە هەمبەر موسڵمانان بیربخەمەوە، زۆرێك لەو مەسیحییانەی لە سایەی گیانی دوژمنایەتییەکی ئاشکرا پەروەردەبوون لە ڕووی مەبدەئییەوە دژی هەموو تێڕامانێکن لە ئیسلام، بۆیە ئەوان لە بەرامبەر حەقیقەتی ئیسلام لە نەزانییەکی بەردەوام دان، دواجار تێگەیشتنەکانیان لەبارەی ئیسلام، بێگومان دەبێتە تێگەیشتنێکی هەڵە.

مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت وا دەردەکەوێت کە پێویستە لەسەرمان لە کاتی لێکۆڵینەوەی هەر لایەنێك لە لایەنەکانی سروش لە ئاینی یەکتاپەرستی، بە بەراوردکاری لەگەڵ تێڕوانینی دوو ئاینەکەی تر لەبارەی هەمان بابەت چارەسەری

بکەین، لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنەی گرفتێك بە دڵنیاییەوە زۆر گرینگترە لە لێکۆڵینەوەی یەك لایەن بە جیا، ڕوبەڕوبوونەوەی نێوان ڕاستییەکانی زانست لە سەدەی بیست و هەندێ بابەتی کتێبە پیرۆزەکان بەلای هەر سێ ئاینەکەوە گرینگە نەك تەنها یەك ئاین. لەبەر ئەو سەرکەشییە ماددییەی ئەمڕۆ هەڕەشە لە هەر سێ ئاینەکە دەکات، بەو پێیە ئایا هەر سێ ئاینەکە ناکەونە یەك بەرەو سەنگەرەوە؟ بەڵکو وا پێویست ناکات لە بەرامبەر ئەو سەرکەشییە لە یەکتر نزیك ببنەوە و بارستەیەکی یەکگرتوو پێك بهێنن؟ لە وڵاتانی ئیسلامی هەروەکو وڵاتانی خاوەن کاریگەریی یەهودی و مەسیحی — بەتایبەتی لە ناوەندە زانستییەکان — دەوترێ: ئاین و زانست ڕێکناکەون. لە واقیعدا بۆ ئەوەی گرفتەکە بە هەمەلایەنی چارەسەر بکرێت چەند پەرەپێدانێکی گرینگ دەخوازێت، بەڵام لێرەدا تەنها یەك لایەنی بابەتەکە باس دەکەم ئەویش لێکۆڵینەوەی خودی کتێبە پیرۆزەکانە لەبەر ڕۆشنایی زانیارییە زانستییە نوێیەکاندا..

بەڵام مەبەستی ئەو لێکۆڵینەوەیە پرسیارێکی سەرەتایی بەڵام بنچینەیی ڕەت دەکاتەوە: بەهای ڕاستودروستیی ئەو دەقانە چییە کە ئەمڕۆ لەبەردەستماندان؟ ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەو بارودۆخە بکۆڵینەوە کە ئەو دەقانەی تێدا نووسراونەتەوە و گەیشتۆتە ئێمە.

توێژینەوەی کتێبە پیرۆزەکان لە میانەی زانستی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی دەقەکان شتێکی تازەیە لە وڵاتەکەمان، سەبارەت بە پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێخەڵك بۆ ماوەی چەندان سەدە هەروەکو خۆیان دەیانخوێندنەوەو، خوێندنەوەیان هەر ستایشی بەدواوە بوو، تەنها گوزارشتکردن لە هەر گیانێکی ڕەخنەیی بەرامبەر کتێبی پیرۆز تاوانێکی نەبوراو بوو. قەشەکان ئەو هەڵبژاردەیە

بوون کە بێرەنج دەیانتوانی زانیارییەکی تەواویان لەبارەی تەورات و ئینجیلەکان هەبێت، بەڵام سەرجەم عەلمانییەکان تەنها چەند دەقێکی هەڵبژێردراویان لە میانەی سروتە ئاینییەکان یان ئامۆژگارییەکان وەردەگرت..

دوای ئەوەی ڕەخنەی دەقەکان بووە زانست، چاکەی ئەوەی هەبوو وای لێ کردین زۆر کات گرفتی گرینگ ئاشکرا بکەین، بەڵام هەندێ جار تووشی بێهیوایی دەبین کاتێ کتێبگەلێکی زۆر کە بانگەشەی ڕەخنەیی دەکەن دەخوێنینەوە بەڵام لە بەرامبەر زۆرێك لە گرفتە ڕاستەقینەکانی لێکدانەوەدا تەنها چەند ڕاڤەیەکی ستایشکارانە دەخاتەڕوو کە ئامانج لێی داپۆشینی پەشۆکاوی و شڵەژانی دانەرە..لە سایەی ئەو بارودۆخەدا، ناسازی و ئەو شتانەی دوورن لە باوەڕپێکردن بە لای ئەوانەی دەیانەوێ ساغیی توانای بیرکردنەوە و هەستی بابەتیبوونیان بپارێزن، بێ چارەسەر دەمێننەوە. بە ڕاستی ئێمە لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستە بەداخەوەین کە ئامانجی پاساودانی دەسگرتن بەو دەقانەی تەورات و ئینجیلە کە پێچەوانەی هەموو لۆژیکێکە، ئەو هەڵوێستە لە لای هەندێ عەقڵی ڕۆشنبیر زیان بە باوەڕ بە خودا دەگەیەنێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەزموون سەلماندوویەتی کە ئەگەر هەندێکیان توانای ئاشکراکردنی هەندێ شوێنی لاوازی لەم جۆرەیان هەبێ ئەوا زۆرینەی مەسیحییەکان تا ئێستا دەرکی ئەو لاوازییەیان نەکردووە، هێشتا لە مەسەلەی ئەو ناسازییە لەگەڵ زانیارییە دونیاییە بەناوبانگەکان کە بە زانیاری زۆر بنچینەیی دادەنرێن، لە نەزانییەکی تەواودان..

بەڵام ئیسلام، فەرموودەی پێغەمبەری هەیە کە بە ئینجیلەکان دەچێت لەو ڕووەوەی کە کۆمەڵێك قسەو هەواڵی کردەوەکانی موحەممەدە(درودی خوای لێ بێت)، ئینجیلەکانیش سەبارەت بە عیسا لەوە زیاتر نین. فەرموودەکان دەیان

ســاڵ دوای کۆچــی موحەممــەد(درودی خــوای لێ بێــت) نووســراون هــەروەکو ئینجیلەکانیش دەیان ساڵ دوای ڕۆیشتنی مەسیح نووسراون. لەمەودوا دەبینین کە چۆن دانەرانی چوار ئینجیلەکە کە لە لایەن کەنیسەوە دانیان پێدانراوە ئەو ڕووداوانەیان نەبینیووە کە باسیان کردووە، هەمان شتیش بەسەر دانراوەکانی فەرموودەکان ئەوانەی بە ڕاستودروست بەناوودەنگن، دەچەسپێ.

لێرەدا پێویستە بەراودکاری بوەستێ، لەبەرئەوەی ئەگەر مشتومڕ لەبارەی ڕاستودروستیی ئەم فەرموودەیە یان ئەویتر لە ڕابردوودا کرابێت یان ئێستا بکرێت ئەوا کەنیسە لە سەدەکانی سەرەتا بە شێوەیەکی کۆتایی لە نێوان ژمارەیەك ئینجیلدا مەسەلەکەی یەکلا کردەوە و ڕەسمیبوونی تەنها چواریانی ڕاگەیاند ئەوەش وێڕای ئەو هەموو ناسازییەی لە زۆرێك لەو خاڵانەی لە نێوان ئەو ئینجیلانەدا هەبوو، کەنیسە فەرمانی بە ونکردنی ئینجیلەکانی تریش دەرکرد، لێرەوەش ناوی (ئینجیلە ساختەکان) هاتە گۆڕێ..

لێرەدا جیاوازییەکی دیکەی جەوهەری لە نێوان مەسیحییەت و ئیسلام سەبارەت بە کتێبە پیرۆزەکان هەیە، مەبەستمان لەوە ونبوونی دەقەکانی سروش(وەحی) چەسپاوە لەلای مەسیحییەت لە کاتێکدا ئیسلام قورئانی هەیە کە سروشێکی خواییە و چەسپاوو نەگۆڕدراویشە..

قورئان ئەو سروش(وەحی)یەیە کە لە ڕێی جیبریلەوە بۆ موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) هاتۆتە خوارێ و لە دەمی هاتنەخوارێیدا نووسراوەتەوە و ئەویش لەبەری کردووەو لە کاتی نوێژیشدا بەتایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا موسڵمانان لەبەریان کردووەو بە فەرمانی خودی موحەممەدیش(درودی خوای لێ بێت) لە چەند سورەتێکدا ڕێکخراوە و ، ئەو سورەتانەش دەمودەست دوای کۆچی دوایی

پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت)و لە سەردەمی خەلافەتی عوسماندا کۆکراونەتەوە تاوەکو بۆتە ئەو دەقەی ئەمڕۆ دەیزانین.

بەڵام کتێبی پیرۆزی مەسیحی، سەبارەت بەوەی بۆ ئیسلام ڕووی داوە بە شێوەیەکی ڕوون لەو جیاوازە. ئینجیل پشت دەبەستێ بە شایەتی مرۆیی جۆراوجۆر و ناڕاستەخۆو، بۆ نموونە ئێمەش شایەتی هیچ شایەتعەیانێکی ژیانی عیسا نین، ئەوەش پێچەوانەی بۆچوونی زۆرێك لە مەسیحییەکانە، کەواتە بەم شێوەیە گرفتی ڕاستودروستیی دەقەکانی کتێبە پیرۆزەکانی مەسیحییەت و دەقەکانی سروشی ئیسلامی خرایەڕوو.

بەرامبەر یەکڕاگرتنی دەقەکانی کتێبە پیرۆزەکان لەگەڵ ڕاستییەکانی زانست لە هەموو سەردەمەکان بابەتی بیرکردنەوەی مرۆڤ بووە. لە سەرەتا گوترا: ڕێککەوتنی زانست و کتێبە پیرۆزەکان شتێکی پێویستە بۆ دروستیی دەقی پیرۆز. قەدیس ئۆگەستین لە وتاری هەشتاو دوویدا ئەو بنەمایەی بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە دیاری کرد، بەڵام پەرەسەندنی زانست چەند خاڵێکی ناکۆکیی لە نێوان هەردووك (زانست و دەقی پیرۆز) بۆ بیریاران ئاشکرا کرد. بەو ڕێگایە ئەو ڕەوشە ترسناکە هاتە ئاراوە کە ئەمڕۆ وای لە ڕەفەکەرانی تەورات و ئینجیل کردووە دوژمنایەتیی زانایان بکەن، لە ڕاستیدا ناکرێ قەبووڵ بکەین پەیامێکی خوایی باس لە واقیعێکی ناڕاست بکات. بینا لەسەر ئەوە تەنها یەك ڕێگا بۆ سازاندنێکی ماقوڵی نێوان هەردوولا هەیە ئەویش ئەوەیە کە دروستیی ئەو بڕگەیەی تەورات قەبووڵ نەکرێت کە شتێکی ناماقوڵی زانستی دەڵێت. ئەو چارەسەرەش ئارەزوومەندانە نەبوو بەڵکو بە پێچەوانەوە هەندێك بەتوندی بۆ دەسگرتن بە تەواوی دەقەکە دەمارگیربوون، ئاکامی ئەوەش ئەوە بوو کە

ڕاڤەکاران ناچاربوون لە بەرامبەر ڕاستیی کتێبە پیرۆزەکان هەڵوێستگەلێك وەربگرن کە لەلایەن پیاوی زانستەوە ناکرێ قەبووڵ بکرێ.

ئیسلام بەردەوام وای داناوە کە ڕێککەوتنێك لە نێوان بابەتەکانی کتێبی پیرۆزو واقیعی کردەییدا هەیەو، لێکۆڵینەوەی دەقی قورئان لە سەردەمی نوێدا هیچ پێویستییەکی بۆ چاوگێڕانەوە بەوەدا دەرنەخستووە. دواتر دەبینین کە قورئان چەند ڕووداوێکی خاوەن سیفەتی زانستی دەوروژێنێ کە ڕووداوگەلی زۆرن بە پێچەوانەی تەورات کە ئەو ڕووداوانەی تێدا کەمە، هیچ بابەتێك لە بابەتە زانستییەکانی قورئان لەگەڵ تێڕوانینی زانستی ناکۆك نییە، ئەوەش ئەنجامی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکەمانە..لە کۆتایی ئەم کتێبەدا دەبینین چۆن بابەتەکە تەواو جیاوازە سەبارەت بە هەندێ فەرموودەی (غیر قطعي) کە لە چوارچێوەی سروشی قورئان دەردەچێت، هەندێ فەرموودەی (ظنية الثبوت) هەیە لە ڕووی زانستییەوە ناکرێ قەبووڵ بکرێت، بەڵام ئەوەیان بە پێی بنەماکانی قورئان کە هەمیشە فەرمان دەکات بە گەڕانەوە بۆ زانست و عەقڵ لێکۆڵینەوەی زۆری لەبارەوە کراوە..

ئەو تێڕامانانە سەبارەت بە سیفەتی قەبوڵکراوو قەبوڵنەکراوی زانستییانەی وتەیەکی کتێبی پیرۆز، ڕوونکردنەوەیەکی وردمان لێ دەخوازێ. پێویستە لەسەرمان جەخت بکەینەوە لەوەی کاتێ لەبارەی ڕاستییەکانی زانست دەدوێین مەبەستمان لەوانەیە کە بە شێوەیەکی کۆتایی سەلماون، ئەو دانانەش وا دەخوازێ هەموو تیۆرەکانی ڕاڤەو پاساودان دووربخەینەوە کە لە سەردەمێکدا بۆ ڕاڤەی دیاردەیەك سوودی هەبووە بەڵام دواتر هەڵوەشاوەتەوە و تیۆری تر کە لەگەڵ پەرەسەندنی زانستی گونجاوتر بووە جێی گرتۆتەوە، ئەوەی لێرەدا

مەبەستمە ئەو مەسەلانەیە کە ناکرێ لێی پەشیمان ببینەوە بە شێوەیەکی تەواو سەلماوە بە جۆرێک دەکرێ بە بێترسی کەوتنە نێو مەترسیی هەڵەوە بەکاربهێنرێ..

بۆ نموونە ئێمە مێژووی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی بە نزیکەیی نازانین بەڵام هەندێ شوێنەوار دۆزراوەتەوە کە بێ هیچ گومانێک دەتوانین مێژووەکەی بۆ ١٠ هەزار ساڵ پێش مێژووی مەسیحی دابنێین. بەو پێیە ئێمە ناتوانین لە ڕووی زانستییەوە ڕاستودروستیی دەقی بەشی(التكوين)ی تەورات قەبووڵ بکەین کە هەندێ ڕەچەڵەک و مێژوو بۆ دیاریکردنی بنەچەی مرۆڤ(هێنانەدی ئادەم) بە نزیکەی ٣٧ سەدە پێش مەسیح بەدەستەوە دەدات، لەوانەیە بۆ ئەوە لە داهاتوودا زانست بتوانێ لەسەرووی خەمڵاندنەکانی ئێمە مێژوو دیاری بکات بەڵام ئێستا دەتوانین دڵنیابین لەوەی کە هەرگیز ئەوە بسەلمێنرێ کە مرۆڤ ٥٧٣٦ ساڵە لەسەر زەوی دەرکەوتووە..بینا لەسەر ئەوە پێدراوەکانی تەورات تایبەت بە کۆنیی مرۆڤ ناڕاستە.

ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ زانست بە واتای ڕاستەقینەی وشە باس لە هیچ پرسێکی ئاینی ناکات. بۆ نموونە زانست بۆی نییە هیچ ڕاڤەیەک بۆ چۆنییەتی دەرکەوتنی خودا بۆ موسا بکات، یان مەتەڵی هاتنەدونیای مەسیح بە بێ باوکێکی جەستەیی(بایۆلۆجی) شیکار بکات، لەبەرئەوەی کتێبە پیرۆزەکان هیچ لێکدانەوەیەکی ماددی بۆ ئەو جۆرە کارانە ناخەنەڕوو، ئەو لێکۆڵینەوەی ئێستا دەیخەینەڕوو تایبەتە بەو هەواڵانەی کتێبە پیرۆزەکان لەبارەی دیاردە سروشتییە جۆراوجۆرەکان پێمان دەڵێن کەوا ئەو کتێبانە کەم یان زۆر ڕاڤەو لێدوانی لەبارەوە داون. پێویستە ئەوەش تێبینی بکرێ کە سروشی قورئانی لە فرەیی ئەو

بابەتانەدا زۆر دەوڵەمەندە ئەوەش پێچەوانەی دەگمەنی ئەو بابەتانە لە تەورات و ئینجیلدا.

سەرەتا بە بێ هیچ بیرێکی پێشوەختەو بە بابەتیبوونێکی تەواوەوە لێکۆڵینەوەم لە قورئانی پیرۆز کردووە و بە دوای هاورێکی دەقی قورئان و پێدراوەکانی زانستی نوێ گەڕاوم. بەر لەو لێکۆڵینەوەیە و لە ڕێی وەرگێڕدراوەکانەوە، دەمزانی کە قورئان جۆرگەلێکی فرە لە دیاردە سروشتییەکان باس دەکات بەڵام زانیاریم کورت و کەم بوو، بە هۆی لێکۆڵینەوەیەکی ئاگایانەی دەقی عەرەبی توانیم لیستێك بهێنمەوە ئاراوە کە دوای تەواوبوون لێی دەرکی ئەوە بکەم کە: قورئان وتەیەکی تێدا نییە کە لە ڕوانگەی زانست لە سەردەمی نوێ شیاوی ڕەخنە بێت..

بە هەمان بابەتیبوونەوە هەمان پشکنینم بۆ تەورات و ئینجیلەکان ئەنجام داوە. سەبارەت بە تەورات هیچ پێویستی نەکرد لە بەشی یەکەمیەوە(بەشی تەکوین) زیاتر بڕۆم، وتەگەلێکم دۆزیەوە کە ناکرێ سازان لە نێوان ئەوان و زۆربەی پێدراوە زانستییەکانی سەردەم بکرێت.

هەروەها سەبارەت بە ئینجیلەکانەوە هەر لە لاپەڕەی یەکەمەوە ڕووبەڕووی گرفتێکی گەورە دەبیتەوە ئەویش درەختی ڕەچەڵەکی مەسیحە. ئینجیلی مەتا بە شێوەیەکی ڕۆشن هاودژی ئینجیلی لوقایە، ئەوەی دوایی بە ئاشکرا بابەتێکمان بۆ دەخاتەڕوو کە لەگەڵ زانیارییە نوێیەکانی تایبەت بە کۆنێتیی مرۆڤ لەسەر زەوی یەکنایەتەوە..

بەڵام بوونی ئەو بابەتە هاودژانە و ئەوانەشی کە شیاوی باوەڕپێکردن نین و، ئەوانەی تر کە لەگەڵ زانست ڕێکناکەوێ، پێموانییە بتوانێت باوەڕ بە خودا لاواز بکات، بەرپرسیارێتیش تێیدا تەنها دەکەوێتە سەر مرۆڤ و، کەس ناتوانێت بڵێت: دەقە ئەسڵییەکان چۆن بوون و بەشی خەیاڵ و ئارەزوو لە پرۆسەی نووسینەوەیاندا چەند بووە؟ یان پشکی دەسکاریکردنی مەبەستدارانە لەلایەن بنووسانی ئەو دەقانەوە چەند بووە؟ یان بەشی ئەو دەسکاریکردنە نائاگایانەی خراوەتە نێو کتێبە پیرۆزەکانەوە چەندن؟ ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا بە ڕاستی تووشی شۆکمان دەکات ئەوەیە دەبینین پسپۆڕانی لێکۆڵینەوەی دەقەکان ئەو ناسازی و ناکۆکییە لەگەڵ ڕاستییە زانستییە چەسپاوەکان پشتگوێ دەخەن، یان هەندێ خاڵی لاواز ئاشکرا دەکەن بۆ ئەوەی دواتر بە هۆی هەندێ پاڵەوانێتیی جەدەلی هەوڵی پەردەپۆشکردنی بدەن، لەم کتێبەدا هەندێ نموونە دەخەینەڕوو کە چۆن هەندێ لە گەورە ڕاڤەکاران بۆ بەرگری و ستایشکردنی هەردوو ئینجیلی مەتا و یۆحەننا دەستەواژەی ڕەونەقداریان بەکارهێناوە، بەکارهێنانی ئەو هۆکارانە بۆ پەردەپۆشکردنی ناسازی یان بابەتێکی شیاوی باوەڕنەکردن زۆربەی کات سەرکەوتوو بووە، ئەوەش ئەوەمان بۆ لێکدەداتەوە کە چۆن هێشتا زۆرێك لە مەسیحییەکان لە چەندان خاڵی لاوازی نێو برگەکانی تەورات و ئینجیلەکان بێئاگان، لە بەشی یەکەم و دووەمی ئەم کتێبەدا خوێنەر نموونەی ڕاست لەمبارەیەوە دەبینێت..

بەڵام لە بەشی سێیەمی کتێبەکەدا، خوێنەر چەند نموونەیەکی ڕوونکەرەوە بۆ پیادەکردنی زانست بەسەر لێکۆڵینەوەی یەکێك لە کتێبە پیرۆزەکان دەبینێت، پیادەکردنێکە مرۆڤ مەزەندەی نەدەکرد، لەوەشدا خوێنەر ڕوونکردنەوەیەکی

لەلایەن زانستی نوێوە دەست دەکەوێ لەپێناو تێروتەسەلتری هەندێ لەو ئایەتانەی قورئان کە هێشتا داخراو یان ناڕوونن. ئەوەش هیچ سەیر نییە ئەگەر زانیمان ئیسلام هەمیشە ئاین و زانستی وەکو دوانەیەکی پێکەوەنووساو داناوە. هەر لە سەرەتاوە بایەخدان بە زانست بەشێکی دانەبڕاوی ئەو ئەرکانە بووە کە ئیسلام فەرمانی پێکردووە و، پەیڕەوکردنی ئەو فەرمانەش بوو بووە هۆی ئەو گەشەکردنە مەزنەی زانستەکان لە سەردەمی شارستانێتیی ئیسلامیدا، کەوا خۆرئاوا خۆی بەر لە سەردەمی ڕێنیسانس لە ئەورووپا سوودی لێ وەرگرت، ئەو پێشکەوتنەی ئەمڕۆ بە هۆی زانیارییە زانستییەکان لە ڕوونکردنەوەی هەندێ لەوانەی تێگەیشتراو نەبوون یان لە ڕوونکردنەوەی هەندێ لەو ئایەتانەی قورئان کە تا ئێستا بەد ڕاڤە کرابوون هاتۆتەدی تاوەکو ببێتە لوتکەی ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان زانست و کتێبە پیرۆزەکان..

# سەرنجێکی گشتی

## کێ دانەری پەیمانی کۆنە؟

چەندان خوێنەری پەیمانی کۆن کاتێ ئەو پرسیارەیان ئاراستە دەکرێ تەنها ئەوە دەڵێنەوە کە لە پێشەکیی کتێبەکەیاندا نووسراوە. چەندان کەس لەو خوێنەرانە ئەوە دەڵێنەوە کە دانەری هەموو ئەو کتێبانە پەروەردگارە وێڕای ئەوەی بە پێنووسی مرۆڤگەلێك نووسراون کە رۆحی پاك ئیلهامی کردوون؟

هەندێ کات دانەری پێشەکیی کتێبی پیرۆز تەنها بەوە واز دەهێنێ کە ئەو وەڵامە کورتەی خوێنەرانی بداتەوە تاوەکو رێگای هەر پرسیارکردنێك بگرێت. هەندێ کاتی تریش ڕاستکردنەوەیەك زیاد دەکات و تێیدا دەبێژێ: هەندێ وردەکاری هەیە کە مرۆڤ بۆ دەقی یەکەمی زێدە کردووە و گومانکردن لە برگەیەکی ئەو دەقە، حەقیقەتی گشتیی کە ئەو برگەیەی لێوە هەڵقوڵاوە ناشێوێنێ. هەمیشە مکوڕبوونێك لەسەر ئەو حەقیقەتە هەیە کەوا کەنیسە هەردەم گرەنتی ڕاستودروستی دەستەبەر دەکات. لەسەر ئەوەش رۆحی پاك هاوکاری دەکات و کەنیسە تەنها خۆی دەتوانێ ئەو خاڵانە بۆ باوەڕداران روون بکاتەوە. کەنیسە لە سەدەی چوارەمەوە لیستێکی کتێبە پیرۆزەکانی بڵاوکردەوە. ئەو لیستەیە لە لایەن کۆڕەکانی مەسکونی کە لە (فلۆرەنسا ١٤٤١) و (ترانت ١٥٤٦) و (ڤاتیکان١ ، ١٨٧٠) گرێ دران، پاڵپشتی کرا بە جۆرێك ناوی لێنرا قانون. لە سەردەمێکی نزیکی ئێستاشمان کۆڕێکی تری (ڤاتیکانی دووەم ١٩٦٢–١٩٦٥) دوای زۆرێك لە نامەگەلی پاپەوی، دەقێکی سروشی خوایی بڵاوکردەوە. ئەو

دەقەش گرینگییەکی گەورەی هەیە، کۆڕ بۆ ئامادەکردنی سێ ساڵ کاری کردووە، ئەو دەقە لە ناوەندی سەختی و دژوارییەکی فرەدا سازکرا. زۆربەی خوێنەرانی کتێبی پیرۆز ئەو زانیارییە دڵنیاکەرەوانە لە سەرووی چاپە نوێیەکان دەبینن و تەنها بەو گرەنتییانە وازدەهێنێ کە چەندان سەدەیە کەنیسە دەیدات و بە زەینی ئەو خوێنەرانەدا نەهاتووە کە پرسی ڕاستودروستی ئەوە شیاوی گفتوگۆیە..

بەڵام ئەگەر هاتوو خوێنەر گەڕایەوە بۆ ئەو دانراوانەی هەندێ پیاوی ئاینی بۆ کەسانی تایبەتیان نوسیووە نەك جەماوەری گشتی ئەوا بۆی دەردەکەوێ کە پرسی بەشەکانی کتێبی پیرۆز زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە سەرەتا گومان دەبرا..هەروەها پەیمانی کۆنیش وەکو پەیمانی نوێ هەندێ کێشە دەوروژێنێ کە ڕاڤەکاران ئەو ڕەگەزانە ناشارنەوە کە دەبنە هۆی ناکۆکی..

هەروەها چەند لێکۆڵینەوەیەکی تری کورتتر و بابەتیتر هەن کە پێدراوی وردی تێدایە وەکو لێکۆڵینەوەکەی (ئیدمۆند جاکوب)..(پەیمانی نوێ)، ئەم کتێبە ڕوانینێکی گشتگیر و تێروتەواو لەبارەی کێشەکەوە دەخاتەڕوو.

ئیدمۆند جاکوب ئاماژە بەوە دەکات کە لە سەرەتادا تەنها یەك دەق نەبووە بەڵکو فرە دەقی هەبووە، لە سەدەی سێیەمی پێش زایین بە لایەنی کەمەوە نزیکەی سێ نووسراوەی دەقی عیبری تەورات هەبوو: دەقی (ماسوری)، ئەو دەقەی لە وەرگێڕان بۆ یۆنانی بەکارهات، دەقی ناسراو بە (سامری) یان پێنج بەشەکەی موسا. پاشان دوای ئەوە لە سەدەی یەکەمی پێش زایین ئاراستەیەك هەبوو بۆ نووسینەوەی یەك دەق، بەڵام نووسینەوەی دەقی کتێبی پیرۆز تەنها لە سەدەی یەکەمی دوای زایین ئەنجام درا..

ئەگەر ئەو سێ نووسراوە ئێستا مابوونایە ئەوا دەتوانرا بەراورد لە نێوانیاندا بکرایە ڕەنگە بۆ گەیشتن بە ڕایەك سەبارەت بە دەقی ئەسڵی بەلام بۆ بەدبەختی هیچ بیرۆکەیەکمان لەبارەیەوە نییە. کۆنترین دەقی عیبری تەورات دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەدەی نۆی دوای زایین..

وەرگێڕانی (سێپتانت) کە بە زمانی یۆنانییە بە یەکەم وەرگێڕان دادەنرێ، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەمی پێش زایین و جولەکەکانی ئەسکەندەرییە کردوویانە، کتێبی پەیمانی نوێش پشتی بە دەقەکەی ئەو بەستووەو تاوەکو سەدەی حەوتی دوای زایین باوەڕپێکراو بووە، دەقە یۆنانییە ڕەسەنەکان کە جیهانی مەسیحی بە گشتی بەکاریان دێنێ بریتییە لە: دەسنووسی (Codex Vaticanus) لە ڤاتیکان و (Codex sinaiticus) لە مۆزەخانەی بەریتانیا، مێژووی ئەم دوو دەسنووسە بۆ سەدەی چوارەمی دوای زایین دەگەڕێتەوە.

بەلام ئەوەی پەیوەستە بە تەوراتی لاتینی قەدیس (ئیرۆنیمیس)، وا پێدەچێ بەلگەنامەگەلی عیبری کە بۆ سالانی یەکەمی سەدەی پێنجەمی دوای زایین بەکارهێنا بێت، ئەوەش ئەو چاپەیە کە بەهۆی بلاوبوونەوەی بەرفراوانی دوای سەدەی حەوتەمی زایینی ناوی (Vulgate)ی لێنراوە.

لە کۆتاییشدا با باسی نووسراوە ئارامی و سریانییەکان بکەین(peschitta)، ئەوانیش بەشەکین و ناتەواون.

ئەو دەقە جیاوازانە ڕێیان بە پسپۆڕان داوە دەقگەلێك بە ناوی (ناوەند) ئامادە بکەن، ئەوەش شتێکە بە چارەسەرێکی ناوەندی نێوان سەرجەم نوسخە

جیاوازەکان دەچێت..هەروەها هەندێ کۆمەڵە هەن کە لە نێو لاپەڕەکانیدا و بە تەنیشت یەکەوە، نوسخەی جۆراوجۆر وەکو عیبری و یۆنانی و سریانی و ئارامی و تەنانەت عەرەبیش هەیە.ئەوەش کتێبی پیرۆزی بەناوبانگە بە نوسخەی والتۆن(لەندەن ١٩٥٧).

وەرگێڕانی مەسکونیەی پەیمانی کۆن بە هیوایە بگاتە دەقێکی گشتگیری ئاوێتە: کتێبێکە ئامانجی یەکخستنی دەقەکان کەوا زۆرێك لە شارەزایانی کاسۆلیك و پرۆتستانت ئەنجامی دەدەن.

بەوەڕا قەبەیی ئەوەی مرۆڤ بۆ پەیمانی کۆن(تەورات)ی زیادکردووە ڕوون دەبێتەوە. هەروەها بەوەش ئەو گۆڕانکارییانە بۆ خوێنەر ڕوون دەبێتەوە کە بەسەر دەقی پەیمانی کۆندا هاتووە، لە گواستنەوە بۆ گواستنەوەیەکی تر و لە وەرگێڕانێك بۆ یەکێکی دیکە، بێگومان بە هەموو ئەو ڕاستکردنەوانەی لەوەوە دەکەوێتەوە..

## سەرچاوەو ڕیشەی کتێبی پیرۆز:

کتێبی پیرۆز بەر لەوەی کۆمەڵە بەشێك بێت، کەلەپورێکی میللی بوو هیچ کۆڵەکەو پاڵپشتێکی نەبوو جگە لە یادگەی مرۆڤەکان، ئەوەش تاکە هۆکار بووە بۆ گواستنەوەی هزرەکان، ئەو کەلەپورە بە گۆرانی دەگوترا..

ئیدمۆند جاکوب دەڵێت: (هەموو گەلێك لە قۆناغەکانی سەرەتایی پەرەسەندنیدا گۆرانی دەڵێ، لە ئیسرائیلیش هەروەکو وڵاتانی تر، هۆنراوە پێش

پەخشان کەوتووە، ئیسرائیل گۆرانی زۆر گوتووە و باشیشی گوتووە، لەبەرئەوەی بارودۆخی مێژوویی، ئیسرائیلی بۆ لوتکەی خوێنگەرمی(حەماس) بردووە هەروەکو بەرەو هەڵدێری بێهیواییشی بردووە، لەبەرئەوەی بە هەموو قەوارەی خۆی بەشداری لە هەموو ڕووداوەکان کردووە بە جۆرێك لە ڕوانینی ئەوەوە هەموو شتێك واتایەکی هەبووە، بۆیە گوزارشی هەمەجۆری بەخشیوەتە گۆرانییەکانی..خەڵك لە هەموو بۆنەکان گۆرانییان دەگوت...جاکوب ئەو بۆنانە دەژمێرێ کە گۆرانییەکانی لە تەوراتدا هەیە وەکو: گۆرانییەکانی خۆراك و گۆرانی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی کۆتاییهاتنی درەوکردن، سرودەکانی کارکردن وەکو سرودی بەناوبانگی بیر، سرودەکانی هاوسەرگیری وەکو سرودی سرودگوتن و ئاوازەکانی ماتەمینی و سرودەکانی شەڕ کە لە تەوراتدا زۆرن لە نێویاندا (ئاوازی زەردەواڵە) (بەشی دادوەران. ئیسحاحی پێنج لە ١ تاوەکو ٣٢) کە تێیدا گۆرانی بۆ سەرکەوتنی ئیسرائیل دەڵێ کە یەهوە ویستویەتی لە کۆتایی شەڕێکی پیرۆزدا کە خۆی فەرماندەیی کردووە(بەشی ژمارەکان، ئیسحاحی دەیەم ٣٥): ((لە دەمی ڕۆیشتنی تابوتەکە موسا دەڵێ: ئەی خودا هەستە با دوژمنەکانت پەرشوبڵاو بن و نەیارەکانت لە بەردەمت ڕاکەن.))..

هەروەها پەندو نموونەش هەن(بەشی نموونەکان، نموونە و پەندەکانی کتێبە پیرۆزە مێژووییەکان)، وتەکانی بەرەکات و نەفرینەکان و ئەو یاسایانەی پێغەمبەران دوای سپاردنی خودا پێیان بۆ مرۆڤی دادەنێن..

ئیدمۆند جاکوب تێبینی ئەوەی کردووە کە: گواستنەوەی ئەو وتانە لە ڕێی خێزان یان لە ڕێی پەرستگاکان لە شێوەی گێڕانەوەکانی مێژووی گەلی هەڵبژێردراوی خودا دەکرا...

لەوەدا، جاکوب دەگاتە ئەم ئەنجامە: ((پێدەچێ ئەوەی تەورات لەبارەی موسا و باوانی بەرایی دەیگێڕێتەوە لەگەڵ ڕێڕەوی مێژوویی ڕووداوەکان بە شێوەیەکی نزیکەیی نەبێت، تێک نەکاتەوە. بەڵام گێڕەرەوەکان تەنانەت لەو قۆناغەی گواستنەوەی زارەکی، دەیانزانی چۆن جوانی و خەیاڵ زیاد بکەن تاوەکو ڕووداوە جۆراوجۆرەکان بە یەکەوە ببەستنەوە، لە پێشکەشکردنی ئەو ڕووداوە جیاوازانە لە شێوەی چیرۆکدا لەبارەی بنچینەی جیهان و مرۆڤ سەرکەوتوو بوون. عەقڵی ڕەخنەیی دەتوانێ لە کۆتاییدا بە شێوەیەکی ماقوڵ و پەسندکراو ببینێ.))..

چەند هۆکارێک هەن ڕێ دەدەن بە بیرکردنەوە لەوەی کە بۆ گواستنەوەی کەلەپور و پاراستنی، نوسین بەکارهێنراوە، ئەوەش دوای جێگیربوونی گەلی یەهودی لە خاکی کەنعان، واتە لە کۆتایی سەدەی سێزدەی پێش زایین، بەڵام ئەوە بە شێوەیەکی پێویست نەبوو تەنانەت بە نیسبەت ئەوەشەوە کە لە تێڕوانینی خەڵکەوە شایستەی بەردەوامبوون بوو واتە یاساکان. لە نێو یاساکاندا یاسایەک هەیە کە نووسینەوەی بۆ خودا دەگەڕێنرێتەوە واتە ١٠ ئامۆژگارییەکە کە لە دوو گێڕانەوەی تەورات گوازراوەتەوە: یەکەمیان لە بەشی (الخروج — ئیصحاحی بیست لە ١ تاوەکو ٢١)، لە بەشی (التثنية — ئیصحاحی پێنج لە ١ تاوەکو ٣٠)، ڕۆحی ئامۆژگارییەکان لە هەردوو دەقەکەدا یەکە بەڵام جیاوازییە دەقییەکان ڕوونە، زۆرتر بایەخ دەدرا بە نووسینەوەی بەڵگەنامە گرینگەکان لە پەیماننامەو وتار و لیستی کەسایەتییەکان(دادوەران و گەورە فەرمانبەرانی

شارەکان و لیستی ڕەچەڵەکەکان) و لیستی قوربانییەکان و دەسکەوتەکان. بەمە ئەو ئەرشیفە دروست بوو کە ئەو بەڵگەنامانەی هێنا کە دواتر بۆ نووسینەوەی ئەو دانراوانە بەکارهات و بووە هۆی پەیدابوونی ئەو کتێبانەی ئەمڕۆ وا لەبەر دەستمان دایە..

بەم شێوەیە لە هەموو کتێبێکدا جۆرەها ئەدەبیاتی جیاواز تێکەڵ دەبێت: ئەوەی لەسەر پسپۆڕان پێویستە ئەوەیە لە پاڵنەرەکانی کۆکردنەوەی ئەو بەڵگەنامە پەرشوبڵاوانە بکۆڵنەوە..

گرینگە نزیکخستنەوەیەك ئەنجام بدەین لە نێوان پرۆسەی پێکهێنانی ئەو کۆمەڵە پەرشوبڵاوەی کە تەوراتە و سەرەتا بە گواستنەوەی زارەکی بووە لەگەڵ ئەوەی لە ژێر ئاسمانەکان و لە کاتی تردا لە دەمی لەدایکبوونی ئەدەبێکی سەرەتایی ڕوودەدات.

بۆ نموونە با لەدایکبوونی ئەدەبی فەڕەنسی لە سەردەمی شانشینی فرەنجە وەربگرین. هەمان ئەو کەلەپورە باوو بڵاوە هەر لە سەرەتاوە تاوەکو پاراستنی ڕووداوە گرینگەکانی وەکو شەڕەکان کە زۆرە: شەڕەکانی بەرگری لە مەسیحییەت و مەرگەساتی جۆراوجۆر کە چەندان پاڵەوانی تێدا دەردەکەوێ، ئەوەش دوای چەند سەدەیەك ئیلهام دەبەخشێتە گێڕەرەوە و چیرۆکنووس و نووسەران..بەوە لە سەرەتای سەدەی یازدەی زایینیدا هۆنراوەی داستان لەدایك بوو کە تێیدا واقیع بە ئەفسانە تێکەڵ دەبێت، ئەو گۆرانیانەی دواتر یەکەم دەقی ئەدەبی داستانیان پێکهێنا. لە بەناوبانگترین ئەو داستانانەش: سرودی ڕۆلانە کە گۆرانییەکی جەنگیی ڕۆمانشامێزە، تێیدا ڕۆلان وەکو فەرماندەی دواوەی سوپای ئیمبراتۆر شارلمان لە کاتی گەڕانەوەی لە هەڵمەتێکی ئیسپانی دەردەکەوێ و قوربانیدانی

ڕۆلانیش ڕووداوێك نییە تەنها بۆ حیكایەت داهێنرا بێت كەوا مێژووەكەی بە ١٥ی ئابی ٧٧٨ دادەنرێ، ئەوەی بە ڕاستی ڕووی داوە هێرشی دانیشتوانی چیای باسكیونە بۆ سەر ڕۆلان. دانەری ئەدەبی لێرەدا تەنها ئەفسانەیی نییە، بنەمایەكی مێژوویی هەیە بەڵام مێژوونووسان بۆیان بە حەرفی و دەقاودەق لێی وەربگرن.

هاوسەنگیكردن لە نێوان لەدایكبوونی كتێبی پیرۆز و نموونەی ئەو ئەدەبە دونیاییە شتێكە وا دەردەكەوێ بە شێوەیەكی ورد لەگەڵ واقیعدا ڕێك و تەبا بێت. ئەو هاوسەنگیكردنە ئامانجی ئەوە نییە هەروەكو زۆرێك لە نكوڵیكەرانی خودا دەیكەن كۆی دەقی كتێبی پیرۆز ڕەت بكاتەوە، ئەو دەقەی خەڵك لە مۆزەخانەی شوێنەوارە ئەفسانەییەكان دەیپارێزن، بۆ نموونە دەكرێ بە ڕاستی باوەڕ بكرێ بە حەقیقەتی بەدیهێنان و ئامۆژگاری پێدان بە موسا لە لایەن خوداوە و دەخالەتی خودا لە كاروباری مرۆڤ لە سەردەمی شا سلێمان، هەروەها دەتوانین باوەڕ بكەین بەوەی كرۆكی ئەو ڕووداوانە بە ڕاستی گەیشتۆتە دەستمان، لە هەمان كات دەتوانین بە پێویستی بزانین وردەكاری ئەو ڕووداوانە ملكەچی ڕەخنەیەكی توند بكرێتەوە لەبەرئەوەی بەشدارییەكانی مرۆڤ لە نووسینەوەی كەلەپوری زارەكی ڕەسەن بە ڕاستی گەورەیە..

# بەشەکانی پەیمانی کۆن

پەیمانی کۆن لە ژمارەیەك بەش پێکهاتووە کە لە درێژیدا وەکیەك نین و لە جۆریشدا جیاوازن. ئەم بەشانە لە ماوەی زیاتر لە نۆ سەدەو بە زمانی جیاوازو بە پشتبەستن بە کەلەپوری زارەکیی گوازراوە نووسراونەتەوە، زۆربەی ئەو بەشانە بە هۆی رووداوەکان یان پێویستیی تایبەت لە سەردەمی دوور لە یەکتر راستکراونەتەوە و تەواو کراون..

گەشەکردنی ئەو ئەدەبە دەوڵەمەندە لە رووی مێژووییەوە دەکەوێتە سەرەتای شانشینی ئیسرائیلی واتە نزیکەی سەدەی یازدەیەمینی پێش زایین، لەو سەردەمەدا لە کۆشکی پاشایی دەستەی نووسەران دەرکەوت کە لە رۆشنبیران پێکهاتبوو، رۆڵی ئەو دەستەیە تەنها نووسین و نووسینەوە نەبوو، دەکرێ نووسراوە بەراییەکان بۆ ئەم مێژووە بگەرێنرێتەوە، ئەو نووسراوانە زۆر بەشەکیانە کە لە بەشی رابردوو باسمان کردن و تا ئەو کاتەی بە نووسینەوە تۆمارکران گرینگییەکی تایبەتیان هەبوو، بریتیین لە: هەندێ سرود کە پێشتر باسکران و پێغەمبەرایەتیی یەعقوب و موسا و دە ئامۆژگارییەکە و دەقە یاساییە گشتییەکان کە بەر لە دانانی یاساکان نەریتێکیان دیاری کردبوو. هەموو ئەو دەقانە دەبێتە پارچەیەکی پەرشوبڵاو لە سەرجەم کۆمەڵەکانی پەیمانی کۆن.

کەمێك دوای ئەوە، لەوانەیە لە سەدەی دەیەمی پێش زایین ئەو دەقە نووسرایەوە کە بە گێرانەوەی (یەهوی) ناسراوە کە پاشان بنچینەی پێنج بەشەکەی پێکهێناو دواتر بە پێنج بەشەکەی موسا ناسرا..دوای ئەوە گێرانەوەی ناسراو بە (ئەلهیمی) و گێرانەوەیەکی تری ناسراو بە(کەهەنوتی) بۆ ئەو دەقە زیاد

کرا، دەقی یەهوی یەکەم باس لە ماوەی نێوان بنچینەی جیهان تا مردنی یەعقوب دەکات کە لە شانشینی باشور دەرچووە..

لە کۆتایی سەدەی نۆیەم تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی پێش زایین دەسەلاتی پێغەمبەرایەتی (ئیلیا) و (یەشەع) پێکهات و بلاوبوویەوە و کتێبەکەشیان لەبەر دەستماندایە. هەروەها ئەوە ماوەی دەقی ئەلهیمی تەوراتە کە بە نیسبەت دەقی یەهوی باسی ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراو دەکات: ئەم دەقە ڕووداوەکانی تایبەت بە ئیبراهیم و یەعقوب و یوسف دەگێڕێتەوە. هەردوو بەشی یەشوع و دادوەران بۆ ئەو ماوەیە دەگەڕێتەوە.

بەلام سەدەی هەشتەمی پێش زایین سەدەمی پێغەمبەران عاموس و هوشەع لە ئیسرائیل و ئەشعیا و میخایە لە مەملەکەتی باشور.

بە داگیرکردنی سامورە لە ٧٢١ ی پێش زایین، مەملەکەتی ئیسرائیل کۆتایی هات و، مەملەکەتی باشور پێشوازی لە میراتە ئاینییەکەی کرد. پێدەچێ کۆمەڵەی نموونە و پەندەکان سەر بەو سەردەمە بێت کە بە یەککگرتنی هەردوو دەقی تەوراتی یەهوی و ئەلهیمی لە یەك بەرگدا دەناسرێتەوە، بەوەش ئەوەی ناسراوە بە تەورات هاتەبوون، هەروەکو ئەگەر هەیە مێژووی نووسینی بەشی (التثنیة) بگەڕێتەوە بۆ ئەم سەردەمە.

دەسەلاتی یەشوع لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایین لەگەڵ سەرەتاکانی پێغەمبەر ئەرمیا پێکدەگات. بەلام دانەری ئەمەی دوایی تەنها سەدەیەك دوای ئەو سەردەمە شێوەی کۆتایی وەرگرت.

بەڵام مێژووی نامەکانی (سەفنیا و ناحوم و حەبقوق) دەگەڕێتەوە بۆ پێش پەراگەندەکردنی یەکەم بۆ بابل لە ساڵی ٥٩٨ ی پێش زایین. لە کاتی ئەو پەراگەندەکردنەدا (حزقیال) کاری پێغەمبەرایەتی دەکرد. پاشان لە ساڵی ٥٨٧ ی پێش زایین شاری قودس ڕووخا. ئەم قسەیە دەکەوێتە پێش پەراگەندەکردنی دووەم کە تاوەکو ٥٣٨ ی پێش زایین درێژبۆوە.

بەڵام کتێبی حزقیال کە دوا پێغەمبەری گەورە و هەروەها پێغەمبەری نەفیکراویشە، کتێبەکەی تەنها دوای مردنی بەم شێوەیەی ئێستا تۆمارکراوە، نووسەرەکان کە بوونە میراتگری ڕۆحی ئەو، کتێبەکەیان تۆمارکردووە، هەر ئەو نووسەرانە گێڕانەوەی سێیەمی بەشی (بەدیهێنان) کە ناوی گێڕانەوەی کەهەنوتییە تۆمارکردووە، ئەو گێڕانەوەش باسی بەشی تایبەت بە بەدیهێنانی کردووە کە تاوەکو مردنی یەعقوب درێژ دەبێتەوە.

کەواتە بەم شێوەیە دەقی سێیەم خرایە نێو هەردوو دەقی یەهوی و ئەلهیمی لە تەورات، دواتر ڕواڵەتێك لە ڕواڵەتەکانی بەیەکداچوونی ئەم دەقە لەگەڵ ئەو کتێبانەی نزیکەی چوار یان دوو سەدە بەر لەوە تۆمارکراون، دەبینین..

لە ساڵی ٥٣٨ ی پێش زایین بە فەرمانی سیروس پەراگەندەکردن بۆ بابل کۆتایی هات، جولەکەکان(یەهود) گەڕانەوە فەلەستین و پەرستگای قودس بنیات نرایەوەو چالاکیی پێغەمبەرایەتی دەستی پێکردەوە. لێرەوە کتێبەکانی حوجای و زەکەریا و ئەشعیای سێیەم و مەلاخی و دانیاڵ و باروك دەرکەوتن (کتێبی باروك بە یۆنانی نووسرا بوو)..

هەروەها ئەو ماوەیەی دوای پەراگەندەکردن دێت ماوەی کتێبەکانی حیکمەتـە: نموونە و پەندەکان بۆ دواجار لـە سـاڵی ٤٨٠ ی پـێش زایـین نووسـرانەوە، بەشـی (ئەییووب) بە نزیکەیی لە سەدەی پێنجـەمی پـێش زایـین نووسـرایەوە، هـەروەکو مێژووی بەشی (جامیعە) بۆ سەدەی سێیەمی پێش زایـین دەگەڕێتـەوە. هـەروەها سەردەمی سروودی سرودگوتن و هەردوو کتێبـی هەواڵـەکانی ڕۆژگـار و کتێبـەکانی عەزرا و نەحمیا..

بەڵام کتێبی (بن سیراخ) لە سەدەی دووەمی پێش زایـین دەرکـەوت، هـەروەها بەشی (حیکمـەتی سـولەیمان) و هـەردوو بەشـی (موکابییـەکان) سـەدەیەك پـێش مەسـیح نووسـراوەتەوە. بەشـەکانی (ڕاعـوث و ئەسـتیرویونس) مێـژوویان وەکـو هەردوو بەشی (طوبیا و یەهودیت) دژوارە..

هـەموو ئـەم زانیارییانـە لـە ژێـر تێبینـی دەسـکارییەکانی دواتـر دراون چـونکە کتێبەکانی پەیمانی کۆن تەنها بـەر لـە چـەند سـەدەیەك لـە هاتنـەدونیای مەسـیح شێوەی یەکەمی وەرگرت و لە سەدەی یەکەمی دوای لەدایکبوونی مەسیح شێوەی کۆتایی وەرگرت هەروەکو زۆرێك وەهای دەبینن.

لەوەوە، پەیمانی کـۆن وەکـو کۆشـکێکی ئـەدەبی دەبینـرێ بـۆ گـەلی یـەهودی لەوەتـەی بنچـینەیەوە تـاوەکو سـەردەمی مەسـیحی، لـە نێـوان سـەدەی دەیـەم تاوەکو یەکەمی پێش زایین، ئـەو بەشـانەی تـەوراتیان لێ پێکهـاتووە تۆمـارکران و تەواوکران و پێداچوونەوەیان بۆ کرا. هەرگیز ئەوە تێڕوانینێکی شەخسیی نییە کە لەبارەی مێژووی نووسینەوەی ئەو بەشانە بیدەین، پێـدراوە جەوهەرییـەکانی ئـەو سـەرنجە مێژووییـە لـە وتـاری (تـەورات)ی ئینسـایکلۆپیدیای ئونیڤەرسالیسـی

نووسەر(ج.ب.ساندروز) مامۆستا لە کۆلیژەکانی دومەنیکان لە سولشوار وەرگیراوە، بۆ ئەوەی تێ بگەین کە پەیمانی کۆن چییە دەبێ ئەو زانیارییانە لە زەینمان ئامادە بێت، ئەو زانیارییانەش پسپۆڕانی ئاستبەرز لێهاتوو سەلماندوویانە..

سروش بە هەموو ئەم نووسراوانە تێکەڵ بووە، بەڵام ئێمە ئەمڕۆ تەنها ئەو دەقانەمان لەبەردەستە کە ئەو نووسەرانە بۆیان بەجێهێشتووین کە بە سروشتی خۆیان و بە پێی ئەو بارودۆخەی تێیدا ژیاون و ئەو پێویستییانەی لەسەریان بووە ڕووبەڕوویان ببنەوە، دەقەکانیان نووسیوە. کاتێ ئەم پێدراوە بابەتییانە بەراورد دەکەین بەوانەی پێشەکییەکانی کتێبە پیرۆزەکان کە تایبەتە بە خەڵکی ڕەشۆکی ئاشکرای دەکەن دەرکی ئەوە دەکەین کە ئەم پێشەکیانە بابەتەکان بە شێوەیەکی جیاواز بەڕێ دەکەن، لەبارەی بابەتە بنەڕەتییەکانی تایبەت بە تۆمارکردنی کتێبەکان بێدەنگ دەبێت، هەروەها لێڵییەك دەهێڵێتەوە کە خوێنەر سەرگەردان دەکات، لە بایەخی هەندێ شتی تریش کەم دەکاتەوە تا ئاستێك بیرۆکەیەکی هەڵە لەبارەی ئەو واقیعەی بە ڕاستی ڕووی داوە بەدەستەوە دەدات، بەم جۆرە پێشەکییەکانی زۆرێك لە کتێبە پیرۆزەکان حەقیقەت دەشێوێنن، بەڵکو ئەگەر کتێبگەلێك هەبن سەرجەمی تووشی چەندان جار دەسکاری بووبێت (هەروەکو لە پێنج بەشەکەی موسا ڕووی داوە)، نووسەرانی پێشەکییەکان تەنها بەوەندە واز دێنن ئاماژە بەوە بکەن کە دوای نووسینەوەی دەقەکە هەندێ وردەکاری زیاد کراوە. هەندێکیان لەبارەی برگەیەکی بێبایەخ لەم بەش یان ئەو بەش مشتومڕ دەکەن و لەبارەی هەندێ بابەتی زۆر زیندووش کە شیاوی چەندان

لێکۆڵینەوەی درێژە بێدەنگ دەبن، ئەوەی شیاوی داخە ئەوەیە زانیاریگەلێك بۆ خوێنەران بپارێزرێ کە تا ئەم ئاستە هەڵەو پەڵەی تێدا بێت.

## تەورات یان پێنج بەشەکەی موسا:

تەورات ناوێکی سامییە. بەڵام گوزارشتی یۆنانی کە وشەی(pentateuque)ی فەرەنسی داوە واتای ئەوەیە کە لە پێنج بەش پێکهاتووە کە ئەمانەن: (التکوین) و (الخروج) و (اللاویین) و (العدد) و (التثنیة)، ئەمانەش ئەو بەشانەن کە پێنج ڕەگەزە سەرەتاییەکەی کتێبی پەیمانی کۆنی لە سی و نۆ بەرگدا پێکهێناوە..

ئەو کۆمەڵە دەقە باس لە بنچینەی گەردوون تاوەکو چوونی گەلی یەهودی بۆ خاکی کەنعان دەکات، خاکی بەڵێن پێدراو دوای دەرچوون لە میسر، بە دیاریکراوی تاوەکو مردنی موسا، چیرۆکی ئەم ڕووداوانە وەکو چوارچێوەیەك بۆ خستنەڕووی ڕێوشوێنە تایبەتەکانی ژیانی ئاینی و ژیانی کۆمەڵایەتیی گەلی یەهودی بەکاردەهێنرێ، لێرەوە ناوی تەورات واتە ڕازگر هاتووە.

بۆ ماوەی چەندان سەدەی دوورودرێژ، یەهودی و مەسیحی وایان دەدەنا کە خودی موسا نووسەری تەوراتە، لەوانەیە ئەوەش بەهۆی ئەو قسەیەی پەروەردگار بێت کە بە موسای گوتووە: ((ئەوە وەکو یادەوەری و بیرخستنەوەیەك لە کتێبدا بنووسە.)) (الخروج – الاصحاح١٧ ئایەتی ١٤)..یان لەوانەیە پشتی بەستبێت بە ئایەتی ٢ لە اصحاحی ٣٣ لە بەشی(العدد): ((بە پێی قسەی پەروەردگار، موسا شوێنی دەروازەی گەشتەکانیانی نووسی))...یان پشتی بەستووە بە ئایەتی ٩ لە اصحاحی ٣١ لە بەشی (التثنیة): ((موسا ئەم تەوراتەی نووسی.))..لە سەرەتای

سەدەی یەکەمی پێش زایینەوە داکۆکی لەو ڕایە دەکرا کە دەیگوت: موسا هەر پێنج بەشەکەی تەوراتی نووسیوە..هەر یەك لە (فلاڤیوس جۆزیف) و (فیلۆن ئەسکەندەری) داکۆکییان لەو ڕایە دەکرد..

بەڵام ئەمڕۆ ئەو گریمانەیە تەواو پشتی هەڵکردووە. هەمووان لەسەر ئەو خاڵە کۆکن، بەڵام ئەوە ڕێگر نییە لەوەی پەیمانی نوێ (ئینجیل) ئەو کتێبانە دەداتە پاڵ موسا. لە ڕاستیدا بۆڵس لە نامەکەیدا بۆ خەڵکی ڕۆمیە (اصحاحی ١٠ ئایەتی ٥) دەڵێ: ((لەبەرئەوەی موسا لەبارەی داد کە لە سروشەوە دێت دەنووسێ...))ئەو بەوە دەستەواژەیەکی بەشی (اللاویین) باس دەکات. بەڵام یۆحەننا وا لە مەسیح دەکات کە ئەو دەستەواژەیە بڵێت: ((لەبەرئەوەی ئەگەر ئێوە موساتان دەبینی ئەوا باوەڕتان پێ دەکردم چونکە ئەو لەبارەی منەوە نووسیویەتی. ئەگەر ئێوە باوەڕ بەوە نەکەن کە ئەو نووسیویەتی ئەی چۆن باوەڕ بە قسەکانی من دەکەن)) (ئینجیلی یۆحەننا اصحاحی ٥: ٤٦–٤٧)..مەبەست لێرە هەروەکو ڕوونە بریتییە لە کردەی نووسین، ئەو وشە یۆنانیەش کە لە دەقە کامڵەکەدا دەیبینین کە بە یۆنانی نووسراوە بریتییە لە (Episteute) ئەوەش تەئکیدێکی تەواو هەڵەیە کە یۆحەننا دەیخاتە سەر زاری مەسیح: لەوەی دادێ بەڵگەیە بۆ ئەوە.

ئەز ڕەگەزەکانی ئەو بەڵگەدارییە لە بابە دیڤۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەی کتێبی پیرۆز لە قودس دەخوازم. بابە دیڤۆ پێشەکییەکی گشتی بۆ وەرگێڕانەکەی بۆ بەشی (التکوین) لە ساڵی ١٩٦٢ لەبارەی پێنج بەشەکەی موسا نووسیوە.

بابە دیڤۆ باس لەوە دەکات کە ((کەلەپوری یەهودی کە عیسا و پێغەمبەران ملکەچی بوون)) تاوەکو کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست پەسندکراو بوو، تاکە ڕەتکەرەوەی ئەو بانگەشەیە (ئەبین ئیسرا) بوو لە سەدەی دوازدەم. لە سەدەی شازدەم (کارلستاد) ئاماژەی بەوەدا ئەستەمە موسا خۆی نووسیبێتی کە چۆن مردووە(بەشی التثنية اصحاح ٣٤ لە ئایەتی ٥ تا ١٢). دوای ئەوە دانەر باسی چەند ڕەخنەگرێکی تر دەکات کە باوکایەتی موسا لایەنی کەم بۆ بەشێکی پێنج بەشەکە ڕەت دەکەنەوە، بە تایبەتی باس لە لێکۆڵینەوەی (ڕیشارد سیمۆن) لەبارەی مێژووی ڕەخنەیی پەیمانی کۆن دەکات. تێیدا سیمۆن جەخت دەکاتە سەر دژوارییەکانی تایبەت بە زنجیرەیی ڕووداوەکان و دووبارەبۆوەکان و فەوزای گێڕانەوەکان و جیاوازییەکانی شێواز لە پێنج بەشەکەی موسا. کتێبەکە هەراو تووڕەییەکی زۆری وروژاندو بە نزیکەیی کەس بە دوای بەڵگەی سیمۆن نەکەوت کە ئەوە بوو: سەرچاوەکانی سەردەمانی کۆن لە کتێبە مێژووییەکان لە سەرەتای سەدەی هەژدە زۆربەی کات پشتیان بەوە دەبەست (کە موسا نووسیویەتی).

کەواتە مرۆ دەتوانێ خەیاڵ بکات تا چ ڕادەیەك دژوار بووە خورافەیەك بەرپەرچ بداتەوە کە پاڵپشتی لێکراوە و خودی مەسیح لە پەیمانی نوێدا (ئینجیل) هێناویەتی. ئێمە قەرزاری (جان ئەستروك)ی پزیشکی لویسی پازدەیەمین کە لەو بابەتەدا بەڵگەی یەکلاکەرەوەی پێشکەش کردووە.

لە ساڵی ١٧٥٣ جان ئەستروك لێکۆڵینەوەیەکی بە ناونیشانی ((بەڵگەگەلێك لەو یاداشتە ڕەسەنانەی کە وا پێدەچێ موسا بۆ نووسینی بەشی (التكوين) بەکاری هێناوە))، تێیدا تەئکید لەسەر سەرچاوەکان دەکاتەوە. ئەو یەکەم کەس نەبوو

ئاماژەی بەوەدا، بە هەر حاڵ ئازایەتییەکی تێدا بوو تاوەکو بە ئاشکرا و بۆ هەموو خەڵك تێبینییەکی بنەڕەتی بڵاو بکاتەوە کە بریتییە لە: بوونی دوو دەق لە پاڵ یەکتر لە بەشی التکوین کە هەر یەکێکیان خاسیەتێکی جیاواز لە ناونانی پەروەردگار لە خۆدەگرێت: یەکیان ناوی (یەهوە)ی لێ دەنێت، ئەویتریش ناوی (ئەلوهیم)ی لێ دەنێت.

پاشان (ئیچهۆرن ١٧٨٠ — ١٧٨٣) هەمان دۆزینەوەی لە چوار کتێبەکەی تر ئەنجام دا.

پاشان (ئیلگن ١٨٩٧) هات و تێبینی ئەوەی کرد یەکێك لەو دوو دەقەی ئەستروك جیای کردنەوە، ئەو دەقەی کە پەروەردگار بە ئەلوهیم ناودەبات هەروەها ئەویش دەبێتە دوو بەش. بەوەش کتێبی (پێنج بەشەکەی موسا) بە تەواوی وردوخاش بوو.

بەڵام لێکۆڵەرانی سەدەی نۆزدە هەوڵەکانیان تەرخان کرد بۆ گەڕان بە دوای سەرچاوەگەلی وردتر. لە ساڵی ١٨٥٤ چوار سەرچاوەی پەسندکراو هەبوو کە بەو ناوانە ناودەبران: بەڵگەنامەی یەهوی، بەڵگەنامەی ئەلوهیمی، بەشی (التثنیة)، دەقی کەهەنوتی، لێکۆڵەران لە دانانی تەمەنێك ئەم سەرچاوانە سەرکەوتوو بوون:

١— بەڵگەنامەی یەهوی دەکەوێتە سەدەی نۆیەمی پێش زایین(لە مەملەکەتی باشور نووسراوە).

٢— بەڵام بەڵگەنامەی ئەلوهیمی لە ڕووی مێژووییەوە کەمێك نزیکترەو(لە ئیسرائیل نووسراوە).

٣- بەشی (التثنیة) بە پێی ڕای ئەدمۆند جاکوب دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشتەمی پێش زایین، هەندێ لێکۆڵەری تر هەن وەکو بابە دیڤۆ وا دەبینن دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جوزیاس واتە(سەدەی حەوتەمی پێش زایین).

٤- دەقی کەهەنوتی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پەراگەندە یان دوای پەراگەندەکردن، واتە سەدەی شەشەمی پێش زایین.

کەواتە بەمە نووسینەوەی دەقی پێنج بەشەکەی موسا بە لانی کەم بۆ سێ سەدە درێژ دەبێتەوە. بەڵام گرفتەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە. لەساڵی ١٩٤١ (ئەی.لودز) توانی لە بەڵگەنامەی یەهوی سێ سەرچاوەو لە بەڵگەنامەی ئەلوهیمی چوار و لە بەشی (التثنیة) شەش و لە دەقی کەهەنوتی نۆ جیا بکاتەوە، ئەوەش بێ حیسابکردن بۆ ئەو ئیزافانەی لە نێوان هەشت نووسەرەوە دابەش بووە. هەروەکو بابە دیڤۆ دەڵێ: ماوەیەکی نزیك لەمەوبەر بیرکردنەوە ((گەیشتە ئەوەی کە زۆرێك لە یاساکانی پێنج بەشەکەی موسا (أسفار موسى الخمسة) لە دەرەوەی تەورات و لە ماوەیەکی زۆر لە پێشتری ئەو مێژووەی بۆی دەگەڕێنرایەوە هاوشێوەی هەبوو))، هەروەها ((ژمارەیەك لەو گێڕانەوانەی پێنج بەشەکەی موسا وا گریمان دەکرێ سەرچاوەیەکی کۆنتر لەو بەڵگەنامانەی لێی هاتووە هەبێ))، ئەوەش دەبێتە پاڵنەری بایەخدان بە گرفتی ((دروستبوونی کەلەپوور)). ئەو کات گرفتەکە وا دەردەکەوێ کە تا ئاستێك ئاڵۆزە بە جۆرێك مەسەلەکە لە هەموان تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت.

فرەیی سەرچاوەکان، ناسازی و دووبارەبوونەوەی زۆر لەو دەقانە دێنێتە ئاراوە. بابە دیڤۆ چەند نموونەیەك دەهێنێتەوە لەسەر ئاڵۆزیی ئەو وتە بەجێماوانە

تایبـەت بـە بـەدیهێنان و وەچـەکانی قابیـل و لافـاو و ڕفانـدنی یوسـف و ئـەو ڕووداوانەی لە میسر بەسەری هات و جیاوازییەکانی تایبەت بە ناوەکانی کەسێك و وێنا جیاوازەکانی ڕووداوە گرینگەکان.

بەم جۆرە پێکهاتنی کتێبی پێنج بەشەکەی موسا ڕوون دەبێتەوە کە چۆن نووسەرەوەکان بە شێوەی زیاد یان کەم لە وتەی بەجێماوی جۆراوجۆر کۆیان کردۆتەوە، هەندێ جار ئەوەی کۆیان کردۆتـەوە بـە تەنیشت یەکەوە دایاننـاوە، هەنـدێ جـاریش بـە ئامـانجی هێنانـەدی یەکێتییـەکی ئاوێتـە شـێوەی ئـەو گێڕانەوانـەیان گۆڕیـوە بـە جۆرێـك هەنـدێ شـتی نامـەعقولّ و ناسـاز و ناکۆکیـان بەجێهێشـتوە کـە وای لـە نوێخـوازان کـردووە بـەرەو لێکۆڵینـەوەی بابـەتی لـە سەرچاوەکان بچن.

کتێبی پێنج بەشەکەی موسا لەسەر ئاستی ڕەخنەی دەقەکان ڕوونترین نموونـە لەبارەی ئەو دەسکاریکردنانە دەدات کە مرۆڤ لـە مـاوەی جیاجیـای مێـژووی گـەلی یەهودی ئەنجامی داوە، هەروەکو نموونەی ڕۆشنیش دەدات بە دەستەوە لـەبارەی ئـەو دەسـکاریکردنانەی کەلـەپوری زارەکـی و ئـەو دەقانـەی نـەوەکانی پێشـوو وەریانگرتووە.

کتێبی پێنج بەشـەکەی موسا لـە سـەدەی ١٠ یـان ٩ ی پـێش زایـین دەسـتی پێکردووە لەگەڵ کەلەپوری یەهویی کە گێڕانەوەکە لە سەرەتای بنچینەی جیهـان دەست پێ دەکات. جگە لە دانانی هێلکەلی پان بۆ چارەنووسی تایبەتی ئیسـرائیل شتێکی زیاتر ناکات هەروەکو بابە دیڤۆ دەڵێت، ئەوەش تاوەکو ((ئەو چارەنووسە لە چوارچێوەی ئیرادەی خودا تایبەت بە مرۆڤایەتی دادەنێت)).

کتێبەکە لە سەدەی شەشی پێش زایین بە دەقی کەهەنوتی کۆتایی دێت کە بایەخ بە مێژوو و ڕەچەڵەکەکان دەدات.

بابە دیڤۆ دەڵێت: ((ئەوەی ئەو وتە بەجێماوانە پێی دەناسرێنەوە بایەخدانیانە بە لایەنی تەشریعی وەکو: حەسانەوە لە ڕۆژی شەممە لە دەمی کۆتاییهاتنی بەدیهێنانی دونیا، پەیوەستبوون بە نوح و پەیوەستبوون بە ئیبراهیم و پاکبوونەوە و ....)). با باسی ئەوەش بکەین کە دەقی کەهەنوتی لە ڕووی مێژووییەوە دەکەوێتە کاتی گەڕانەوە لە پەراگەندەکردنی بابل و دووبارە گیرسانەوە لە فەڵەستین لە سەرەتای ساڵی ٥٣٨ ی پێش زایین، کەواتە لێرەدا بەناویەکداچوونێکی ئاڵۆز لە نێوان گرفتە ئاینییەکان و گرفتە سیاسییە پەتییەکاندا هەیە.

ئەوەی پەیوەستە بە بەشی (التكوين) دابەشبوونی کتێبەکە بۆ سێ سەرچاوە بە کردەیی چەسپاوە: بابە دیڤۆ لە کۆمێنتەکانی لەسەر وەرگێڕانەکەی، چەند برگەیەکی دەقی بەشی التكوين ی ئێستا دیاری دەکات کە ملکەچی سەرچاوەیەك لەم سەرچاوانە دەبێت، ئەگەر پشتمان بەو پێدراوانە بەست ئەوا دەتوانین بۆ هەر بەندێك دیاری بکەین کە سەرچاوەکە چی پێیە. بۆ نموونە، ئەوەی پەیوەستە بە بەدیهێنان و لافاوەکە و ئەو ماوەیەی لە لافاوەوە تاوەکو ئیبراهیم درێژ دەبێتەوە، ئەو سەردەمانەن کە یازدە بەندی یەکەمی بەشی التكوين ی داگیرکردووە، لە گێڕانەوەی تەوراتدا بەشێك لە دەقی یەهوی دەبینین کە بەشێك لە دەقی کەهەنوتی بەدوادا دێت، دەقی ئەلهیمی لەو یازدە بەندەدا ئامادە نییە. لێرەدا بە ڕوونییەکی تەواوە بەیەکداچوون و ئاڵۆزیی بەشدارییەکانی یەهوی و کەهەنوتی دەردەکەوێ. بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە بەدیهێنان تاوەکو نوح (واتە بەندەکانی

یەکـەم) ئـەوا ڕێکخسـتنیان سـادەیە: بڕگەیـەکی یـەهوی بـە دوای بڕگەیـەکی کەهەنوتیدا دێت و بەم شێوەیە لە سەرەتاوە تاوەکو کۆتایی گێڕانەوەکە.

بەڵام ئـەوەی پەیوەسـتە بـە لافاوەکـە بـە تایبـەتی هـەردوو بەنـدی حەوتـەم و هەشتەم ئەوا دابەشکردنی دەقەکە بەپێی سەرچاوەکانی، بڕگەگـەلێکی زۆر کـورت دادەبڕێنێت کە دەگاتە تاکە ڕستەیەك..لە نزیکەی ١٠٠ دێڕ لە دەقە فەڕەنسـییەکە ١٧ جار لە سەرچاوەیەکەوە بۆ سەرچاوەیەکی تر دەچین: لێرەوەیە ئەو ناسازی و شتە نامەعقوڵانە کە ئەمڕۆ لە کاتی خوێندنەوەی ئەم دەقەدا دەرك دەکرێ.

((لێـرەدا خشـتەیەك هـەبوو بـە گـرینگم نـەزانی داینـێم چـونکە پێموابـوو بـۆ خوێنەری کورد زۆر سوودبەخش نییە...وەرگێڕی کوردی))..........

## کتێبە مێژووییەکان

کتێبە مێژووییەکان باس لە مێژووی گەلی یەهودی دەکەن لە دەمی چوونی بۆ زەوی میعاد تاوەکو پەراگەندەکردن(النفی) بۆ بابل لە سەدەی شەشی پێش زایین..

تۆنی ئەم کتێبانە جەخت لەوە دەکاتەوە کە دەکرێ ناوی بنێین (واقیعی نەتەوەیی)و ، کتێبەکان وەکو جێبەجێکردنی وتەی خودا دەیخەنەڕوو. گێڕانەوەکە بایەخ بە وردیی مێژوویی نادات. بۆ نموونە بەشی (یشوع) پێش هەموو شتێك ملکەچی پاڵنەرە ئاینییەکانە و بەم بۆنەیەوە مامۆستا جاکوب ئاماژە بە ناسازی و ناکۆکیی ئاشکرای نێوان شوێنەوارناسی و دەقەکان دەکات سەبارەت بەوەی پێی دەگوترێ وێرانکردنی هەردوو شاری (جیریکۆ) و (ئای).

تەوەری بەشی (القضاة) بریتییە لە بەرگریکردن لە گەلی هەڵبژێردراو دژی ئەوانەی ئابلۆقەیان دەدا و فریاکەوتنی خودا بۆیان، کتێبەکە چەندان جار دەسکاری کراوە، ئەوەش ئەو باسەیە کە (بابە ئەی.لوفیڤەر) بە بابەتیبوونێکی گەورەوە لە سەرەکەی بۆ تەوراتی کرامپۆرن ئاماژەی پێ دەکات و پێشەکی و پەراوێزەکان شایەتی ئەوە دەدەن، چیرۆکی (راعوث) لە بەشی (القضاة) پەیوەستە بەو گێڕانەوانە..

بەڵام کتێبی (سەمویل) و کتێبەکانی پاشاکان لە بنەڕەتدا کۆمەڵێك ژیاننامەن تایبەت بە سەمویل و تالوت و سولەیمان و، بەهای مێژووییان جێی گومانە. لەم تێڕوانینەوە مامۆستا جاکوب لەم کتێبانەدا هەڵەی زۆر دەبینێ، یەك ڕووداو چەند گێڕانەوەیەکی دوانە یان سێیانەشی هەیە. پێغەمبەران (ئیلیا و یەشەع و ئەشعیا)

شوێنیان لەو گێڕانەوانەدا هەیە، بەمەش هێڵە مێژووییەکان بە ئەفسانەکان تێکەڵاو دەبێ. بەڵام هەندێ کەسی وەکو بابە لوفیڤەر هەن کە پێیان وایە((بەهای مێژوویی ئەم کتێبانە بنەڕەتییە)).

هەردوو ئیصحاحی یەکەم و دووەم لە دەنگوباسی ڕۆژگار و کتێبەکانی عەزرا و نەحمیا سەر بە یەك نووسەرە ناوی ((القصاص – چیرۆکبێژ)ەو لە کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زایین ژیاوە. ئەو لە نوێوە سەرجەمی مێژوو هەر لە خولقاندنەوە تاوەکو ئەو سەردەم باس دەکات وێڕای ئەوەی لە کن ئەودا ڕەچەڵەکەکان لە داودەوە دەوەستن. لە ڕاستیدا ئەو لەسەرووی هەموو شتێکەوە کتێبی سەمویل و کتێبی پاشاکان بەکاردێنێ((بەڵکو ئەو بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەبەریان دەنووسێتەوە بێ ئەوەی بایەخ بدات بەو ناسازییانەی لەو لەبەرنووسینەوەیە دەکەوێتەوە))ئەمە قسەی مامۆستا جاکوبە. بەڵام ئەو هەندێ شتی دیاریکراو زیاد دەکات کە شوێنەوارناسی جەخت لە ڕاستییان دەکاتەوە. کەواتە لەم دانراوانەدا بایەخ دراوە بە گونجاندنی مێژوو لەگەڵ پێویستییە لاهوتییەکان. هەروەکو مامۆستا جاکوب دەڵێ: لێرەدا نووسەر مێژوو لە ڕوانگەو دەسپێکی لاهوتەوە دەنووسێ. بینا لەسەر ئەوە، نووسەر تاوەکو ئەوە ڕوون بکاتەوە کە (منسی) شای مەملەکەت کە خەڵکی چەوساندۆتەوە و پیرۆزییەکان پیس کردووە زۆری خایاندووە و گەشەی کردووە، وا گریمانە دەکات کە ئەو پاشایە لە گەشتێکیدا بۆ ئاشور ئیمانی هێناوە(دەنگوباسی جیهان ئیصحاحی دووەم ٢٣/١١)، بۆ ئەم بابەتەش هیچ سەرچاوەیەك لە هیچ کتێبێك لە کتێبەکانی تەورات یان دەرەوەی نییە)).هەر دوو کتێبی عەزرا و نەحمیا زۆر داڕوخاوو هەڵوەشاوەن چونکە پڕن لە لێڵی و ناڕوونی و پەیوەستن بە سەردەمێك کە خۆی

نەناسراوە، ئەوەش بە هۆی نەبوونی بەڵگەنامە لە دەرەوەی کتێبە پیرۆزەکان، سەردەمەکەش سەدەی چوارەمی پێش زایینە.

کتێبەکانی (طوبیا و جودیت و ئەستیریین) کتێبە مێژووییەکان پۆلێن دەکەن کە لە بەرامبەر مێژوودا زیادەڕەوی و دەسکاری زۆریان تێدایە: گۆڕینی ناوی کەسە دیارەکان و داهێنانی کەسایەتی و ڕووداوی تێدایە، هەموو ئەمانەش بە نیازێکی باشی ئایینی. لە ڕاستیدا ئەم کتێبانە چیرۆکی ڕەوشتئامێزی پڕ لە هەڵەی مێژوویی و شتی دوور لە مێژووی تێدایە.

بەڵام دوو کتێبەکەی(مکابیین) تەواو جیاوازن، بە شێوەیەکی ڕاست و بە زۆرترین ئەندازەی گونجاو لە مێژووی ئەو سەردەمە ڕووداوەکانی سەدەی دووی پێش زایین دەگێڕنەوە، بەمەش شایەتیدانێکی بەنرخ پێکدێنیٚ.

کەواتە، ئەو کۆی کتێبانەی بە مێژوویی ناونراون زۆر لێك جیاوازن و، مێژوو هەروەکو چۆن بە شێوەیەکی زانستی باس کراوە ئەوهاش بە شێوەیەکی وەهمی باس کراوە.

## کتێبە پێغەمبەرایەتییەکان

لەژێر ئەم ناوەدا ئامۆژگاری سەرجەم پێغەمبەران ئەوانەی لە نێو تەوراتدا هەن کۆدەبێتەوە بێجگە لە گەورە پێغەمبەران کە لە کتێبەکانی تر ئاماژەیان پیٚ کراوە وەکو موسا و سەمویل و ئیلیا و یەشەع.

کتێبە پێغەمبەرایەتییەکان ماوەی نێوان سەدەی هەشت و سەدەی دووی پێش زایین ڕومالّ دەکات.

کتێبەکانی سەدەی هەشتی بەر لە زایین بریتیین لە: کتێبەکانی عاموس و هوشەع و ئەشعیا و میخا. یەکەمیان بە سەرکۆنەکردنی ستەمە کۆمەڵایەتییەکان و دووەمیان بە ریسواکردنی گەندەڵیی ئاینی ناسراوە، ئەوەش بووە هۆی ئەشکەنجەدانی جەستەیی دووەمیان(دوای ئەوەی ژنێکی لەشفرۆشی پیرۆزی لە بتپەرستیدا مارەکرد)، ئەوەش وەکو وێنەیەکی خودا کە بە هۆی لێکهەڵوەشانی گەلەکەی ئازار دەچێژێ ئەگەرچی هەمیشە خۆشەویستی پێ بەخشیووە، بەڵام ئەشعیا ڕووی مێژووی سیاسییە: ئەو سەرکردایەتیی ڕووداوەکان دەکات چونکە پاشاکان ڕاوێژی پێ دەکەن، ئەو پێغەمبەری مەزنێتییە، پێشبینییەکانی دەخرێتە سەر دانراوەکانی کە قوتابییەکانی تاوەکو سەدەی سێی پێش زایین بڵاویان کردەوە: وەکو نارەزاییەکانی دژ بە ستەمەکان و ترس لە ڕۆژی دوایی و مژدەدان بە ڕزگاربوون لە سەردەمی پەراگەندەیی و پێشبینیکردن لە ماوەی داهاتوو بە گەڕانەوەی یەهود بۆ فەڵەستین. هەروەها بە دڵنیاییەوە پێغەمبەرێتی ئەشعیای دووەم و سێیەم لە پاڵ بایەخدانی پێغەمبەرێتی، گرینگیپێدانی سیاسیشی بە ڕوونی پێوە دیارە. پەیامی میخاش کە هاوچەرخی ئەشعیا بووە هەمان ئەو بیرو فیکرانەی هەبووە.

لە سەدەی حەوتەمی پێش زایین سەفنیا و ئەرمیا و ناحوم و حەبقوق لە مژدەدان دەردەکەون. ژیانی ئەرمیا بە شەهیدبوون کۆتایی دێت.باروك پەیامەکانی وەرگرت. لەوانەیە ئەرمیا نووسەری شیوەن(سەردولکە) بوو بێت.

پەراگەندەکردن بۆ بابل لە سەرەتای سەدەی شەشی بەر لە زایین چالاکییەکی پێغەمبەرانەی گەورەی بەخشی. پێغەمبەر حزقیال لەو چالاکییەدا بە کەسێکی دیار دادەنرێ بەوەی کە دڵدەرەوەی ئەو برایانەی ئومێدیان پەرشوبڵاو ببۆوە. کتێبی عوبیدیا پەیوەستە بە ڕووداوەکانی شاری قودسی تێکشکاو.

دوای پەراگەندەیی کە لە ساڵی ٥٣٨ ی پێش زایین کۆتایی هات چالاکی پێغەمبەرێتی لەگەڵ حەجای و زەکەریا بۆ هاندان لەسەر بنیاتنانەوەی پەرستگا دەستی پێکردەوە.ئەوەی بە ناوی مەلاخی و دوای تەواوبوونی بنیاتنانی پەرستگا نووسراوە پەیام و پێشبینی جۆراوجۆری خاوەن سروشتێکی ڕۆحانییە.

هۆی چییە کە کتێبی یونس خراوەتە نێو کتێبەکانی پێغەمبەران لە کاتێکدا تەورات بە واتای ڕاستەقینەی وشە هیچ دەقێکی ناداتە پاڵ؟ کتێبی یونس چیرۆکێکە بابەتێکی سەرەکی لێ دەردەهێنرێ ئەویش ملکەچبوونی پێویستە بۆ ئیرادەی خوایی.

بەڵام خەونی دانیال لە ڕوانگەی مێژووییەوە سەرسوڕهێنەرە هەروەکو لێدواندەرانی مەسیحی دەڵێن، ئەو بە سێ زمان نووسراوە(عیبری و ئارامی و یۆنانی). هەندێك دەڵێن: دانەرێکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دووی پێش زایین لە سەردەمی (مکابیین). پێدەچێت دانەری ئەو خەونە ویستوویەتی هاووڵاتییانی لە سەردەمی (ئەوپەڕی خراپیدا) قەناعەت پێ بکات کە وادەی ڕزگاربوون نزیکەو ئەوەش تاوەکو خۆراك بداتە ئیمانیان و بەهێزی بکات(ئەی.جاکوب).

## کتێبەکانی هۆنراوە و دانایی( الحكمة )

کتێبەکانی هۆنراوە و دانایی کۆمەڵانێکن یەکێتییەکی ئەدەبی مشتومڕهەڵنەگریان هەیە، شمشاڵ پایەی یەکەمی لە نێو ئەو کۆمەڵانەدا گرتووە. ئەو کۆشکێکی بەرزە لە هۆنراوەی عیبریدا و داوود ژمارەیەکی زۆری لێ نووسیوەتەوە و ئەوانیتر کاهین و لاوییەکان نووسیویانەتەوە. بابەتەکەشی ستایش و لاڵانەوە و تێڕامانە..ئەرکی شمشاڵەکان شەقڵێکی سروتانە بووە.

بەڵام کتێبی ئەییوب، کتێبی دانایی و چاکە پڕ بە واتای وشە، وەکو دەگوترێ دەگەڕێتەوە بۆ ٤٠٠ یان ٥٠٠ی پێش زایین.

هەروەها شیوەن و سەردولکەکان بۆ قودس لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زایین لەوانەیە نووسەرەکەی ئەرمیا بووبێت.

هەروەها سرودی سرودگوتن: بریتییە لەو سرودە هێماییانەی لەسەرووی هەموو شتێکەوە باس لە خۆشەویستیی خوایی دەکەن، بەشی (الامثال) لە کۆمەڵێك وتەی سولەیمان و دانایانی تر لە بارەگای ئەودا پێکدێت، بەشی (الجامعة) باس لە ئاسوودەیی دونیایی و دانایی دەکات.

پرسیار ئێستا ئەوەیە: ئەو کۆمەڵە لە یەکتر دوورە بەو ناوەڕۆکەی کە لە بەشەکان پێکدێ و بە لای کەمییەوە لە ماوەی حەوت سەدەدا نووسراوە و لە چەندان سەرچاوەی زۆر جیاوازەوە هاتووە چۆن توانراوە لە یەك دانراودا کۆبکرێتەوە؟ چۆن توانیویەتی بە درێژایی سەدەکان ببێتە یەکپارچەو لێك جیانەبێتەوەو لە گەڵ ئەو جیاوازییانەی لە نێوان گروپە ئاینییەکاندا هەیە ببێتە

کتێبی سروشی یەهودی–مەسیحی، چۆن بوویە(قانون) کە وشەیەکی یۆنانییـە بـە واتای دەستلێنەدراو دێت.

کۆکردنەوە ناگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەسیحییەت بەڵکو بـۆ سـەردەمی خـودی یەهودی، بێگومان قۆناغی یەکەمی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی پێش زایین، بە جۆرێك کـە کتێبـەکانی دواتـر دوای ئـەوە هـاتن تـاوەکو بخرێتـە سـەر ئەوانـەی پێشتر هەڵگیرابوون. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە تێبینی ئەو پایـە و شوێنە تایبەتـە بکەین کە لە هەموو سەردەمەکاندا دراوەتە ئەو پێنج بەشـەی بـەرایی کـە تـەورات پێکـدێنێت یـان بـە پێـنج بەشـەکەی موسـا ناسـراوە. هاتنـەدی هەڕەشـەکانی پێغەمبەران(بریتییە لە بەڵێنی سزادان کە پەیوەستـە بـە تاوانەکانـەوە)، وای کـرد خستنەپاڵی کتێبەکانیان بـۆ ئـەو کتێبانـەی پێشـتر پەسـندکرابوون ئاسـان بکـات، (قانون)ی پێغەمبەران بە فیعلی بەر لە سەدەی دووی پێش زایین پێکهاتبوو.

بەڵام کتێبەکانی تر وەکو شمشاڵەکان بەهۆی ئەرکەکەی لە سروتە ئاینییەکان، لەگەڵ نووسراوەکانی تر و نووسراوەکانی سولەیمان یـان ئـەیووبی دانـایی تێکـەڵ کران.

مەسیحییەت سەرەتا یەهودی–مەسیحی بووە کەوا نووسەرانی نوێ باش لێیـان کۆڵیوەتـەوە وەکـو کاردینـاڵ دانیلـۆ، مەسـیحییەت بـە شـێوەیەکی زۆر سروشـتی میراتی پـەیمانی کـۆن(تـەورات) کـە کتێبـەکانی ئینجیـل تونـد پێـوەی پەیوەسـتن وەرگرت، ئەوەش بەر لەوەی ئەو گۆڕانکارییەی بەسـەردا بێـت کـە بـە کاریگـەریی پـۆڵس ڕووی دا. بـەڵام ئەگـەر (پاککردنـەوە)ی ئینجیلـەکان بـە دوورخسـتنەوەی ئینجیلە ساختەکان تەواو بووبێت ئەوا بەرپرسان بە پێویستییان نـەبینیوە هـەمان

جیاکردنەوەی بۆ پەیمانی کۆن ئەنجام بدەن و هەموو ئەوانەیان پەسندکردووە کە لەخۆی گرتووە.

ئایا لێرەدا کەسێك هەبووە بوێرێت پەڵپ و ڕەخنە لەو کۆمەڵە دەقە ناساز و دوور لە یەکە بگرێ تاوەکو سەدەکانی ناوەڕاست و لە ڕۆژئاوا بە لای کەمەوە؟ هیچ کەس..لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تاوەکو سەرەتای سەردەمە نوێیەکان هەندێ ڕەخنە دەرکەوتن، هەروەکو پێشتر بینیمان، بەڵام هەمیشە کەنیسەکان لە سەپاندنی دەسەڵاتیاندا سەرکەوتوو بوون. بێگومان سەردەمی ئێستامان لەدایکبوونی ڕەخنەیەکی ڕاستەقینەی دەقەکانی بەخۆوە بینی. بەڵام ئەگەر پسپۆڕە کەنیسەییەکان لە ڕەخنەگرتنی دەقەکاندا تواناو لێهاتوویی خۆیان بۆ لێکۆڵینەوەی ژمارەیەکی زۆری خاڵە ڕوونکراوەکان تەرخان کردووە، بە باشتریان زانیوە زیاتر بۆ ئەو بابەتانە نەڕۆن کە بە ئاماژە ناویان لێناون(دژوارەکان). پێناچێت حەزیان لێ بێت لێکۆڵینەوەی ئەو دژوارانە لەبەر ڕۆشنایی زانیارییە نوێیەکان بکەن. ئەگەر هیچ کەس نارەزایی لە ئەنجامدانی بەراوردکاری مێژوویی نەبێت بەتایبەتی ئەگەر سازان لە نێوان زانیارییە نوێیەکان و گێڕانەوەی کتێبە پیرۆزەکاندا هەبێت، هیچ کەسێك لەم پسپۆڕانە تا ئێستا هەنگاوی نەناوە بۆ بەراوردکردنێکی ڕاشکاوانە و قووڵ لەگەڵ زانیارییە زانستییەکاندا کە دەزانین دەبێتە هۆی ڕەخنەگرتن لە بیرۆکەی ڕاستێتی نووسراوە یەهودی-مەسیحییەتەکان کە تا ئەمڕۆ هیچ یەکێکیان لەبارەیانەوە مشتومڕ ناکات.

# پەیمانی کۆن و زانستی نوێ

## تێبینییەکان

کەمێك لەم بابەتانەی پەیمانی کۆن (تەورات) — وەکو ئینجیلەکان— باسیان دەکات ڕێ بەوە دەدات لەگەڵ پێدراوەکانی زانستە نوێیەکان بەراورد بکرێت. بەڵام کاتێ دژیەکییەك لە نێوان دەقی تەورات و زانستدا ڕوودەدات ئەوا لەو مەسەلانەدا دێت کە دەتوانین بە گرینگ وەسفی بکەین.

لە بەشی پێشوودا بینیمان کە تەورات هەڵەگەلی مێژوویی تێدایەو، هەندێ لەو هەڵانەشمان باس کرد کە ڕاڤەکارانی یەهود و مەسیحی ئاشکرایان کردوون. ڕاڤەکارە مەسیحییەکان بە شێوەیەکی سروشتی بۆ ئەوە دەچن لە گرینگیی ئەو هەڵانە کەم بکەنەوە. وا دەبینن کە تەواو سروشتییە نووسەری ئایینی باسوخواسێکی مێژوویی بە پێی تێڕوانینێکی ئایینی پێشکەش بکات: کەواتە ئەوان بە گوێرەی پێداویستییەکانی حاڵ مێژوو دەنووسن.

دواتر بە نیسبەت ئینجیلی (متی)وە هەمان ڕەفتار لە بەرامبەر واقیع و هەمان قسەکردن دەبینین کە ئامانجی سەپاندنی پێچەوانەی حەقیقەتە وەکو حەقیقەت. گیانی بابەتیبوون و لۆژیکی ناکرێ بەو ڕێگایەی کارکردن ڕازی بێت.

لە گۆشەی لۆژیکەوە دەکرێ ژمارەیەکی زۆر ناسازی و بابەتی نامەعقوڵ لە تەوراتدا بدۆزینەوە. دەکرێ ئەو سەرچاوە جیاوازانەی بۆ دانانی دەقێك بەکارهاتوون بنچینەی گێڕانەوەی یەك ڕووداو بێت بە دوو شێوەی جیاواز بەڵام لەوە زیاتر هەیە: دەستکاریکردنە جیاوازەکان و زیادکردنەکانی دواتر بۆ هەمان دەق وەکو ئەو لەسەرنووسینانەی وەکو دەرئەنجام زیادکراون پاشان لە کاتی

دووبـارە لەبەرگرتنـەوەی خراوەتـەوە نـاو دەقەکـە، هـەموو ئەوانـە پسـپۆڕان لـە ڕەخنەگرتنی دەقەکانـدا دەیانزانن و هەنـدێك بەوپـەڕی ئەمانەتـەوە ئامـاژەی پـێ دەدەن، بۆ نموونە بابە دیڤۆ بە نیسبەت پێنج بەشەکەی موسـاوە لـەو پێشـەکییە گشـتییەی بـۆ وەرگێڕانـی بەشـی (التکـوین)ی نووسـیوە چـەندان خـاڵی دژیـەکی خستۆتە ڕوو..نموونەیەك لەم بارەیەوە:

لە بەشی (التکوین – ئیصحاحی ٦ ئایەتی ٣) خـودا کـەمێك بـەر لـە لافاوەکـە بڕیار دەدات تەمەنی مرۆڤ بە ١٢٠ ساڵ دیاری بکات. تەورات دەڵێ: ((..ڕۆژەکـانی سەت و بیست بێـت)). لەگـەڵ ئـەوەدا دواتـر تێبینـی دەکرێ لـە هـەمان بەشـی( التکـوین – ئیصـحاحی ١١ ئایەتـەکانی ١٠ بـۆ ٣٢ ) ژیـانی وەچـەکانی نـوح ١٤٨ تاوەکو ٦٠٠ ساڵ بەردەوام بـووە. دژیـەکی نێـوان ئـەم دوو دەسـتەواژەیە ڕوونـەو ڕونکردنـەوەی هۆکارەکەیشـی سـادەیە. دەسـتەواژەی یەکـەم دەقێکـی یەهودییـە مێژووەکەی بـۆ سـەدەی دەیـەمی پـێش زایـین دەگەڕێتـەوە. بـەڵام دەسـتەواژەی دووەم لە دەقێکی نزیکە لە ڕووی مێژووییەوە لـە کەلـەپوری کەهـەنوتی (سـەدەی شەشەمی پێش زایین)کە بنچینەی ئەو ڕەچەڵەکانەیە کە پێدەچـێ لـە سـەرژمێری تەمەنەکان ورد بێت بە ئەندازەی ئەوەی نامـەعقوڵ دەردەکـەوێ ئەگـەر وەك یـەك بارستە وەری بگرین.

لـە بەشـی التکـوین زۆرتـرین دژیـەکی ڕوون لەگـەڵ زانسـتی نوێـدا هەیـە. ئـەو دژیەکییانەش تایبەتە بە سێ خاڵی جەوهەری:

١- بەدیهێنانی جیهان و قۆناغەکانی.

٢- مێژووی بەدیهێنانی جیهان و مێژووی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی.

٣- گێڕانەوەی لافاوەکە.

## بەدیهێنانی جیهان

بابە دیڤۆ تێبینی دەکات کە بەشی التکوین ((بە دوو گێڕانەوە لەبارەی بەدیهێنانەوە دەست پێ دەکات هەر یەکێکیان بە تەنیشت ئەویترەوە دانراوە)). لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوەی ڕێککەوتنی ئەو دوو دەقەوە لەگەڵ پێدراوە زانستییەکان پێویستە هەر یەکێکیان جیا لەویتر لێکۆڵینەوە بکرێن.

## گێڕانەوەی یەکەم لەبارەی بەدیهێنانەوە

گێڕانەوەی یەکەم ئیصحاحی یەکەم و ئایەتەکانی بەرایی ئیصحاحی دووەم دەگرێتەوە، لە ڕوانگەی زانستییەوە پڕە لە هەڵە. دەبێ بڕگە بە بڕگە ڕەخنەی لێ بگیرێ.

ئیصحاحی یەکەم- ئایەتەکانی ١ و ٢: ((لە سەرەتادا خودا ئاسمان و زەوی بەدیهێنا. زەوی کاول و چۆڵ بوو و تاریکاییەکان دەریایان داپۆشی بوو و ڕۆحی خوداش بەسەر ئاوەکانەوە دەدرەوشایەوە)).

دەتوانین ئەوە تەواو قەبووڵ بکەین کە لە قۆناغێکی بەر لە بەدیهێنانی زەویدا ئەوەی دواتر دەبووە گەردوون هەروەکو دەزانین لە تاریکاییدا نقوم ببوو. بەڵام ئاماژەکردن بۆ ئاو لەو قۆناغەدا مەسەلەیەکی ڕەمزیی ڕووتە، لەوانەیە وەرگێڕانی ئەفسانەیەك بووە و لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەش دەبینین کە دەکرێ باوەڕ بەوە بکرێ کە لە قۆناغی یەکەمی دروستبوونی گەردوون بارستەیەکی گازی هەبووە، وتنی ئەوەی کە لەو قۆناغەدا ئاو هەبووە هەڵەیە.

ئایەتەکانی ٣ تا ٥: ((با ڕووناکی ببێت ڕووناکی بوو، خودای گەورە بینی کە ڕووناکی جوانە و ڕووناکی و تاریکییەکانی لێك جودا کردەوە، خودا ڕووناکی ناونا ڕۆژ و تاریکییەکانیش شەو. ئێوارە بوو و بەیانی بوو: ڕۆژی یەکەم)).

ئەو ڕووناکییەی گەردوون دەبڕێ ئاکامی چەند کاردانەوەیەکی ئاڵۆزە کە لە ئەستێرەکان ڕوودەدات. بەڵام ئەستێرەکان بەپێی قسەی تەورات هێشتا لەم قۆناغەدا دروست نەبوون بە جۆرێك ((ڕووناکییەکان))ی ئاسمانەکان لە بەشی التکوین تەنها لە ئایەتی ١٤ باس دەکرێ بەو پێیەی خودا لە ڕۆژی چوارەم

دروستی کردووە تاوەکو ((شەو و ڕۆژ لە یەکتر جودا بکاتەوە)) و ((زەوی ڕووناك بکاتەوە))، ئەوەش تەواو ڕاستە.

بەڵام لۆژیکی نییە لە یەکەم ڕۆژدا باسی ئاکامی کردەیی (واتە ڕووناکی) بکەیت لە کاتێکدا لە ڕۆژی چوارەم باسی هۆکاری بەرهەمهێنانی ئەو ڕووناکییە واتە (ڕووناککەرەوە) بکەیت. زیاد لەوەش دانانی شەو و ڕۆژ لە ڕۆژی یەکەمدا مەسەلەیەکی مەجازی ڕووتە: شەو و ڕۆژ بەو پێیەی دوو توخمی ڕۆژێکن مەعقوڵ نییە تەنها دوای بوونی زەوی و سوڕانەوەی بە دەوری خۆردا نەبێت.

((ئایەتەکانی ٦ بۆ ٨)) خودا گوتی: (( با توێکڵێك لە ناوەڕاستی ئاودا بێت و با ببێتە ناوبڕێك لە نێوان ئاو و ئاودا. هەروەش بوو. خودا توێکڵی دروست کرد و ئاوی ژێر توێکڵ و سەر توێکڵی لە یەکتر جودا کردەوە. خودا توێکڵی بە ئاسمان بانگ کرد. ئاسمان بوو و بەیانی بووە: ڕۆژی دووەم)).

لێرەدا ئەفسانەی ئاو بەردەوام دەبێت بە جیابوونەوەی بۆ دوو چین بە هۆی ئەو توێکڵەی چینی سەروو لە کاتی لافاو باران لێیەوە دێتە خوارێ بۆ سەر زەوی، شێوەی دابەشبوونی ئەم ئاوە بۆ دوو بارستە لە ڕووی زانستییەوە پەسندکراو نییە.

لە ئایەتەکانی ٩ بۆ ١٢ — خودا دەڵێت: ((با ئاوەکان لەژێر ئاسمان بۆ یەك شوێن لە یەك بارستەدا کۆببنەوەو با وشکانیش دەرکەوێت، هەروەش بوو. خودا وشکانی بە زەوی و کۆبۆوەی ئاوەکانیشی بە دەریاکان ناونا، خودا ئەوەی بە جوان بینی)).

خودا گوتی: ((با زەوی بە گیای سەوز بڕوێت و تۆوێکی وەکو تـوخمی خـۆی هەڵگرێت، هەروەها بە درەخت بڕوێ کە لـە تـوخمی خـۆی بـەروبوم و تـۆو بـدات. ئێوارە بوو و بەیانی بووە: ڕۆژی سێیەم)).

لە ڕووی زانستییەوە ئەوە پەسندکراوە کە کیشوەرەکان لە قۆناغێکی مێـژووی زەوی دەرکەوتووە کە زەوی بە ئاو داپۆشراو بـووە. بـەڵام لـەو ماوەیـەدا جیهـانی ڕووەك هـەبوو‌بێت کـە لـە ڕێـی تـۆوە زۆر بووبێـت و بـاش ڕێکخـرا بێـت بـەر لـە دەرکــەوتنی خــۆر (بــە پێــی قســەی بەشــی التکــوین خــۆر لــە ڕۆژی چــوارەم دەرکـەوتووە)، هـەروەها ڕێکخسـتنی بەدوایەکداهاتنی ڕۆژو شـەو، ئـەوە بـە هـیچ جۆرێك ناکرێ بوترێ.

ئایەتەکانی ١٤ بۆ ١٩ — خودا گوتی: ((با ڕووناکییەکان لە توێکڵی ئاسمان بـن تاوەکو ڕۆژو شەو لە یەکتر جودا بکاتەوەو، ببێتە نیشانەگەل بـۆ جـەژن و ڕۆژان و ساڵەکان و، بـا ڕووناکییـەکان لـە تـوێکڵی ئاسمـان بـن بـۆ ئـەوەی زەوی ڕوونـاك بکاتــەوە. هــەرواش بــوو و خــودا دوو ڕۆشــنکەرەوەی مــەزنی دروســت کــرد— ڕۆشنکەرەوەی هەرە گەورە بۆ حوکمی ڕۆژ و ڕۆشنکەرەوەی هەرە بچووکیش بـۆ حوکمی شەوو— ئەستێرەکان. خودا لە توێکڵی ئاسمـانی دانـا تـاوەکو سـەر زەوی ڕووناك بکاتەوە و حوکم بەسەر ڕۆژو شەوەوە بکات و ڕووناکی و تاریکی لە یـەکتر جـودا بکاتــەوە،خــودا ئــەوەی بــە جــوان بینــی، ئێــوارە بــوو و ڕۆژ بــوو: ڕۆژی چوارەم)).

لێرەدا وەسفکردنی بنووسی تەورات پەسندکراوە. تاکـە ڕەخنـە کـە بکـرێ لـەو دەستەواژەیە بگیرێ: شوێنەکەیەتی لە کۆی گێڕانەوەکە. زەوی و مانگ هـەروەکو

دەزانین لە ئەستێرە ئەسڵەکەیان کە خۆرە هەڵقولاون. دانانی دروستکردنی خۆر و مانگ دوای دروستکردنی زەوی پێچەوانەی زانیاریی بنچینەییە لەبارەی پێکهاتنی ڕەگەزەکانی سیستمی خۆری.

ئایەتەکانی ٢٠ بۆ ٢٣ — خودا دەڵێ: ((با ئاوەکان پڕ بن لە قاووقیژی بوونەوەرە زیندووەکان و باڵندەکان بە سەر زەوی و لەسەر ڕووی توێکڵی ئاسمان بفڕن. هەروایش بوو..خودا مارە گەورەکانی دەریا و هەموو ئەو بوونەوەرە زیندووانەی لە نێو دەریاکانن دروست کرد، هەموویان بە گوێرەی ڕەگەزو هەموو باڵدارێکیش بە گوێرەی ڕەگەزەکەی. خودا ئەوەی بە جوان بینی و موبارەکی کردو گوتی: ((بەرهەمدار و زۆر بە و دەریاکان پڕکە و با باڵندە لەسەر زەوی زیاد بن. شەو بوو و ڕۆژەکەی بووە: ڕۆژی پێنجەم)).

ئەم بڕگە هەندێ باسی جێی گومانی تێدایە کە ناکرێ قەبووڵ بکرێت.

بەشی التكوين دەڵێ: جیهانی گیانلەبەر یەکەمجار دەرکەوتووە و سەرەتا لە گیانلەبەرانی دەریا و باڵندەکان دەستی پێکردووە. لە ڕاستیدا گێڕانەوەی تەورات دەڵێ: لە ڕۆژی دواتر گیانلەبەران لە زەوی نیشتەجێ کران.

گومان لەوەدا نییە کە ئەسڵی ژیان ئاوییە: لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا لەم مەسەلەیە ورد دەبینەوە. لێرەوە ئەگەر بکرێ بگوترێ، جیهانی گیانلەبەر زەوی داگیرکرد. لەو گیانلەبەرانەی لەسەر ڕووی زەوی دەژین، گروپێکی تایبەتە لە خشۆکەکان کە پێی دەوترێ ((pseudo-suchiens)) کە لە چەرخی دووەمدا دەژیا. باڵندەکان هاتن، وا باوەڕ دەکرێ: زۆر نیشانەگەلی بایۆلۆجی هاوبەش لە نێوان ئەم دوو گروپەدا هەیە کە ڕێ بەو دەرەنجامە دەدات. بەڵام بەشی التكوين

تەنها لە ڕۆژی شەشەم دوای دەرکەوتنی باڵندەکان ئاماژە بە گیانلەبەرانی زەوینی دەدات. کەواتە سیستمی دەرکەوتنی گیانلەبەرانی زەوینی و باڵندەکان پەسندکراو نییە.

ئایەتەکانی ٢٤ بۆ ٣١ — ((خودا گوتی: با زەوی بوونەوەرە زیندووەکانی وەکو ڕەگەزی خۆی دەربهێنێ، ئاژەڵ و خشۆك و دڕندەکان وەکو ڕەگەزی خۆی. هەرواش بوو..خودا دڕندەکان و خشۆکەکان و خشۆکەکانی زەوی وەکو ڕەگەزی خۆیان دروست کرد. خودا ئەوەی بە جوان بینی)).

((خودا گوتی: با مرۆڤ لەسەر شێوەی خۆمان دروست بکەین و، ئەوەش زاڵ بکەن بەسەر ماسیی دەریا و باڵندەکانی ئاسمان و ئاژەڵەکان و هەموو دڕندەیەك و ئەو زیندەوەرانەی لەسەر زەوی دەڕۆن)). خودا مرۆڤی لەسەر شێوەی خۆی دروست کردووە. خودا مرۆڤی بە نێرو مێ خوڵقاند.

((خودا بەرەکەتداری کردن و پێیانی گوت: بەروبوم بدەن و زۆر بن و زەوی پڕ بکەن و ملکەچی بکەن و زاڵ بن بەسەر ماسیی دەریا و باڵندەکانی ئاسمان و هەموو گیانلەبەرێك کە لەسەر زەوی دەڕوات)). ((خودا گوتی: من لەسەر زەویدا هەموو سەوزەیەك کە تۆوی هەیە و هەموو درەختێك کە بەری تێدایە و تۆوی هەڵگرتووە پێم داون، بۆ ئێوەو هەموو دڕندەو باڵندەیەکی ئاسمان و گیانلەبەرێکی سەر زەوی دەبێتە خواردن.)) هەرواش بوو، خودا هەموو ئەوانەی کردبوونی بینی زۆر جوانە. ئێوارە بوو و بەیانی: ڕۆژی شەشەم بوو)).

لە وەسفکردنی هەموو دروستکراوەکاندا، نووسەر هەموو ئەو دروستکراوە زیندووانە باس دەکات کە پێشتر ئاماژەیان بۆ نەکراوە و هێماش بۆ ئەو خۆراکە جۆراوجۆرانە دەکات کە خراوەتە ژێر دەستی مرۆڤ و گیانلەبەران.

هەروەکو دەبینین هەڵەکە لەوەدایە کە دەرکەوتنی گیانلەبەرە زەمینییەکان خراوەتە دوای دەرکەوتنی باڵندەکان. بەڵام دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی بە شێوەیەکی ڕاست دوای دەرکەوتنی بوونەوەرە زیندووەکانی تر دیاری کراوە.

گێڕانەوەی باسی خولْقاندن بە سێ ئایەتی یەکەمی ئیصحاحی دووەم کۆتایی پێ دێت: ((ئاسمانەکان و زەوی بە هەموو سەربازەکانییەوە تەواو کران و خودا لە ڕۆژی حەفتەم لەو کارەی کردی لێ بۆوە. ڕۆژی حەفتەم لەو کارەی کردی پشووی دا. خودا ڕۆژی حەوتەمی بەرەکەتدار و پیرۆز کرد چونکە تێیدا لە هەموو کارەکانی خولْقاندن بۆوە، ئەمە سەرەتاکانی ئاسمانەکان و زەوییە کاتێ دروستکران.)).

گێڕانەوەی ڕۆژی حەوتەم ئەم قسە لەسەرکردنانە دەخوازێ:

یەکەم: واتای وشەکان. دەقەکە بریتییە لە دەقی وەرگێڕانی قوتابخانەی کتێبی پیرۆز لە قودس. ((سەربازەکان)) لێرەدا زیاتر بە واتای ئاپۆرەی بوونەوەرە دروستکراوەکان دێت. سەبارەت بە تەعبیری ((پشووی دا))، ئەوە میتۆدی بەڕێوەبەری قوتابخانەی کتێبی پیرۆزە لە قودس لە وەرگێڕانی وشەی ((شباط))ی عیبری، ئەوەش واتای وردی ئەم وشەیە، هەر لێرەوەش ڕۆژی پشوودانی یەهودییەکان هاتووە((یوم السبت)).

ڕوونە کە ئەو ((پشوودان))ە کەوا شیمانە دەکرێ خودا دوای شەش ڕۆژ کارکردن وەریگرتبێت ئەفسانەیە، بەڵام لێکدانەوە و هۆکاری خۆیشی هەیە.

نابێ ئەوەش لە بیربکرێ کە ڕیوایەتی خوڵقاندن کە لێرەدا لێی کۆڵراوەتەوە لەو دەقەوە دێت کە بە کەهەنوتی پێی دەگوترێ نووسەرە کاهینەکان یان نووسەران کە بریتین لە میراتگرو شوێنگرەوەکانی حەزقیال پێغەمبەری سەردەمی پەراگەندەیی لە بابل لە سەدەی شەشی پێش زایین. زانراویشە کە ئەو کاهینانە هەردوو ڕیوایەتی خوڵقاندنی یەهوی و ئەلوهیمیان بە پێی ویست و خولیای تایبەتی خۆیان دووبارە نووسیوەتەوە و داڕشتۆتەوە کەوا بابە دیڤۆ لە بارەیەوە نووسیویەتی: شەقڵی (تەشریعی)یەکەی جەوهەری بوو.

لە کاتێکدا دەقی یەهوی کە بە چەند سەدەیەك پێش دەقی کەهەنوتی کەوتۆتەوە ئاماژە بە پشوودانی خودا ناکات کەوا لە کاری هەفتەیەکیدا ماندوو بووە بەڵام نووسەری کەهەنوتی دەیخاتە نێو گێڕانەوەکەیەوە. ئەو گێڕانەوەکەی بۆ چەند ڕۆژێك دابەش دەکات و، تەوەری گێڕانەوەکە دەخاتە سەر پشوودانی شەممە کە لە بەرامبەر ئیمانداران پاساوی بۆ دێنێتەوە بەوەی کە خودا یەکەم کەس بووە کە ڕێزی لێ گرتووە. لەو پێویستییە کردەییەوە ڕەخنەکردنی ڕیوایەتی خوڵقاندن بە لۆژیکییەکی ئاینیی دیار دەستی پێکرد ئەگەرچی ئەوە بە شێوەیەك بوو پێدراوەکانی زانست ڕێی پێ دەدەن بە وەهم وەسف بکرێت.

ڕیزکردنی قۆناغە یەك بە دوای یەکەکانی خوڵقاندن لە چوارچێوەی هەفتەیەکدا، ئەو ڕیزکردنەی کە نووسەری کەهەنوتی بە ئامانجی هاندانی گوێڕایەڵیکردنی ئاینی ویستویەتی، لە تێڕوانینی زانستییەوە بەرگری هەڵناگرێ. ئەوەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بە تەواوی زانراوە ئەوەیە کە شێوەگرتنی گەردوون

و زەوی بە چەند قۆناغێك بووە کە ماوەیەکی کاتیی دوورودرێژی خایاندووە کە پێدراوە نوێیەکان تەنانەت ڕێ بە دیاریکردنی ماوەکەی بە نزیکەییش نادەن..تەنانەت ئەگەر گێڕانەوەکە ئێوارەی ڕۆژی شەشەم تەواو دەبێت و هیچ ئاماژەیەکی بۆ ڕۆژی حەفتەم تێدا نییە، ئەو ڕۆژەی خودا تێیدا حەسایەوە، تەنانەت ئەگەر ڕێپێدراو بین هەروەکو بە نیسبەت گێڕانەوەی قورئان وایە، کە وا دابنێین کە مەبەستی فیعلی چەند ماوەیەکی دیارینەکراوە نەك ڕۆژانێك بە واتای ڕاستەقینە ئەوا هێشتا دەقە کەهەنوتییەکە قەبوڵکراو نییە چونکە بەدوایکداهاتنی ڕووداوەکان تێیدا پێچەوانەی زانیارییە زانستییە ڕەسەنەکانە.

کەواتە بەم جۆرە ڕیوایەتی کەهەنوتی بۆ خوڵقاندن وەکو بنیاتنانێکی خەیاڵیی داهێنراوە کە ئامانجی شتێکی ترە بێجگە لە ناساندنی حەقیقەت.

## گێڕانەوەی دووەم

گێڕانەوەی دووەمی خوڵقاندن کە لە بەشی (التکوین)دا هەیە و بە بێ گواستنەوە و لێدوان بە دوای ئەوەی پێشوودا دێت، ڕێ بە هەمان ڕەخنەکان نادات.

با ئەوە بڵێین کە ئەو گێڕانەوەیە کە بە نزیکەی سێ سەدە لەوەی یەکەم کۆنترە..گێڕانەوەیەکی زۆر کورتە بەڵام سەبارەت بە خوڵقاندنی مرۆڤ و بەهەشتی زەوی کە تایبەتە بە دروستکردنی زەوی و ئاسمان تێروتەسەلترە..ئەو ڕیوایەتە دەڵێت: ((ئەو کاتەی یەهوەی پەروەردگار زەوی و ئاسمانی دروست کرد هێشتا هیچ درەخت و گیایەك لە زەویدا نەڕوا بوون چونکە یەهوەی پەروەردگار هێشتا بارانی دانەباراندبووە سەر زەوی. مرۆڤیش زەوی نەکێڵا بوو بەڵام کانیاو لێی دەهاتە دەرێ و ڕووی ئاودێر دەکرد. ئەو کات یەهوە مرۆڤی لە قوڕی زەوی

دروست کردو لە لوتیەوە هەناسەی ژیانی فوو کرد ئیتر مرۆڤ بووە گیانێکی زیندوو)) الاصحاح٢ ئایەتەکانی ٤ بۆ ٧...

ئەوە ڕیوایەتی یەهوییە کە لە دەقەکانی کتێبەکانی پەیمانی کۆندا هەیە و ئێستا لەبەردەستمان دایە. ئەو ڕیوایەتە کە دواتر ڕیوایەتی کەهەنوتی بۆ زیادکرا ئایا هەر وا کورت بوو؟

هیچ کەسێك ناتوانێ بڵێت کە ئاخۆ دەقی یەهوی بە درێژایی سەردەمەکان پچڕاوەو، هیچ کەسێکیش نایکرێت بڵێت ئاخۆ ئەو دێڕە کەمانەی لەبەر دەستمان دایە هەموو ئەوەندەیە کە دەکرێ کۆنترین دەقی تەورات لەبارەی خوڵقاندنەوە لە خۆی گرتبێت. ئەو دەقە یەهوییە بە شێوەیەکی ڕوون و تایبەت ئاماژە بە دروستبوونی زەوی و ئاسمان ناکات. ئەو ئەوە بۆ تێگەیشتنێکی ناوەکی بەجێدێڵێ کەوا لە کاتی خوڵقاندنی مرۆڤ لە لایەن خوداوە ڕووەکی زەمینی نەبووە(هێشتا باران نەباریبوو)، ئەوە وێڕای ئەوەی ئاوی هاتوو لە قوڵایی زەوییەوە ڕووی زەوی دادەپۆشت..

پاشماوەی ئەم دەقە ئەوە تەئکید دەکاتەوە کە: خودا لە هەمان ئەو دەمەی مرۆڤی دروست کرد، باخێکیشی ڕوواند..بەم جۆرە جیهانی ڕووەك لە هەمان کاتی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی دەردەکەوێ، ئەمەش لە ڕووی زانستییەوە هەڵەیە: ئەو کاتەی مرۆڤ لەسەر زەوی دەرکەوت لەمێژبوو زەوی ڕووەکی تێدا ڕووا بوو ئەگەرچیش ئێمە ناتوانین بڵێین چەند ملیۆن ساڵێك لە نێوان ئەم دوو ڕووداوە تێپەڕیوە.

ئەوە تاکە لەبەریەك هەڵوەشاندنێکە کە بکرێ ئاراستەی دەقی یەهوی لەبارەی خوڵقاندنەوە بکرێ.

## مێژووی خوڵقاندنی جیهان و مێژووی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی

لەبەرئەوەی ساڵنامەی یەهودی بە سازان لەگەڵ پێدراوەکانی تەورات دامەزراوە بۆیە ئەم دوو مێژووە بە وردی دیاری دەکات: بەشی دووەم لە ساڵی ١٩٧٥ ی مەسیحی لەگەڵ سەرەتای ساڵی ٥٧٣٦ی خوڵقاندنی جیهان ڕێك دەکەوێ، کەواتە خوڵقاندنی مرۆڤ کە بە چەند ڕۆژێك دوای خوڵقاندنی زەوی دێت کۆنە بە هەمان ئەو کۆنییەی ساڵنامەی یەهودی بۆ خوڵقاندنی جیهان دەیژمێرێ.

لێرەدا بێگومان ڕاستکردنەوەیەك هەیە پێویستە بکرێت ئەوەش بە هۆی ژماردنی کات کە سەرەتا بە ساڵی مانگی حیساب دەکرا لە کاتێکدا ساڵنامەی ڕۆژئاوایی لەسەر بنەمای ساڵی خۆری دامەزراوە. بەڵام ئەم ڕاستکردنەوەیە کە دەگاتە ٣.٪ و ئەگەر زۆر بە وردیش بیکەین زۆر گرینگی نییە. تاوەکو حیساباتەکان ئاڵۆز نەکەین وا باشە وازی لێ بێنین. بۆ ئەوەی لە حەقیقەتەوە زیاتر نزیك بین با بڵێین خوڵقاندنی جیهان بە پێی ئەو خەمڵاندنە عیبرییە بە نزیکەیی بە ٣٧ سەدە پێش زایین دیاری دەکرێ.

زانستی نوێ چیمان فێردەکات..؟ وەڵامدانەوە سەبارەت بە پێکهاتنی بوونەوەر دژوارە. هەموو ئەوەی بکرێ ژمارە بکرێ بریتییە لە سەردەمی پێکهاتنی سیستەمی خۆر کە دەکرێ لە ڕووی کاتییەوە بە نزیکخستنەوەیەکی ڕەزامەندانە دیاری بکرێ. ئەو کاتەی لە پێکهاتنی سیستەمی خۆر جودامان دەکاتەوە بە چوار ملیار و نیو ساڵ دەخەملێنرێ..بەوە ئەو پەراوێزەی واقیعی چەسپاوی ئەمڕۆ لە پێدراوە دەرهێنراوەکانی تەورات جیا دەکاتەوە دەپێوین. ئەوەش لە توێژینەوەیەکی وردی دەقی تەورات هەڵدەقوڵێ. بەشی التکوین ئاماژەگەلی زۆر

ورد لەبارەی ماوەی نێوان ئادەم و ئیبراهیم دەدات بە دەستەوە. بەڵام سەبارەت بە ماوەی نێوان ئیبراهیم تاوەکو سەردەمی مەسیحی ئەوا زانیارییە دراوەکان تێرو تەواو نین. بۆیە دەبێ بە سەرچاوەی دیکە تەواو بکرێت.

## ١- لە ئادەمەوە بۆ ئیبراهیم

بەشی التکوین لەبارەی ڕەچەڵەکەکان لە ئیصحاحەکانی ٤ و ٥ و ١١ و ٢١ و ٢٥ پێدراوی زۆر ورد لەبارەی باوباپیرانی ئیبراهیم لە پشتی ڕاستەوخۆی ئادەمەوە دەدات بە دەستەوە، لەبەرئەوەی بەشی التکوین ماوەی ژیانی هەر یەکێکیان و تەمەنی باوك لە کاتی لەدایکبوونی کوڕدا دەدات بە دەستەوە بۆیە بە ئاسانی ڕێ دەدات بە دیاریکردنی مێژووەکانی لەدایکبوون و مردنی هەموو کەسێکی پێش ئادەم هەروەکو لەم خشتەیەی دادێ ڕوون کراوەتەوە.

ئەم خشتەیە بە پێی ئەو پێدراوانەی لە دەقی کەهەنوتی بەشی التکوین وەرگیراون ڕێك خراوە: ئەویش تاکە دەقە لە تەورات کە ئەو دیاریکردنانەی لەم جۆرە دەدات بە دەستەوە. لەویشەوە ئەوە دەردەهێنرێ کە ئیبراهیم هەروەکو تەورات دەڵێ لە ساڵی ١٩٤٨ی دوای ئادەم ڕووناکی بینیووە.

## ڕەچەڵەکەکانی ئیبراهیم

| | مێژووی لەدایکبوون پێش خوڵقاندنی ئادەم | ماوەی تەمەن | مێژووی مردن دوای خوڵقاندنی ئادەم |
|---|---|---|---|
| ئادەم | ... | ٩٣٠ | ٩٣٠ |
| شیت | ١٣٠ | ٩١٢ | ١٠٤٢ |
| ئەنوش | ٢٣٥ | ٩٠٥ | ١١٤٠ |
| قینان | ٣٢٥ | ٩١٠ | ١٢٣٥ |
| موهەلەئیل | ٣٩٥ | ٨٩٥ | ١٢٩٠ |
| یارد | ٤٦٠ | ٩٦٢ | ١٤٢٢ |
| ئەخنوخ | ٦٢٢ | ٣٦٥ | ٩٨٧ |
| مەتوشالح | ٦٨٧ | ٩٦٩ | ١٦٥٦ |
| لامك | ٨٧٤ | ٧٧٧ | ١٦٥١ |
| نوح | ١٠٥٦ | ٩٥٠ | ٢٠٠٦ |
| سام | ١٥٥٦ | ٦٠٠ | ٢١٥٦ |
| ئەرفەكشاد | ١٦٥٨ | ٤٣٨ | ٢٠٩٦ |
| شالح | ١٦٩٣ | ٤٣٣ | ٢١٢٢ |
| عابر | ١٧٢٣ | ٤٦٤ | ٢١٨٧ |
| فالج | ١٧٥٧ | ٢٣٩ | ١٩٩٦ |
| داعو | ١٧٨٧ | ٢٣٩ | ٢٠٢٦ |
| سروج | ١٨١٩ | ٢٣٠ | ٢٠٤٩ |
| ناحور | ١٨٤٩ | ١٤٨ | ١٩٩٧ |
| تارح | ١٨٧٨ | ٢٠٥ | ٢٠٨٣ |
| ئیبراهیم | ١٩٤٨ | ١٧٥ | ٢١٢٣ |

## ٢- لە ئیبراهیمەوە بۆ سەردەمی مەسیحی

لەبارەی ئەم ماوەیەوە تەورات هیچ زانیارییەکی وەها نادات بە دەستەوە کە سەر بکێشێ بۆ ساڵنامەگەلی ورد وەکو ئەوەی بەشی التکوین لەبارەی باووباپیرانی ئیبراهیم دەیدات بە دەستەوە، بۆ ئەوەی ماوەی نێوان ئیبراهیم و مەسیح بخەملێنین پێویستە سوود لە سەرچاوەی تر وەربگرین، ئێستا سەردەمی ئیبراهیم بە نزیکەی هەژدە سەدە پێش زایین و بە پەراوێزی هەڵەیەکی بچووک دیاری دەکرێ. ئەو پێدراوە پێکهاتووە لە ئاماژەکانی بەشی التکوین لەبارەی ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان ئیبراهیم و ئادەم سەردەکێشێ بۆ دیاریکردنی مێژووی ئەوەی دوایی بە ٣٨ سەدە پێش مەسیح. ئەوەش بێ هیچ مشتومڕێك خەملاندنێکی هەڵەیە. هەڵەکەشی لەو چەوت و چەوێڵییەوە دێت کە تەورات لەبارەی ماوەی نێوان ئادەم و ئیبراهیم لە خۆی گرتووە و کەلەپوری یەهودی هەمیشە بۆ دیاریکردنی ساڵنامەکەی پشتی پێ دەبەستێ. لە سەردەمی ئێستاماندا دەتوانین بەرهەڵستی پارێزەرە تەقلیدییەکانی حەقیقەتی تەورات بکەین بەوەی کە مەحاڵە پێدراوە تازەکانی ئێستا هاوڕێك بێت لەگەڵ ئەم خەملاندنە وەهمییانەی کاهینەکانی یەهود لە سەدەی شەشی پێش زایین کردوویانە، بۆ ماوەی سەدەگەلێکی دوورو درێژ ئەو خەملاندنانە وەکو بنەمایەك بۆ دیاریکردنی ڕووداوەکانی سەردەمی کۆن بە نیسبەت مەسیحەوە بەکارهێنراوە.

کتێبەکانی تەورات کە پێش سەردەمی نوێ بڵاو دەکرانەوە، لە پێشەکییەکی ڕوونکردنەوەییدا لیستێکی سەبارەت بە مێژووی ئەو ڕووداوانەی لەوەتەی خوڵقاندنی جیهانەوە تاوەکو سەردەمی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبانە ڕووی داوە، پێشکەشی خوێنەرانی دەکرد. کاتێ سەردەمی نوێ هات لە توانای بڵاوکاردا نەما

ئەم لیستە وەهمییانە بهێڵێتەوە کە پێچەوانە بوون لەگەڵ دۆزراوە زانستییەکان کە مێژووی خوڵقاندنیان بە سەردەمێکی زۆر زووتر دیاری کردووە، کەواتە تەنها بە سڕینەوەی ئەو خشتە و پێشەکییانە وازی هێنا، بڵاوکارەکان خۆیان پاراست لە ئاگادارکردنەوەی خوێنەر بە هەڵەی دەقەکانی تەورات کە پێشتر بۆ نووسینەوەی ئەو لیستە مێژووییانە پشتی پێ دەبەسترا و ئێستا لە تواناادا نەماوە وای دابنرێ کە گوزارشت لە حەقیقەت دەکات. وایان بە باش زانی تویژاڵێك لە شەرم و حەیای بەسەردا بدەن و چەند دارشتەیەکی دیالیکتیکی زانایانەی بۆ بدۆزنەوە تاوەکو دەقەکە وەکو خۆی بەر لە هیچ سڕینەوەیەك قەبوڵ بکرێ. بۆیە دەبینی لیستەکانی ڕەچەڵەکەکانی دەقی کەهەنوتی تەورات هەمیشە لە سەرەتادایە، لە کاتێکدا لە سەدەی بیستەمدا چیتر مەعقول نەماوە کات بە پشتبەستن بەو وەهمە حیساب بکرێ.

بەڵام ئەوەی تایبەتە بە مێژووی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی، پێدراوە زانستییە نوێیەکان ڕێ دەدەن بەوەی تەنها بە دوورتر لە ڕادەی ناورد پێناسەی بکەین. دەتوانین قەناعەت بکەین بەوەی کە مرۆڤ بە توانای زیرەکی و کارکردنی خۆی کە وا دەکات لە بوونەوەرەکانی تر جیاواز بێت لەسەر زەویدا بوونی هەبووە بەڵام هیچ کەس ناتوانێت بە شێوەیەکی ورد مێژووی دەرکەوتنی دیاری بکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ ئەمڕۆ بوونی پاشماوەی کۆنی مرۆڤایەتییەکی بیرکەرەوە و کارا تەئکید بکەینەوە کە کۆنییان بە یەکەگەلێك کە لە دەیان هەزار ساڵ پێکهاتووە حیساب دەکرێ.

ئەو مێژووە نزیکەییە دەگەڕێتەوە سەر نموونەی مرۆڤێکی پێش مێژوو کە بە نزیکترین نموونەی جۆری (neo-anthropiens) (مرۆڤی کرۆمانیون -cro

magnon) دادەنرێ. بێگومـان هەنـدێ دۆزینـەوەی تـری پاشماوەکـان لـە چـەند ناوچەیەکی جیاجیای زەویدا هەیە کە وا پێدەچێ مرۆیی بـن و تایبەتـە بـە جـۆری کەمتر پێشکەوتوو paleo-anthropiens..قەبارەی کۆنییەکەی بە سـەدان هـەزار ساڵ دادەنرێ بەڵام ئایا بە ڕاستی مرۆڤی ڕاستەقینەن؟

بە هەر حاڵ ئەوەی پەیوەستە بە(neo-anthropiens) پێدراوەکان بە شێوەی پێویست وردن، ئەوەش ڕێ دەدات بەوەی زۆر دوورتـر لـەو سـەردەمەیان دابنـێین کـە بەشـی التکـوین بـۆ مرۆڤـە یەکەمـەکان دیـاری دەکـات، کەواتـە لێـرەدا ئەستەمبوونی ڕێککەوتنی نێوان پێدراوە حیسابییەکانی بەشی التکوینی تایبەت بە دەرکـەوتنی مـرۆڤ لەسـەر زەوی و زۆربـەی زانیارییـە بناغـە داکوتاوەکـانی سەردەمەکەمان ڕوون و ئاشکرایە.

## لافاوەکە

ئیصـحاحەکانی ٦ و ٧ و ٨ لـە بەشـی التکوین تـەرخان کراوە بـۆ گێڕانـەوەی لافاوەکە. بە شێوەیەکی وردتر دوو گێڕانـەوە هەیـە بـەڵام بـە تەنیشـت یـەکترەوە دانەنراون بەڵکو لە یەکتر جودان و لە چەند بڕگەیەکی بەناویەکداچووی یەکترن. لە حەقیقەتدا لەو سێ ئیصحاحە ناسازی و دژایەتی زەق هەیە، لێرەدا ئەو نـاکۆکی و ناسازییانە بە بوونی دوو سەرچاوەی جیاواز لێکدەدرێتەوە: سەرچـاوەی یـەهوی و سەرچاوەی کەهەنوتی.

لـە پێشـتردا بینیمـان کـە ئـەو سەرچـاوەیە کۆکراوەیـەکی لێکجـودا و دابـڕاو پێکدێنن. هەموو دەقێکی بنەڕەتی بۆ چەند بڕگـە یـان دەسـتەواژە پارچـە پارچـە

کراوە ئەوەش لەگەڵ بەدوای یەکداهاتنی ڕەگەزەکانی هەر سەرچاوەیەك لەگەڵ ڕەگەزەکانی سەرچاوەکەی تر، بە جۆرێك لە گێڕانەوەیەکدا ئێمە لە میانەی نزیکەی سەت دێڕدا حەڤدە جار لە سەرچاوەیەکەوە دەچینە سەرچاوەیەکی تر.

گێڕانەوەکە بە شێوەیەکی گشتی بەم جۆرەیە:

کاتێ خراپەو گەندەڵی مرۆڤەکان تەنییەوە و زۆر بوو خودا بڕیاری دا لەگەڵ سەرجەم بوونەوەرە زیندووەکانی تر لەناویان ببات، بۆیە نوحی ئاگادار کردەوە و فەرمانی دروستکردنی ئەو کەشتییەی پێدا کە خۆی و هاوسەرەکەی و سێ کوڕەکەی بە هاوسەرەکانیانەوە و چەند بوونەوەرێکی تری زیندوو دەچنە نێویەوە، سەبارەت بە بوونەوەرە زیندووەکان دوو سەرچاوەکە جیاوازن: بڕگەیەکی ڕیوایەتێکی (کەهەنوتی) ئاماژە بەوە دەکات کە نوح لە هەر جۆرێك جووتێکی بردووە، پاشان بڕگەیەکی دواتر کە (یەهوی)یە ئەوە دیاری دەکات کە خودا فەرمانی کردووە بە بردنی حەوت دانە لە هەموو جۆرێك بە نێرو مێیەوە لەو گیانلەبەرانەی بە پاك ناودەبرێن و، هەڵگرتنی جووتێکیش لەوانەی بە ناپاك ناودەبرێن. بەڵام دوای ئەوە دیاری دەکرێ کە نوح بە فیعلی تەنها جووتێك لە هەر جۆرێکی گیانلەبەرەکان دەباتە نێو کەشتییەکەوە. پسپۆڕانی وەکو بابە دیڤۆ جەخت لەوە دەکاتەوە کە مەبەست لێرە بڕگەیەکی هەموارکراوە لە ڕیوایەتی یەهوی.

بڕگەیەکیش هەیە(کە یەهوییە) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هۆکاری لافاوەکە ئاوی باران بووە و بەڵام بڕگەیەکی تر هەیە (کە کەهەنوتییە) دەڵێ: هۆکاری لافاوەکە ئاوی باران و کانیاوی زەوی بووە.

ئاو هەموو زەوی تا ترۆپکی چیاکانی داپۆشی و هەموو ژیان تێیدا وێران بوو، دوای ساڵێك دوای نەمانی لافاوەکە کەشتییەکە لەسەر چیای ئاراڕات لەنگەری گرت و نوح هاتە دەرێ.

با ئەوەش زیاد بکەین کە لافاوەکە بە ئەم دەقانە دوو ماوەی جیاوازی هەیە: ڕیوایەتی یەهوی دەڵێ: چل ڕۆژ لافاو بووە، لە کاتێکدا ڕیوایەتی کەهەنوتی دەڵێ: سەت و پەنجا ڕۆژ بووە. ڕیوایەتی یەهوی مێژووی ڕوودانی ئەم ڕووداوە لە ژیانی نوحدا دیاری ناکات بەڵام ڕیوایەتی کەهەنوتی بەوە دیاری دەکات کاتێ تەمەنی نوح ٦٠٠ ساڵ بووە...هەر بە پێی هەمان ڕیوایەت دەبێ ئەم ڕووداوە ١٦٥٦ ساڵ دوای خوڵقاندنی ئادەم ڕوویدا بێت.

بەڵام هەروەکو بەشی التکوین دەڵێ، ئەو لافاوە هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی گرتۆتەوەو هەموو ئەو بوونەوەرە زیندووانەی خودا خوڵقاندونی لەسەر زەوی لەناوچوون. ئەگەر بەم جۆرە بێت دەبێ مرۆڤایەتی لە دەسپێکردنی کوڕەکانی نوح و هاوسەرەکانیانەوە خۆی دروست کردبێتەوە بە جۆرێك کاتێ سێ سەدە دوای ئەوە پێغەمبەر ئیبراهیم لە دایك دەبێت دەبینێت مرۆڤایەتی خۆی لە چەند کۆمەڵگایەکدا دروست کردۆتەوە. چۆن دەکرێ لە ماوەیەکی ئاوا کەمدا ئەو دووبارە دروستکردنەوەیە ڕووبدات؟ ئەو تێبینییە سادەیە هەر مەعقوڵییەتێك لە دەقەکە دادەڕنێت.

لەمە زیاتر، پێدراوە مێژووییەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ئەستەمە ئەم ڕیوایەتە لەگەڵ زانیارییە نوێیەکان ڕێك بکەوێت. لە ڕاستیدا سەردەمی ئیبراهیم بە نزیکەیی بە ساڵانی ١٨٥٠–١٨٠٠ پێش زایین دیاری دەکرێ. ئەگەر لافاوەکە سێ سەدە بەر

لە ئیبراهیم ڕوویدا بێت هەروەکو بەشی التکوین لە باسی ڕەچەڵەکەکان ئامـاژەی پێ دەکات ئەوا لافاوەکە دەکەوێتە سەدەی ٢١ و ٢٢ی پێش زایـین. ئـەوەش ئـەو سـەردەمەیە کـە لـە پێشـیدا لـە چـەندان ناوچـەی سـەر ڕووی زەوی شارسـتانێتی مرۆیـی دروسـت بـووە کـە شـوێنەوارەکانی بـۆ نـەوەکانی دواتـر گوازراوەتـەوە: زانیارییە مێژووییەکان ڕێ بە تەئکیدکردنەوەی ئەمە دەدات.

بـۆ نموونـە، ئـەو ماوەیـە بـە نیسـبەت میسـرەوە دەکەوێتـە پـێش دەوڵـەتی ناوەند(٢١٠٠ پ.ز)، ئەوەش بە نزیکەیی مێژووی ماوەی ناوەنـدی یەکەمـە بـەر لـە خانەوادەی یازدەم. لە بابلیش خانەوادەی ئوری سێیەم. بـاش زانراویشـە کـە لـەو شارستانێتییانە هیچ پچڕانێك ڕووی نـەداوە، کەواتـە هـیچ لەناوچـوونێکی گشـتیی مرۆڤایەتی ڕووی نەداوە هەروەکو تەورات دەڵێت.

ئیتر ناکرێ وەها دابنرێ کە ئەو سێ ڕیوایەتەی تەورات شتگەلێك بۆ مرۆڤ بـاس دەکەن کە لەگەڵ حەقیقەت ڕێك و تەبا بێـت. ئەگـەر بمانـەوێ بابـەتی بـین دەبـێ ئەوە قەبووڵ بکەین کە ئەو دەقانـەی پێمـان گەیشـتوون گوزارشـت لـە حەقیقـەت ناکەن. ئایا خودا شتێکی ناحەقیقی ناردۆتە خوارەوە؟ لـە ڕاسـتیدا نـاکرێ وێنـای بیرۆکەی خودایەك بکرێ کە خەڵك فێردەکات بە وەهم و خەیاڵ باوەڕ بکەن، بەڵکو بە وەهمی دژ بە یەك. سروشتییە ئەوە گریمانـەی بـوونی دەسـکاریکردن بـە هـۆی مرۆڤەوە بوروژێنێ..یان لەو قسانەی دەماودەم لە نەوەیەکـەوە بـۆ نەوەیـەکی تـر گوازراوەتـەوە یـان لـەو دەقانـەی دوای دیـاریکردنی ئـەو وتـە وەرگیراوانـە..کـاتێ دەزانین کە دانراوێکی وەکو وەکو (سفر التکوین) بە لای کەمییەوە لە ماوەی سـێ سەدەدا دوو جار هەموار کراوە چۆن سەرسام دەبـین کـاتێ شـتگەلێکی نامـەعقوڵ یان ڕیوایەتگەلێك تێیدا دەبینین کە ئەستەمە لەگەڵ واقیعی شتەکان ڕێك بێتـەوە،

لەوەتەی پێشکەوتنی زانیارییەکانی مرۆڤ ڕێی داوە ئەگەر بە زانینی هەموو شتێکیش نەبێت بە لای کەمەوە بە هەبوونی زانیاری پێویست لەبارەی هەندێ لە ڕووداوەکان ئەوا ڕێ دەدات بە بڕیاردان لەسەر پلەی تەبابوونی ئەو ڕیوایەتە کۆنانە لەگەڵ ئەو زانیارییە، کەواتە چ شتێك لەوە زیاتر لۆژیکییە لە وازهێنان بەو لێکدانەوەیە بۆ هەڵەکانی دەقەکانی تەورات، ئەوەی کە مرۆڤ دەکاتە بابەتی مشتومڕ..؟ ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە هەموو لێکدەرەوە مەسیحی یان یەهودییەکان ئەو لێکدانەوەیە وەرنەگرن..لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەڵگانەی دەیهێننەوە شیاوی ئاوڕ لێدانەوەیە.

## هەڵوێستی نووسەرە مەسیحییەکان بەرانبەر هەڵە زانستییەکان لە دەقەکانی پەیمانی کۆن و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەییانە لەبارەیەوە

هەمەچەشنی کاردانەوەی قسەکەرە مەسیحییەکان بەرامبەر ئەو بڕە کەڵەکەبووە لە هەڵەو ناسازی و بابەتی نامەعقوڵ بەڕاستی مایەی سەرسوڕمانە ! ! هەندێکیان هەندێ هەڵە قەبوڵ دەکات و لەوەی دەینووسێ دوودڵ نییە لە ڕووبەڕو بوونەوەی بابەتە ئاڵۆزەکان.هەندێکی تریش بە سوکەڵەیی چاو دەپۆشن لە بانگەشە ناپەسندەکان و وشە بە وشە بەرگری لە دەقەکە دەکات و هەوڵ دەدات لە ڕێی لێدوانی ستایشانە قەناعەت دروست بکات، لەوەشدا چەند بەڵگەیەك دەهێنێتەوە کە زۆربەی کات چاوەڕوانکراو نییە، بەوەش هیوادارە توێژاڵێك لە فەرامۆشکردن بخاتە سەر ئەوەی لۆژیك ڕەتی دەکاتەوە.

باوکە دیڤۆ لە پێشەکیی وەرگێڕانی (سفر التكوين) ئەم جۆرە ڕەخنەگرتنانە قەبووڵ دەکات، بەڵکو تەنانەت زۆر باسی گرینگییەکەی دەکات، بەڵام بە ڕای ئەو دووبارە بنیاتنانەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو هیچ گرینگییەکی نییە. لە تێبینییەکانیدا دەڵێ: ئەگەر تەورات بە ((یادەوەرییەکانی یەك لافاوی وێرانکەر — یان زیاتر لە یەکێك — کە لە دۆڵی دیجلەو فورات ڕووی داوە دەستی پێکردووەو ئەگەریش کەلەپور ڕەهەندەکانی کارەساتە جیهانییەکەی زل کردووە)) ئەوا ئەمە هیچ گرینگ نییە، ((بەڵکو ناوەڕۆکی مەسەلەکە ئەوەیە کە نووسەری ئایینی ڕێنمایی ئەزەلی لەبارەی دادپەروەریی و بەزەیی خودا و پیسی مرۆڤ و ڕزگاربوونی بەخشراو بە دادپەروەری خستۆتە ئەستۆی ئەو یادەوەرییەوە)).

بەمەش پاساو دێنێتەوە بۆ گۆڕانی ئەفسانەیەکی میللی بۆ ڕووداوێکی خوایی — بۆ ئەوەی دوای ئەوە عەرزی سەر ئیمانی مرۆڤ بکرێت — ئەمەش سەرەتا لەو ساتەوە دەکرێت کە تێیدا نووسەرێکی ئەفسانەیەك وەکو وێناندنێکی وانەیەکی ئایینی بەکاری دێنێ. ئەم هەڵوێستە ستایشکارانەیە هەموو ستەم و لادانەکانی مرۆڤ ئەوەی پەیوەستە بە بابەتە خواییەکان پاساو دەدات و دەسکاریکردنەکانی مرۆڤ بۆ دانانی دەقەکانی تەورات داداپۆشێ، هەر دەسکاریکردنێك ڕەوایە ماتوڵ ئامانجێکی ئایینی هەبێت..

نووسەرەکانی سەدەی شەشەم(کەهەنوتییەکان) بەم شێوەیە دەسکاریکردنەکان پاساو دەدەن کە بووە هۆی ئەو ڕیوایەتە وەهمییانەی دەیانزانین..

ژمارەیەکی زۆر لە قسەکەرە مەسیحییەکان وا دەبینن کە وەها شیاوە هەڵەو شتە نامەعقوڵ و ناسازییەکانی گێڕانەوەکانی تەورات ڕاڤە بکەن، ئەویش بە پێشکەشکردنی ئەو پۆزشەی کە دەڵێ: نووسەرەوەکانی تەورات لە پێشکەشکردنی لێدوانگەلێك کە پەیوەستە بە فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی کولتورێك یان عەقلییەتێکی جیاواز بەهانەدراون(مەعزورن)،ئەوەش سەری کێشا بۆ ناساندنی ((جۆرە ئەدەبییە))تایبەتەکان. ئەو کات خستنە ناوەوەی ئەو گوزارشتە لە جەدەلییەتی وردی قسەکەرەکان هەموو دژوارییەکان دادەپۆشێ. ئەو کات ڕوونکردنەوەی هەر ناسازییەکی نێوان دوو دەق دەکەوێتە جیاوازیی نێوان میتۆدی هەر نووسەرێك لە گوزارشتکردن و لە ((میتۆدی ئەدەبی تایبەت)) بە خۆی، بێگومان لای هەمووان پەسند نییە، بە ڕاستی جیدییەتی تێدا نییە، وێڕای ئەوەش هێشتا بەتەواوی لە سەردەمی ئێمەدا نەچۆتە تاریکایی بیرچوونەوە، دواتر

دەبینین کە بە نیسبەت پەیمانی نوێشەوە (ئینجیل) چۆن هەندێك هەوڵ دەدەن بەزۆر ناسازییە زەقەکانی ئینجیلەکان ڕاڤە بکەن.

لێرەدا میتۆدێکی تریش هەیە بۆ قەناعەتپێکردنی خەڵك بەوەی لۆژیك ڕەتی دەکاتەوە کە ئەگەر بەسەر بابەتێکی ململانێ لەسەر پیادە کرا، ئەویش دەوردانی دەقەکەیە بە چەند ئیعتیباراتێکی ستایشکارانە. بەوەش سەرنجی خوێنەر لە گرفتە بنەڕەتییە تایبەت بە ڕاستیی ڕیوایەتەکە لادەدات تا ڕوو بکاتە گرفتی تر.

تێڕامانەکانی کاردینال دانیلۆ لەبارەی لافاوەکەوە کە لە گۆڤاری ( Dieu Vivantخوای زیندوو) بە ناونیشانی (لافاوەکەو لەئاوهەڵکێشان و ، حوکم) دەرکەوت سەر بەو میتۆدەی گوزارشتکردنە، دەڵێ: ((نەریتی کۆنی کلێسا لە لاهوتییەتی لافاوەکە وێنەی مەسیح و کلێسا دەبینێ)) ئەو ((ڕووداوێکی خاوەن واتای مەزنە))و ((حوکمێکە دەکەوێتە سەر سەرجەم مرۆڤایەتی)). کاردینال باوریگین لە ئامۆژگارییەکانی لە ئیزکیال باس لە نقومبوونی هەموو جیهان و ڕزگاربوونی کەشتییەکە دەکات ((دوای ئەوە باس لە بەهای ژمارە ٨ دەکات)) کە گوزارشتە لە ژمارەی ئەو کەسانەی کەشتییەکە ڕزگاری کردن: (نوح و هاوسەرەکەی و سێ کوڕەکەی و سێ هاوسەرەکانیان). ئەو پاڵپشتی لەوە دەکات کە جوستین لە کتێبی (دیالۆگ) نووسیویەتی: ((ئەوان هێمای ڕۆژی هەشتەمیان پێ بەخشرا ئەو ڕۆژەی مەسیحمان لە نێو مردواندا بە نێردراوی دەرکەوت)). هەروەها نووسیویەتی: ((نوح یەکەم لەدایکبووی خەڵقی نوێیە، ئەو وێنەی ئەو مەسیحەیە کە نموونەی نوحی هێنایەدی))(ئەوها)). ئەو درێژە دەدات بە بەراوردی نێوان نوح لە لایەك کە داری کەشتی و ئاو کە وای لێکرد بکەوێتە سەر

ئـاو و ئـاوی بـەگاورکردن لەلایـەکی تـرەوە {((ئـاوی لافاوەکـە کـە جـارێکی تـر مرۆڤایەتی لێیەوە لەدایك بوو))} و داری خاچ..ئـەو جـەخت دەکاتـەوە لـە بـەهای ئـەم ڕەمزییەتـە و ((دەوڵەمەنـدیی ڕۆحـی و عەقیـدەیی نهێنیـی لافاوەکـە)) (ئەوها..؟).

ئەم لێکنزیکردنەوە ستایشکارانەیە قسەی زۆر هەڵدەگرێ. پێویستە جارێکی بیلێینەوە کە ئەو قسە لەسەر ڕووداوێك دەکات کە بەرگری لێ کردنی لەسەر ئاستی جیهان و لەو سەردەمەی تەوراتی دەکەوێتە ناوەوە، ئەستەمە. لەگەڵ لێدوانێکی وەکو لێدوانی کاردینال دانیلۆ دەگەڕێینەوە پاش بۆ سەدەکانی ناوەڕاست کە ئەو کات دەق وەکو خۆی پەسند دەکرا و ئەو کات لێکۆڵینەوەی ناتەقلیدی شوێنێکی بۆ نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی مایەی هاندانە ئەوەیە تێبینی دەکەین ماوەی پێش سەردەمی تاریکیی سەپێنراو چەند بیریارێکی بەخۆوە بینی کە هەڵوێستی لۆژیکیان هەبوو وەکو قەدیس ئۆگەستین کە لە بیرکردنەوەدا میتۆدێك دەگرێتەبەر کە بە شێوەیەکی تاقانە پێش سەردەمەکەی خۆی دەکەوێتەوە.

بێگومان سەردەمی باوانی کلێسا هەندێ گرفتی تایبەت بە ڕەخنەی دەقەکان هەبووە کەوا قەدیس ئۆگەستین لە وتاری ژمارە (٨٢) لەبارەی یەکێکیانەوە دەدوێ، برگەی دادێ لە هەموو برگەکانی ئەم وتارە دیارترە:

((دانراوەکانی کتێبە پیرۆزەکان بریتین لەوانەی کە بە یاسایی دەناسرێن و تەنها ئەوانەن کە من سەرنجیان دەدەمێ و ڕێزیان دەگرم ئەوەش وەکو بڕوایەکی تەواو بەوەی کە هیچ نووسەرێکیان هەڵەی نەکردووە. کاتێ لەم کتێبانە شتێك دەبینم کە گوایە دژی ڕاستییە ئەوا ئەو کات من گومانم نییە لەوەی کە دەقی

(نوسخەکەم) هەڵەی تێدا نییە یان ئەوەتا وەرگێڕەکە دەقە ئەسڵییەکەی بە شێوەیەکی ڕاست وەرنەگێڕاوە یان توانای تێگەیشتنی من لاوازە)).

کەواتە بە لای قەدیس ئۆگەستینەوە ماقوڵ نییە دەقێکی پیرۆز هەڵەیەکی تێدا بێت. قەدیس ئۆگەستین بەوپەڕی ڕوونییەوە عەقیدەی (پارێزراوی لە هەڵە)ی دەزانی، لە بەرامبەر برگەیەکدا کە پێچەوانەی حەقیقەت دەردەکەوت ئەو بەدوای هۆکارێك دەگەڕا و بە دووری نەدەزانی هۆکاری ئەو هەڵەیە هۆکارێکی مرۆیی بێت، ئەمەش هەڵوێستی ئیماندارێکە کە هەستی ڕەخنەگرانەی هەبێت، لە سەردەمی قەدیس ئۆگەستین توانا نەبوو بۆ پێککگرتنی دەقێکی تەورات بە زانست. تێڕوانینێکی فراوانی هاوشێوەی تێڕوانینی ئەو بێگومان ڕێ دەدات بە تەختکردنی زۆرێك لەو دژوارییانەی ئەمڕۆ لە کاتی بەرامبەرکردنی هەندێ دەقی تەورات بە زانیارییە زانستییەکان دەورووژێنرێ.

بە پێچەوانەی ئەوەوە پسپۆڕەکانی سەردەمی ئێمە کۆشش دەکەن بۆ بەرگری کردن لە تەورات لە بەرامبەر هەر تۆمەتبارکردنێك بە هەڵە. باوکە دیڤۆ لە پێشەکییەکەی بۆ (سفر التكوين) ئەو هۆکارانە دەخاتەڕوو کە وا دەکات بەرگری لە دەق بکرێ بە هەر نرخێك بێت تەنانەت ئەگەر ڕوونیش کە لە ڕووی مێژوویی یان زانستییەوە قەبووڵکراوە نییە، ئەو داوامان لێ دەکات لە تەوراتەوە تەماشای مێژوو نەکەین ((بەپێی بنەماکانی جۆری مێژوویی کە نوێخوازەکان ممارەسەی دەکەن)). بۆ نووسینەوەی مێژوو زیاتر لە میتۆدێك هەیە. مێژوو کاتێ بە شێوەیەکی نادروست دەگێڕدرێتەوە دەبێتە ڕیوایەتێکی مێژوویی و ئەمەش هەمووان پەسندی دەکەن، بەڵام لێرەدا مێژوو ملکەچی بنەما ناسراوەکان نابێت کە لە تێگەیشتنی ئێمەوە هەڵدەقوڵێن. قسەکەر لەسەر تەورات هەر پشکنینێك

ڕەت دەکاتـەوە کـە جیۆلۆجیـا و پێـدراوە تایبەتـەکانی بـەر لـە مێـژوو لەسـەر ڕیواتەکانی تەوراتی بکەن. تەورات هەروەکو باوکە دیڤۆ دەڵێت: سەر بە هـیچ کـام لەو لێکۆڵینەوە زانستییانە نییە، ئەگەر بمانەوێ لەگـەڵ ئـەو پێدراوانـە بەرامبـەری بکەین ئەوا ناگەینە هیچ ئـەنجامێك مەگـەر هاودژییـەکی ناحـەقیقی یـان سـازانێکی دروسـتکراو)). پێویسـتە تێبینـی بکـەین کـە ئـەم تێڕامانانـە دانـەر خسـتوویەتیە بەرامبەر ئەو پێدراوە زانستییانەی بە هیچ جۆرێك لەگەڵ سفر التکوین بە تایبـەتی یازدە ئیصحاحەکەی یەکەم ڕێك ناکەوێ. بەڵام ئەگەر هەنـدێك ڕیوایـەت هـەبێ کـە ئەمڕۆ توانرا بێت لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کرابێت بەتایبەتی هەندێ لەو ڕووداوانـەی لە سەردەمی باوانی یەکەم ڕوویان داوە ئەوا نووسەر بۆ پاڵپشتی تەورات پێویستی بـە شـایەتی هێنانـەوە بـە زانیارییـە نوێیـەکان نییـە. باوکـە دیڤـۆ دەڵـێ: ((ئـەو گومانانەی لەبارەی ئەو ڕیوایەتانە هەیە پێویستە شـوێن چـۆل بکـات لـە بەرامبـەر شایەتی پاڵپشتیکەر کە مێژوو یان شوێنەوارزانی ڕۆژهەڵاتییەکان دەیهێنێت)). بـە واتایەکی تر: ئەگەر زانست لە جەختکردنەوەی ڕیوایەتی تەورات سـوودبەخش بـوو ئەوا قەیناکا، بەڵام ئەگەر ڕەتی کردەوە ئەوا گەڕانەوە بۆی قەبووڵکراو نییە.

بۆ سازاندنی نێوان ئەوەی سازان قەبووڵ ناکات، واتە سازاندن لە نێوان تیـۆری حەقیقەت لە تەورات و مۆرکی ناڕاستی هەندێ ڕووداو کە لە ڕیوایەتەکانی پـەیمانی کۆندا هاتووە، زانایانی هاوچەرخی لاهوت کۆشاون بـۆ پێداچـوونەوەی تێگەیشـتنە کلاسیکییەکانی حەقیقـەت. بـەڵام لـە چوارچـێوەی ئـەم کتێبـەدا ئەگـەر بەدرێـژی باسی ئەو ئیعتیباراتـە وردانـەمان کـرد کـە چـەندان دانـراو بـاس لـە حەقیقـەت لـە تـەورات دەکـەن وەکـو لێکۆڵینـەوەی (ئـۆ.لـۆرتز — ١٩٧٢) بـە ناونیشـانی

(حەقیقەتی تەورات چییە؟)، پێویستە تەنها ئاماژە بەو حوکمە تایبەتە بە زانست بکەین:

دانەر تێبینی ئەوە دەکات کە کۆڕی مەسکونی ڤاتیکانی دووەم ((هۆشداری داوە لە دانانی هەر بنەمایەك بۆ جیاکردنەوەی هەڵە و حەقیقەت لە تەورات. چەند ئیعتیباراتێکی بنەڕەتی هەیە ئاماژە بە ئەستەمبوونی ئەمە دەکات، کلێسا ناتوانێ بڕیارێك سەبارەت بە ڕاستی یان ساختەیی ڕێبازە زانستییەکان بدات کە دەتوانن بە شێوەیەکی مەبدەئی و بە گشتی گرفتی حەقیقەتی کتێبی پیرۆز چارەسەر بکەن)).

ڕوونیش کە کلێسا ناتوانێ حوکمێك لەبارەی بەهای ڕێبازێکی زانستی بدات وەکو ئامرازێك بۆ گەیشتن بە زانیاری. مەبەست لێرە شتێکی ترە. مەبەست مشتومڕ لەبارەی تیۆرەکان نییە بەڵکو گفتوگۆی بابەتە نەگۆڕەکان مەبەستە.ئایا لە سەردەمی ئێستادا مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە ببێتە پاپایەکی مەزن تا بزانێ ٣٧ یان ٣٨ سەدە لەمەوبەر هێشتا جیهان نەخولقێنرا بوو و مرۆڤیش لەسەر زەوی دەرنەکەوتبوو، ئەو ڕاپۆرتە هەڵگۆڕراوە لە ڕەچەڵەکەکانی ناو تەورات بەبێ سەرچڵیکردن بە کەوتنە نێو هەڵەوە دەکرێ جەخت لە هەڵەبوونی بکرێتەوە..؟نووسەری باسکراوی ئێرە ناتوانێ خۆ لەمە گێل بکات. بانگەشەکردنی لەبارەی زانستەوە هیچ ئامانجێکی نییە جگە لە بەلاڕێدابردنی گرفتەکە تاوەکو چارەسەری نەکات کە لەسەری پێویستە وا بکات.

باسکردنی هەموو ئەم هەڵوێستانەی نووسەرە مەسیحییەکان بەرامبەر هەڵە زانستییەکانی دەقەکانی تەورات وەریانگرتووە تەنگاوبوونی ئەمان و ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە ئەستەمە هەڵوێستێکی تری لۆژیکی وەربگیرێت جگە لەوەی دان بە

ئەسڵی مرۆڤیبوونی ئەو هەڵانەدا دەنێ و ئەستەمیشە ئەمانە وەکو بەشێکی کتێبی خودا قەبوڵ بکرێ.

ئەم تەنگاوبوونەی یەخەی ناوەندە مەسیحییەکان دەگرێ کە پەیوەندی بە تەوراتەوە هەیە لەبارەیەوە لە کۆڕی مەسکونی ڤاتیکانی دووەم (١٩٦٢ — ١٩٦٥) بڵاوکراوەیەك دەرچوو کە تێیدا دان بە هەندێ هەڵەدا دەنێ و لەلایەن خۆیەوە ئوسقوف فیبەر لە پێشەکی بەڵگەنامەی مەسکونی چوارەم لەبارەی تەوراتەوە ئەو ڕەوشە بە بەئازار وەسف دەکات.

لێرەدا لەم بەڵگەنامە تایبەتە بە تەورات (بەشی چوارەم لاپەڕە ٥٣) ئاماژە بە هەندێ کەموکوڕی و پوچی هەندێ دەق دەکات بە شێوەیەك کە هیچ بەرهەڵستییەك قەبووڵ ناکات، دەڵێ:

((بە ڕوانین بۆ ڕەوشی مرۆیی پێشوو لەسەر ئەو ڕزگاربوونەی مەسیح داینـاوە، بەشەکانی تەورات ڕێ بە هەمووان دەدات بزانن خودا کێیەو مرۆڤ کێیە کە کەمتر نەبێ لە زانینی ئەو ڕێگایەی خودا بە بەزەیی و دادپەروەری خۆی لەگەڵ مرۆڤی دەکات بەڵام ئەم کتێبانە هەندێ خەوش و شتێك لە پوچی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا شایەتییەکی لەبارەی فێربوونی خودایی تێدایە)).

کەواتە لێرەدا جوانتر لە هەردوو وشەی (خەوش) و (پوچی) نییە کە بەسەر هەندێ دەقدا دەسەپێ کە ڕێی تێدەچێ ڕەخنەی لێ بگیرێ بەڵکو پشتی تێ بکرێ و، پرەنسیپێکی ئاواش بە شێوەیەکی ڕوون پەسندکراوە.

ئەم دەقە بەشێکە لە لێدوانێکی گشتگیر کە بە زۆرینەی (٢٣٤٤) دەنگ و دژایەتی تەنها ٦ دەنگ دەنگی بۆ دراوە، وا دیارە کە ئەو لێدوانە بە هەوەنتە ئەو

زۆرینە یەکلاکەرەوەی نەهێناوە. لە واقیعدا ئێمە لە لێدوانەکانی ئەو بەڵگەنامە ڕەسمییەی ئوسقوف فیبەر وازۆی کردووە ڕستەیەک دەبینین کە بە شێوەیەکی ڕوون بانگەشەی پوچی هەندێ دەق کە لە ڕاگەیاندنی ڕەسمی کۆڕدا هەیە ڕاست دەکاتەوە، دەڵێ: ((گومانی تێدا نییە کە هەندێ بەشی تەوراتی یەهودی ئامانجێکی کاتی و شتێکی ناکامڵی تێدایە)).

(پوچی) کە گوزارشتی ڕاگەیاندنە ڕەسمییەکەیە هاوواتای (ئامانجی کاتی) نییە کە گوزارشتی قسەکەرە، کاتێ قسەکەر بە شێوەیەکی نامۆ سیفەتی یەهودییەتی دەخاتە پاڵ ئەوا ئاماژە بەوە دەکات کە دەقە مەسکونییەکە تەنها توانیویەتی ڕەخنە لە نوسخە عیبرییەکە بگرێت، لە کاتێکدا مەسەلەکە بە هیچ جۆرێک بەم شێوەیە نییە و پەیمانی کۆن – لەو کۆڕەدا – بابەتی حوکمی تایبەت بە کەموکوڕی و پوچی هەندێ بەشی بوو.

# کۆتایی

نابێ تەنها تەماشای جوانکاری و ڕەوانبێژی تەورات بکەین بەڵکو دەبێ بابەتییانە لێی بکۆڵینەوە. ئەوەش تەنها زانینی دەقەکان ناگرێتەوە بەڵکو زانینی مێژووی دەقەکانیش دەگرێتەوە. لە واقیعدا زانینی مێژووی دەقەکان ڕێ دەدات بە دروستبوونی بیرۆکەیەك لەبارەی ئەو بارودۆخەی بۆتە هۆی دەسکاریکردنی دەقەکان بە درێژایی سەدەکان و پێکهاتنی سستی تەواوی تەورات کە ئەمڕۆ لەبەر دەستماندایە بەو بەشانەی بۆی زیادکراوە و بەو بەشانەیشی لێی لابراوە.

ئەو زانیارییانە وا دەکات بوونی ڕیوایەتی جیاواز لە پەیمانی کۆن هەبێت لەبارەی یەك بابەت و هەڵەی مێژوویی و بابەتی پێچەوانەو هیتری نامەعقوڵ یان بابەتی وا کە ئەستەمە لەگەڵ نەگۆڕە زانستییەکان ڕێك بکەوێ. ئەستەم ڕێکەوتن لەگەڵ پێدراوە زانستییەکان مەسەلەیەکی تەواو سروشتییە لە هەموو دانراوە کۆنەکانی مرۆڤایەتی. چۆن ئەو ناسازییانە لەو کتێبانە نابینین کە لە بارودۆخێکی وەکو ئەوەی دەقی تەوراتی تێدا دروست بووە نووسراون؟؟

پیاوێك کە تێگەیشتنێکی دروستی هەبێ وەکو قەدیس ئۆگەستین — لە سەردەمێکدا بڕیاردان لەسەر بابەتی نامەعقوڵی یان ناسازی لە گۆڕێدا نەبوو— توانی (پرەنسیپی ئەستەمە بابەتی پێچەوانەی حەقیقەت خودایی بێت) بخاتە ڕوو: قەدیس ئۆگەستین پێی وابوو کە ناکرێ خودا شتێك فێری مرۆڤ بکات کە لەگەڵ حەقیقەت ڕێك نەکەوێ. ئامادەش بوو لە هەر دەقێکدا ئەم بابەتانە بسڕێتەوە کە بەهۆی ئەو هۆکارانەوە پێویستی بە لابردن هەبوو.

دواتر — لە سەردەمێکدا بڕیاران دەرکیان بەوە کردووە کە ئەستەمە هەندێ بڕگەی تەورات لەگەڵ زانیارییە نوێیەکان ڕێك بکەوێت — کەچی ڕەتی دەکەنەوە شوێنپێی قەدیس ئۆگەستین هەڵبگرن. ئەو کات لەدایکبوونی ئەو ئەدەبەمان بینی کە وێڕای هەموو شتێك ئامانجی ئەوەیە پاساو بێنێتەوە بۆ دەسگرتن بە دەقگەلێك کە لە تەوراتدا شوێنێکی بۆ نەماوەتەوە.

کۆڕی مەسکونی ڤاتیکانی دووەم (١٩٦٢ — ١٩٦٥) کەمێك لەو کەللەڕەقییەی سووك کرد ئەوەش بەوەی تێبینی نیشاندا لەسەر (بەشەکانی پەیمانی کۆن) کە (کەموکوڕی و هەندێ پوچی) تێدایە. ئایا ئەو تێبینییە تەنها هەر وەکو گوزارشت لە نیازێکی باش دەمێنێتەوە یان گۆڕانکاری لە هەڵوێستی بەدوادا دێت بەرامبەر ئەو دەقانەی کە چیتر بەو شێوەیە قەبووڵ ناکرێ..

## سەرەتا

زۆرێك لە ئینجیلخوێنەکان هەست بە قەڵسی بەڵکو بە سەرسوڕمان دەکەن کاتێ لە واتای هەندێ ڕیوایەت ڕادەمێنن یان کاتێ بەراورد لە نێوان چەند ڕێوایەتێکی جیاواز لەبارەی یەك ڕووداو کە لە زۆرێك لە ئینجیلەکان گێڕدراوەتەوە، دەکەن. ئەوە ئەم تێبینییەیە کە باوکە ڕۆجی لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (پێشەکییەك بۆ ئینجیل) دەیخاتە ڕوو. ئەو نووسەرە لەم بوارەدا ئەزموونێکی دەوڵەمەندی هەیە، ئەو ساڵانێکی زۆر لە هەفتەنامەیەکی کاسۆلیکی ئەرکی وەڵامدانەوەی ئەو ئینجیلخوێنانە بوو کە دەقەکان واقوڕماوی دەکردن، ئەو ئەزموونە بۆی ڕەخساند پەی ببات بە ڕادەی گرینگیی ئەو پەشۆکاوییەی ئینجیلخوێنان هەستی پێ دەکەن. تێبینی کرد کە ئەو داوای ڕاڤەکردنانەی خوێنەران بۆیان دەنارد ئەوانەی سەر بە ناوەندی هەمەچەشنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بوون زیاتر باسی ئەو دەقانە بوو کە خوێنەران پێیان وابوو((لێڵ و ناتێگەیشتوو بەڵکو هاودژ و بێواتا یان حەیابەر))بوون. کەواتە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە خوێندنەوەی تەواوی دەقەکانی ئینجیلەکان دەتوانێ مەسیحییەکان تووشی پەشۆکانێکی قوڵ بکات.

ئەم تێبینییە هی سەردەمێکی نزیکە: کتێبی باوکی ڕۆجی ساڵی ١٩٧٣ بڵاوکرایەوە. لە سەردەمێکی زۆر دوور نا زۆربەی مەسیحییەکان شتێکی ئەوتۆیان لە ئینجیلەکان نەدەزانی جگە لەو پەڕەگرافە هەڵبژێردراوانە نەبێت کە لە کاتی قدداس یان ئامۆژگارییەکان دەخوێنرانەوە. ئەگەر حاڵەتی پرۆتستانت بەلاوە بنێین ئەوا خوێندنەوەی ئینجیلەکان بە شێوەیەکی گشتی نەریتێکی باو نەبوو تەنها لە هەندێ بۆنەدا نەبێت. کتێبەکانی فێرکاریی ئایینی تەنها چەند پەڕەگرافێکی هەڵبژاردەی ئینجیلەکانی تێدا بوو و دەقی تەواوی ئینجیل

لەبەردەستی خەڵکدا نەبوو. لە کاتی خوێندنی دواناوەندیم لە خوێندنگایەکی کاسۆلیکی دانراوەکانی (فەرجیل) و (ئەفلاتون)م دەست دەکەوت بەڵام هیچ کاتێك ڕووی نەداوە پەیمانی نوێ (ئینجیل)م دەست کەوتبێت.لەگەڵ ئەوەشدا دەقی یۆنانی پەیمانی نوێ دەکرا سوودبەخش بێت. دوای ئەوە بە ماوەیەکی زۆر زانیم کە بۆچی مامۆستاکانمان بۆچی ئەرکی وەرگێڕانی کتێبە پیرۆزەکانی مەسیحییەتیان پێ نەدەداین، دەکرا ئەو کتێبانە بەرەو ئەوە بمانبەن پرسیاری وەها لە مامۆستاکانمان بکەین کە وەڵامدانەوەیان سەخت و ناخۆش بوو.

ئەو کەموکورتییانە کە مرۆڤی ڕەخنەگر لە کاتی خوێندنەوەی تەواوی ئینجیلەکان پێی دەگات وای لە کلێسا کرد بێتە ناوەوە بۆ یارمەتیدانی خوێنەران تا بەسەر ئەو حەپەسانەیاندا زاڵ بن. ((زۆرێك لە مەسیحییەکان پێویستیان بە فێربوونی خوێندنەوەی ئینجیلەکانە)) بەپێی قسەی باوکە ڕۆجی. مرۆڤ لەگەڵ لێکدانەوەکان هاوڕا بێت یا نا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە چونکە بە ڕاستی نووسەر لە ڕووبەڕوو بوونەوەی گرفتە ناخۆشەکان لێهاتوویی گەورەی هەیە. بەڵام ئەوەی جێی داخە سەبارەت بە زۆرێك بەو نووسراوانەی لەبارەی ئینجیلەوە نووسراون هەمیشە مەسەلەکە وەها نییە.

لە بڵاوکراوە ئاراستەکانی تەورات دەبینین تێبینییە سەرەتاییەکان زۆربەی کات کۆمەڵە هۆکارێك دەخاتە ڕوو کە دەیەوێ خوێنەر قایل بکات بەوەی ئینجیلەکان هەرگیز گرفتی پەیوەست بە کەسایەتیی نووسەرانی بەشە جیاوازەکانی تەورات و دروستیی دەقەکان و سروشتی ڕاستەقینەی ئەو ڕیوایەتانە ناخاتەڕوو. لە کاتێکدا نادیاری و ناڕوونییەکی زۆر لەبارەی ئەو نووسەرانەوە هەیە کە ئێمە لە ناسنامەکانیان دڵنیا نین، کەچی دەبینین لەو بوارەدا چەندان گریمانە وەکو

مەسەلەیەکی یەقینی دەخرێتە ڕوو و، جەخت لەوە دەکرێتەوە کە ئەم مژدەدەرە یان ئەوەیان بە چاوی خۆی چەند ڕووداوێکی دیاریکراوی بینیوە کەچی پێچەوانەی ئەمە چەند لێکۆڵینەوەیەك پێچەوانەی ئەمە دەڵێن. بەرپرسان بە شێوەیەکی زۆر زیادەڕەوانە ماوەی نێوان کۆتاییهاتنی پەیامی مەسیح و دەرکەوتنی دەقەکان کەم دەکەنەوە. دەیانەوێ وا لە خەڵك بگەیەنن کە یەك داڕشتە(صیغە) هەبووەو پشتی بە کەلەپوری زارەکی بەستووە لە کاتێکدا پسپۆڕان سەلماندوویانە کە ئەم دەقانە دەستکاری زۆر کراون و باس لەوە دەکەن لێرەو لەوێ هەندێ گرفت لە لێکدانەوەکاندا هەیە بەڵام چاو لەو ناسازی و دژیەکانە دەنوقێنن کە هەر کەسێك سەرنجی بدات زەق زەق بۆی دەردەکەوێ. خوێنەر لە فەرهەنگە بچووکەکان ئەوانەی کراونەتە پاشکۆی پێشەکییەکان تێبینی ئەوە دەکات کە شتە نامەعقوڵەکان یان دژیەکەکان یان هەڵە زەقەکان زۆر جار خۆی لێ بەدوور دەگیرێ یان بە هەندێ بەڵگەو بیانووی لێهاتووانەی ستایشکارانە دەخنکێنرێت. ئەوەی لەوەدا خوێنەر دەتۆقێنێ مۆرکی هەڵخەڵەتێنەرانەی ئەو لێدوانانەیە.

ئەو هۆکارانەی ئێرە بێگومان ئەو خوێنەرانە دەحەپەسێنێ کە زانیارییان لەبارەی ئەو گرفتانە نییە. بۆیە بەر لەوەی بچینە ناو کرۆکی بابەتەکە، هیوادارم لە ئێستاوە بە نموونەیەك مەبەستەکەم ڕوون بکەمەوە کە پێموایە بەڵگەی تەواوی قسەکانمە.

نە (مەتا) و نە (یۆحەننا) باس لە بەرزبوونەوەی مەسیح ناکەن. بەڵام (لۆقا) لە ئینجیلەکەیدا بە ڕۆژی (قیامە) دیاری دەکات و لە (کارەکانی نێردراوان)یش کە دەگوترێ ئەو نوسەریەتی بە پاش چل ڕۆژ دیاری دەکات. سەبارەت بە (مەرقەس)یش (بێ دیاریکردنی مێژووەکەی) تەنها ئاماژەی پێ دەکات، ئەوەش

لە کۆتاییەکدا کە ئێستا بە ناڕاست دادەنرێ. بینا لەسەر ئەوە مەسەلەی بەرزبوونەوە هیچ بنەمایەکی پتەوی لە ئینجیلدا نییە. وێڕای ئەمەش کەچی نووسەران بە بێباکییەکی ئەوتۆ کە باوەڕ ناکرێ باس لەو مەسەلە گرینگە دەکەن.

(ئەی.تریکۆ) لە (فەرهەنگە بچووکەکانی پەیمانی نوێ) هیچ وتارێکی لەبارەی بەرزبوونەوە نەنوسیوە..هەروەها هەردوو باوکان (بینەوا و، بوامار) لە چاپی چوار ئینجیلەکەدا باسی ئەوە دەکەن کە دژیەکی لە نێوان ئینجیلەکەی لۆقاو (کارەکانی نێردراوان) دەگەڕێتەوە بۆ (فێڵێکی ئەدەبی)....جا با تێ بگات ئەوەی تێگەیشتنی هەیە!!

بەڵام وا دەردەکەوێ باوکە ڕۆجی ئەم بەڵگەو بیانووە فریوی نەداوەو ملکەچی نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا کەمترین شت لەبارەی پاساودانەکەی بوترێ ئەوەیە کە بێوێنەیە. باوکە ڕۆجی لە کتێبی (پێشەکییەك بۆ ئینجیل) چاپی ١٩٧٣ لاپەڕەی (١٨٧) دەڵێ: ((گرفتەکە لێرەدا هەروەکو زۆرێك لە گرفتە هاوشێوەکانی تر، وا دەردەکەوێ کە شیاوی چارەسەر نییە تەنها مەگەر دەست بە حەرفییەتی بانگەشەکانی کتێبی پیرۆزەوە بگرین و دەلالەتە دینییەکانی لەبیربکەین، مەبەست چارەسەرکردنی ڕاستیی بابەتەکان بە ڕەمزییەتێکی شلەپەتە نییە، بەڵکو مەبەست گەڕانە لە نیازی ئایینی ئەوانەی نهێنییەکان ئاشکرا دەکەن بە پێشکەشکردنی بابەتی هەستپێکراوو نیشانەگەلی تایبەت بە ڕەگوڕیشە ماددییەکانی عەقڵمان)).

چۆن بەو جۆرە لێکدانەوەیە واز بێنین؟؟ ئەو شێوازە ستایشکارانەیە تەنها بۆ باوەڕداران گونجاوە..

گرینگیـی دەسـتەواژەکەی باوکـە ڕۆجـی لەوەشـدایە کـە دان دەنـێ بـەوەی (حالـەتی تـری هاوشـێوە) لـەبارەی پرسـی بەرزبوونـەوە لـە ئینجیلەکانـدا زۆرە. کەواتە پێویستە بە شێوەیەکی هەمەلایەن و بەوپەڕی بابەتیانـەو لـە ڕەگوڕیشـەوە باس لە کێشەکە بکرێت. کەواتە وا دەردەکـەوێ کـە دانـایی لـەوەدا بێـت لـە ڕێـی توێژینەوەی ئەو بارودۆخەی لە سایەیدا ئینجیلـەکان نووسـراونەتەوەو ئـەو کەشـە نایینییەی کـە لـەو سـەردەمەدا بـاو بـووە بـەدوای ڕوونکردنـەوەی تـردا بگـەڕێین. ڕوونکردنـەوەی ئـەو هەموارکردنانـەی لـە دارِشـتەکانی بـەرایی کـراوەو هـەروەها ڕوونکردنەوەی ئەو دەسکاریکردنانەی بەسەر دەقەکاندا هێنراوە تا گەیشتۆتە لای ئێمە، هەموو ئەمانە وا دەکات هەستکردن بە سەرسوڕمانمان بەرامبەر دەستەواژە لێڵ و ناسازو ناڕوونەکان کە عـەقڵ دەرکـی پـێ ناکـات سـووك ببێـت، بـەڵکو ئـەو دەستەواژانە هەندێ کات هێندە هاودژن کە بێمانا دێنە بەرچاو و ئەستەم دەبێت لەگـەڵ ئـەو پێشـهاتانە بگـونجێن کـە پێشـکەوتنی زانسـتی سـەلماندوونی. ئـەو تێبینیانە نیشانەی ئەوەیە کە مرۆڤ دەستی هـەبووە لـە نووسینەوەی دەقـەکان و ئەو دەسکاریکردنەی دواتر بەسەریاندا هاتووە.

ئەوەی هەیە ئێستا ئەوەیە کە دەیان ساڵە بە گیانێکی لێکۆڵینەوەی بابەتییانە لاکراوەتەوە بە لای بایەخدان بە لێکۆڵینەوەی کتێبە پیرۆزەکان. لـە کتێبێکدا کـە ماوەیەك لەمەوبـەر بـە ناونیشـانی (بـاوەڕ بـە قیامـەت و زیندووکردنـەوەی بـاوەڕ) بڵاوبۆوە، باوکە (ر.پ.کانینگسەر) مامۆستا لە پەیمانگەی کاسۆلیکی لـە پـاریس کورتەیەك لەبارەی ئەو گۆڕانکارییە قووڵە دەخاتە ڕوو، دەڵێت: ((خـەریکـە گـەلی باوەڕداران بەو شۆڕشە نـەزانن کـە لـە سـەردەمی (پـی دوازدەوە١٩٣٩ — ١٩٥٨) بەسەر ڕێبازەکانی لێکدانەوەی تەوراتـدا هـاتووە.)) کەواتـە ئـەو شۆڕشـەی دانـەر

باسی دەکات لەم سەردەمەی ئێستامان نزیکە. وا کاریگەرییەکانی دەگاتە فێرکاریی ئیمانداران، بە لای کەمەوە هەندێ لەو پسپۆڕانەی گیانی نوێخوازی دەیانبزوێنێ بەوە دەڵدەستن. هەروەها دانەر دەڵێ: ((ئەو شۆڕشە لە ڕێبازەکانی تەفسیر بە شێوەیەکی کەم بێت یان زۆر ڕێگا دەکاتەوە بۆ بەرپاکردنی کودەتایەك لە ڕەگداکوتاوترین تێڕوانینەکانی نەریتی ئامۆژگاری و ڕێنمایی کەنیسەیی.)).

باوکە کانینگسەر هۆشداری ئەوە دەدات کە ((چیتر پێویست نییە ئەو ڕووداوانەی لەبارەی مەسیحەوە لە ئینجیلەکاندا هاتوون پیت بە پیت و بە حەرفی وەربگیرێن چونکە ئەمانە نووسینگەلێکی کاتی و پەیوەست بە دۆخێکەوەن یان هاودژو ناسازن..کتێبەکەی وتەی کۆمەڵێك لەوان لەبارەی مەسیحەوە دێنێت..سەبارەت بە هەستانەوەی مەسیح کە ئەمەش بابەتی کتێبەکەیەتی، باوکە کانینگسەر ئاماژە بەوە دەکات کە ئەستەمە هیچ یەکێك لە نووسەرەوەکانی ئینجیلەکان سیفەتی شایەت عەیان بداتە خۆی. کەواتە دەکرێ بە هەمان شێوە سەیری سەرجەم ژیانی مەسیح بکرێ..

کەواتە ئەوا ئێمە تەواو دوورین لەو هەڵوێستە تەقلیدییانەی دەیان ساڵە کۆڕی ڤاتیکانی دووەم بەڕێزەوە جەختی لێ دەکاتەوەو سەرەتای کتێبە نوێیەکانی کە ئاراستەی ئیمانداران دەکرێ پێ دەست پێ دەکرێ..بەڵام وا وردە وردە حەقیقەت دەردەکەوێ.

بەڵام دەرکپێکردنی ئاسان نییە چونکە کێشی ئەو نەریتە بۆماوانەی دەیان ساڵە بەوپەڕی توندییەوە بەرگریان لێ دەکرێ قورسە. ئەگەر بمانەوێ لەو قورساییە ڕزگار بین پێویستە گرفتەکە لە لە بنچینەوەڕا وەرگرین واتە سەرەتا ئەو بارودۆخە بتۆژینەوە کە لە هاتنەدونیای مەسیحییەت لەئارادا بووە..

# بیرهێنانەوەیەکی مێژوویی

# یەهودییەت – مەسیحییەت و پۆڵس

زۆربەی مەسیحییەکان وا باوەڕ دەکەن کە ئینجیلەکان شایەت عەیانی ژیانی مەسیحن و ئەو ئینجیلانە شایەتن لەبارەی ڕووداوەکان و بانگەوازی مەسیح کە هیچ مشتومڕێك قەبوڵ ناکات. ئیماندارێك کاتێ ڕوبەڕووی ئەو گرەنتییە ڕاستودروستانە دەبێ چۆن دەتوانێ گفتوگۆ لەبارەی ئەو زانیارییانەوە بکات کە لەو ئینجیلانەوە دێتەدەرێ؟ ئیماندار چۆن دەتوانێ گومانی لە بەهای دامەزراوەی کەنیسە هەبێت کە بە هۆی پیادەکردنی ڕێنماییە گشتییەکانی کە مەسیح دەری کردووە هاتۆتەبوون. چاپەکانی ئێستای ئینجیلەکان کە ئاراستەی حەشیمەتی خەڵك کراون چەند کۆمێنتێکیان لەخۆگرتووە کە ئامانجی بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییانەیە لەنێو جەماوەردا.

بەرپرسانی ئەو چاپانە سیفەتی شایەت عەیان دەدەنە نووسەرەوەی ئینجیلەکان بەو پێیەی ئەوە مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە. ئایا قەدیس جۆستین لە نیوەی سەدەی دووەم ناوی (یاداشتی نێردراوان)ی لە ئینجیلەکان نەنابوو؟ پاشان ئەو دیاریکردنانەی بەسەر خەڵکەوە ڕادەگەیەنرێن و تایبەتن بە نووسەرەوەکان ئەوەندە فرەن بە جۆرێك بابای مەسیحی دەپرسێ: چۆن دەکرێ گومان لە ڕاستودروستیان بکرێ؟: بۆ نموونە دەگوترێ (متی) کەساتییەکی ناسراو بووە، (لە نووسینگەی گومرگ یان باجی هاتوچۆ لە کفرناحوم فەرمانبەر بووە)، بەڵکو دەوترێ ئەو ئارامی و یۆنانیشی زانیوە. هەروەها ناسنامەی (مرقس) بەتەواوی زانراوە بەو پێیەی یاریدەدەری (پەتروس) بووە: کەواتە گومانی تێدا نییە کە ئەو شایەت عەیان بووە. سەبارەت بە (لوقا) ئەو (پزیشکە خۆشەویست)ە کەوا پۆڵس

لەبارەیەوە دەدوێ زانیاری لەبارەیەوە زۆر وردە. هەروەها (یوحنا) هەمیشە نێردراوی نزیکی مەسیح بووەو کوڕی (زبید)بووە، لە دەریاچەی (کەسروت) ماسیگر بووە.

لێکۆڵینەوە نوێیەکان لەبارەی سەرەتاکانی مەسیحیەتەوە ئەوە دەردەخەن کە ئەو میتۆدە لە پێشکەشکردنی بابەتەکان هەرگیز لەگەڵ واقیع ڕێك ناکەوێ. دواتر ئەوە دەبینین کە لەوبارەوە پەیوەستە بە ئینجیلەکان. بەڵام ئەوە پەیوەستە بە دەیان ساڵی دوای پەیامی مەسیح پێویستە خوێنەر ئەوە بزانێ کە ڕووداوەکان هەرگیز بەو شێوەیە ڕوویان نەداوە کە وتراوەو گەیشتنی بەتروسیش بۆ ڕۆما هەرگیز کەنیسەی دانەمەزراندووە. بەڵکو بە پێچەوانەوە لە نێوان ئەو ساتەی مەسیح ئەم زەمینەی بەجێهێشت تاوەکو نیوەی سەدەی دووەم، واتە بە درێژایی زیاتر لە سەدەیەك شەڕێك لە نێوان دوو ئاراستەدا هەبوو: واتە لە نێوان ئەوەی پێی دەوترێ مەسیحییەتی پۆڵسی و لە نێوان یەهودییەتی مەسیحی. ئاراستەی یەکەم شوێنی ئاراستەی دووەمی نەگرتەوەو پۆڵسییەت بەسەر یەهودییەتی مەسیحیدا زاڵ نەبوو تەنها زۆر بە هێواشی و پلەپلە نەبێت.

ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵینەوە هەیە کە بۆ دەیەکانی ئەم دواییە دەگەڕێتەوەو لە سەر دۆزراوەکانی ئەم سەردەمە دامەزراوەو بۆتە هۆی گەیشتن بەم زانیارییە نوێیانە کە ناوی کاردینال دانیلۆی پێوە لکاوە..ئەو وتارەی لە ساڵی ١٩٦٧ لە گۆڤاری (لێکۆڵینەوەکان) بڵاوی کردەوە (تێڕوانینێکی نوێیە بۆ بنەماکانی مەسیحییەت و یەهودییەتی مەسیحی)،لێکۆڵینەوەکانی پێشوو تێهەڵدەچێتەوە: ئەو هێڵەکانی مێژووی مەسیحییەت دادەنێ و دەرکەوتنی ئینجیلەکان دیاری دەکات، ئەوەش لە سیاقێکی تەواو جیاواز لەوەی زانیارییە گشتییەکانی

ئاراستەکراوی جەماوەر دەیلێن. گرینگترین خاڵە جەوهەرییەکانی ئەو وتارە لەگەڵ چەند برگەیەکی دەخەینەڕوو:

((کۆمەڵێك حەواری بچووکی دوای مەسیح)) دەستەیەکی یەهودییان دامەزراند کە مومارەسەی ئایینی پەرستگایان دەکردو ڕێنماییەکانیان دەپاراست. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ دەستەیەك لەو بتپەرستانەی کە باوەڕیان هێنابوو دەچوونە ڕیزیان سیستمێکی تایبەتیان بۆ پێشنیاز دەکردن: کۆڕی (قودسی مەسکونی) (٤٩ی زایینی) لە پاکژی و پیادەکردنی پایەکانی یەهودییەت ئازادی دەکردن، زۆرێك لە یەهودە مەسیحییەکان ئەو تەنازولەیان ڕەتکردەوە. ئەم کۆمەڵەیە بەتەواوی لە پۆلس جودابۆوە. بەڵکو لەمە زیاتریش بەهۆی ئەوانەی هاتبوونە نێو مەسیحییەتەوە پۆلس و یەهودە مەسیحییەکان پێکیاندادا (ڕووداوەکانی ئەنتاکییە لە ساڵی ٤٩ی زایینی)، ((لە ڕوانگەی پۆلسەوە، پاکژی و ڕەچاوکردنی پشوودانی ڕۆژی شەممە و ئایینی پەرستگا بابەتگەلێکی پواو و ڕزیو بوون تەنانەت بۆ خودی یەهودییەکانیش،، پێویستە لەسەر مەسیحییەت لە ئینتیمای سیاسی و ئایینی بۆ یەهودییەت ڕزگاری ببێت تاوەکو بۆ کەسانی نایەهودیش باڵەکانی بکاتەوە)).

بەڵام یەهودە مەسیحییەکان ئەوانەی هەر بە (یەهودی دڵسۆز) مابوونەوە پۆلس بە ناپاك (خائین) دادەنێن و بەڵگەنامە یەهودی – مەسیحییەکان بە (دوژمن) وەسفی دەکەن و بە پیلانگێڕانی تەکتیکی تۆمەتباری دەکەن)). بەڵام ((یەهودییەتی – مەسیحی تاوەکو ساڵی ٧٠ی زایینیش زۆرینەی کەنیسەی پێکدێنا))و لەو کاتەدا ((پۆلس گۆشەگیر)) بوو. سەرۆکی کۆمەڵە (جاك) خزمی مەسیح بوو. ((لە سەرەتادا)) پەترۆس پاشان یۆحەنای لەگەڵدا بوو. ((دەکرێ

جاك بە كۆڵەگەی یەهودییەتی مەسیحی دابنێین كە لە بەرامبەر مەسیحییەتی پۆڵسی پابەند بە هێڵی یەهودییەت مایەوە)). خانەوادەی مەسیح لەو كەنیسە یەهودییە مەسیحییە لە قودس شوێن و پایەكی گەورەیان هەیە. ((سیمیونی كوڕی كالیوبای ئامۆزای (؟) مەسیح (جاك)ی لێ وەپاش كەوتووە)).

كاردینالٚ دانیلۆ لە وتارەكەیدا باسی نووسراوە یەهودییە — مەسیحییەكان دەكات و چەند تێڕوانینێكی ئەو كۆمەڵەیە لەبارەی مەسیح دەخاتەڕوو، ئەو كۆمەڵەی یەكەم جار لە دەوری حەوارییەكان دروست بوون..ئەو نووسراوانەش بریتین لە (ئینجیلی عیبرییەكان) كە بۆ كۆمەڵەیەكی یەهودی مەسیحیی میسری دەگەڕێتەوە..هەروەها (پاشماوەكانی كلیمەنت) و (فەزیلەتە كلیمەنتییەكان) و (كۆتایی جیهانی جاك) و (ئینجیلی تۆما)..هەروەكو دەردەكەوێ پێویست بكات كۆنترین دەستنووسی ئەدەبی مەسیحی بۆ ئەم یەهودییە — مەسیحییانە بگەڕێنینەوە كەوا كاردینالٚ دانیلۆ بە دوورودرێژی ئاماژەی پێ دەكات..دەڵێ:

((بە درێژایی سەدەی یەكەمی كەنیسە، یەهودییەتی مەسیحی تەنها لە قودس و فەلەستین باوو بڵاو نەبوو. هەروەكو دەردەكەوێ نێردەی یەهودییەتی مەسیحی بەر لە نێردەی پۆڵسی لە هەموو شوێنێك پەرەی سەندبوو. هەر ئەوەش ئەو ئاماژە بەردەوامەی پۆڵس لە نامەكانیدا بۆ ململانێیەك ڕوون دەكاتەوە)). ئەوان ئەو دوژمنانە بوون كە بۆ هەر شوێنێك بچووبایە ڕووبەڕوویان دەبوو: لە غەلاتییەو، كورنتەو، كولوس و، ڕۆماو، ئەنتاكییە..

كەناراوی سوریا — فەلەستین لە غەززەوە بۆ ئەنتاكییە یەهودی مەسیحی بوو، ((كارەكانی نێردراوان و نوسراوە كلیمەنتییەكان شایەتی ئەمە دەدەن)). بوونی

یەهودە مەسیحییەکانیش لە ئاسیای بچووك، نامەکانی پۆڵس بۆ غەلاتی و کۆلوسییەکان شایەتن. نووسراوەکانی بانیاسیش زانیاری لەبارەی یەهودییەتی مەسیحی لە فریجی دەدەن بە دەستەوە. سەبارەت بە یۆنانیش نامەی پۆڵس بۆ خەڵکی کۆرنوس باس لە یەهودە مەسیحییەکان دەکات..بە پێی نامەیەکی کلیمەنت و سەرپەرشتیاری هرمیاس شاری ڕۆما بە (سەنتەرێکی گرینگ) دادەنرێ. سویتۆن و تاسیت وای دەبینن کە مەسیحییەکان تائیفەیەکی یەهودین، کاردیناڵ دانیلۆ بڕوای وایە کە یەکەم مژدەدان بە ئینجیلەکان لە ئەفەریقا یەهودیی مەسیحی بوو. هەروەها ئینجیلی عیبرییەکان و نووسراوەکانی کلیمەنتی ئەسکەندەری بۆ یەهودییەتی مەسیحی دەگەڕێنرێتەوە..

زانینی ئەم ڕووداوانە بابەتێکی سەرەکییە بۆ ئەوەی تێ بگەین لە چ کەشێکی ململانێی نێوان گروپەکاندا ئینجیلەکان نووسراونەتەوە. دەرکەوتنی ئەو دەقانەی ئەمڕۆ لەبەر دەستمانە لە ساڵی ٧٠ی زایینی دەستی پێ کرد، ئەوەش دوای دەسکاریکردنی سەرچاوەکان، لەو ماوەیەشدا ململانێی نێوان دوو گروپە ڕکابەرەکە لە لوتکەدا بوو و لەو دۆخەشدا سەروەری بۆ یەهودە مەسیحییەکان بوو.. بەڵام بە هۆی شەڕی حەفتاو کەوتنی قودسەوە هەڵوێستەکە بە تەواوی گۆڕا. کاردیناڵ دانیلۆ هۆکارەکانی هەرەسهێنانەکە بەم شێوەیە باس دەکات:

((ئەو کاتەی یەهودییەکان لە ئیمبراتۆرییەتدا بێزراو بوون بۆیە مەسیحییەکان هەوڵیاندا لێیان جیا ببنەوە، ئەو دەم مەسیحییە هیللینستکییەکان باڵادەست بوون: پۆڵس دوای مردنی سەرکەوتنی بە دەست هێنا. بەمەش مەسیحییەت لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە لە یەهودییەت جیا بۆوەو بووە گەلی سێیەم.

وێڕای ئەمەش و تاوەکو دوا یاخیبوونی یەهودی لە ساڵی ١٤٠ی زایینی، لە ڕووی کولتورییەوە هەر یەهودییەتی مەسیحی باو بوو.))..

لە ساڵی ٧٠ی زایینییەوە تاوەکو ماوەیەك بەر لە ساڵی ١١٠ی زایینی ئینجیلەکانی (مرقس و متی و لوقا و یوحنا) بەرهەم هاتن. ئەو ئینجیلانە بە یەکەم بەڵگەنامەی نەگۆڕ لە مەسیحییەت دانانرێن: نامەکانی پۆڵس لە پێش ئەوانە. بە ڕای (ۆ.کولمان) پۆڵس لە ساڵی ٥٠ی زایینی نامەکەی بۆ خەڵکی تسالونیکی نووسیوە. بەڵام گومانی تێدا نییە کە چەند ساڵێك بەر لە تەواوبوونی ئینجیلی مرقس مرد.

ئەگەر پۆڵس لە هەموو ناودارەکانی مەسیحییەت زیاتر مایەی مشتومڕ بێت، ئەگەر بەرامبەر بیری مەسیح بە ناپاك دانرا بێت، هەروەکو خانەوادەی مەسیح و حەوارییەکان ئەوانەی لە قودس بە دەوری (جاك)ەوە مان وەها وەسفی دەکەن. ئەوە لەبەرئەوەیە چونکە ئەو مەسیحییەتی لەسەر حیسابی ئەوانە دامەزراند کە مەسیح بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێنماییەکانی لە دەوری خۆی کۆکردبوونەوە، لەبەرئەوەی لە ژیانیدا مەسیحی نەتدیبوو بۆیە پاساوی شەرعیبوونی پەیامەکەی بەوە هێنایەوە کەوا مەسیح دوای هەستانەوەی لەسەر ڕێگای دیمەشق خۆی پیشانی ئەو داوە. دەتوانین بپرسین لەبارەی ئەو مەسیحییەتەی کە بە بێ پۆڵس دەهاتە بوون؟ لەو پێگەیەشدا دەتوانین گریمانەی زۆر بکەین، بەڵام سەبارەت بە ئینجیلەکان پرکێشییەکی گەورە ناکەین گەر بڵێین ئەگەر کەشی ململانێی نێوان تائیفەکان نەبووایە کە بە هۆی جیابوونەوەی پۆڵسەوە هاتە بوون، ئەو نووسراوانەمان دەست نەدەکەوت کە ئێستا لەبەر دەستماندایە.ئەو (نووسراوە ململانێویانە) هەروەکو باوکە کانینگسەر وەها وەسفیان دەکات، لە ماوەی

ململانێی توندی نێوان دوو تائیفەکەو دەرکەوت و لە کۆمەڵێك نووسراو لە بارەی مەسیحەوە سەری هەڵدا. لەو سەردەمەدا مەسیحییەتی پۆڵسی دوای سەرکەوتنی کۆتایی، کۆمەڵێك دەقی ڕەسمی واتە (قانون)ی پێکهێنا کە هەموو بەڵگەنامەکانی تری دوور دەخستەوە کە لەگەڵ ئەو هێڵە نەدەسازا کە کەنیسە هەڵیبژاردبوو و دواتریش پێچەوانەی ئەرسۆزۆکسی بوون..

ئەگەرچی یەهودە مەسیحییەکان ((وەکو تائیفەیەکی بەدەسەڵات ون بوون بەڵام قسەکردن لەبارەیانەوە بەردەوامە بەڵام لەژێر ناوی (بەیەهودبووەکان). لەبارەی کۆتایی هاتنیان کاردینالْ دانیلۆ وەها باسیان دەکات:

((بە پچڕانی یەهودە مەسیحییەکان لە کەنیسەی گەورە کە وردە وردە لە پەیوەندییە یەهودییەکانی ڕزگاری بوو بە خێراییش لە خۆرئاوا لەناوچوون. بەڵام دەکرێ لە سەدەی سێیەم بۆ سەدەی چوارەم لە ڕۆژهەڵات بە تایبەتی لە فەڵەستین و نیوەدورگەی عەرەبی و دواوەی ئوردن و سوریاو نێوان دوو ڕووبارەکە شوێنەواریان هەڵبگیرێ و بدۆزرێتەوە. ئیسلام هەندێکیانی قووتداوەو بە شێوەیەکی بەشەکی میراتگری ئەوانە، هەندێکی تریان لەگەڵ ئەرسۆزۆکسییەت کەنیسەی گەورە هاوپەیمانییان کرد لەگەڵ پاراستنی پاشخانی کولتووری سامییانەیان. هەندێکی تریشیان هێشتا پابەندن بە هەر دوو کەنیسەی ئەسیوپی و کلدانی.)).

# چوار ئینجیلەکە

## سەرچاوەکانیان – مێژوویان

نووسراوە بەراییەکانی سەردەمی مەسیحی هیچ ئاماژەیەك بۆ ئینجیلەکان ناکەن تەنها بە ماوەیەکی درێژ دوای دانراوەکانی پۆڵس نەبێت. شایەتییەکانی پەیوەست بە بوونی کۆمەڵێك نوسراوی ئینجیلی تەنها لە ناوەڕاستی سەدەی دووەم و بە دیاریکراوی لە ساڵی ١٤٠ی زایینی دەردەکەون، ئەوە لە کاتێکدا کە ((زۆرێك لە بنووسە مەسیحییەکان لە سەرەتای سەدەی دووەمەوە بەڕوونی ئاماژە بەوە دەدەن کەوا ئاگایان لە ژمارەیەکی زۆر لە نامەکانی پۆڵس هەیە.)). ئەو تێبینیانەی ((پێشەکییەك بۆ وەرگێڕانی مەسکونی پەیمانی نوێ)) دەیخاتە ڕوو کە لە ساڵی ١٩٧٢ بڵاوکراوەتەوە شایستەی ئەوەیە دەمودەست باس بکرێ، هەروەکو ئاماژە بەوە کراوە کە ئەو وەرگێڕانە کارێکی بەکۆمەڵە زیاتر لە سەت پسپۆڕ لە کاسۆلیك و پرۆتستانت کاریان بۆ کردووە.

ئەو ئینجیلانەی دواتر واتە کلێسا بوونە ڕەسمی، ئەگەرچی نووسینەوەیان لە سەرەتای سەدەی دووەمدا بوو بەڵام لە سەردەمێکی درەنگدا ناسران. بەپێی وەرگێڕانی مەسکونی باسکردنی ئەو ڕیوایەتانەی لەو ئینجیلانەدا هەیە لە نیوەی سەدەی دووەم دەستی پێکرد، بەڵام ((نزیکە سەخت بێت ئەوە یەکلابکرێتەوە کە ئەو لێوەرگرتنانە دوای گەڕانەوە بۆ دەقە نووسراوەکانی بەردەستی بنووسەکان بووە یان ئەوان تەنها بەوەندە وازیان هێناوە کە بەشگەلێك لە ئەو کەلەپورە زارەکییەیان باس کردووە کە پشتی بە یادەوەری بەستووە.)).

لە نووسراوەکانی ئەو وەرگێڕانە مەسکونییەی پەیمانی نوێ خوێنەر ئەوە دەخوێنێتەوە((بە هەر حاڵ هیچ شایەتییەك نییە کە بڵێت کۆمەڵە نووسراوێکی ئینجیلی بەر لە ساڵی ١٤٠ ی زایینی هەبووە.)).ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەو قسەیەی (ئە.تریکۆ)یە کە لەبارەی وەرگێڕانەکەی بۆ پەیمانی نوێ دەڵێت: ((لە کاتێکی زۆر زووەوە، لە سەرەتای سەدەی دووەمەوە، بۆتە نەریت وشەی (ئینجیل) بەکاربهێنرێ وەکو ئاماژەیەك بۆ ئەو کتێبانەی قەدیس جۆستین لە ساڵی ١٥٠ی زایینی ناوی لێ دەنان یاداشتەکانی نێردراوان)).

ئەوەی جێی داخە ئەو جۆرە گومانانە زۆر دووبارە دەبنەوە بە جۆرێك زۆرینەی خەڵك تەنها چەند زانیارییەکی هەڵە لەبارەی مێژووی کۆکردنەوەی ئینجیلەکان دەزانن..

ئینجیل تەنها دوای زیاتر لە سەدەیەك لە کۆتاییهاتنی ناردنی مەسیح بووە یەك پارچەو، ئەوەش وەکو دەگوترێ لە کاتێکی زوودا ڕووی نەدا. وەرگێڕانی مەسکونی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ساڵی ١٧٠ی زایینی، ئەو مێژووەی تێیدا چوار ئینجیلەکە سیفەتی ئەدەبی کەنیسەییان وەرگرت. هەروەها بانگەشەی جۆستین کە بنووسانی ئینجیلەکان بە نێردراوان وەسف دەکات ئەمڕۆ پەسندکراو نییە هەروەکو دواتر دەبینین.

بەڵام سەبارەت بەوەی پەیوەستە بە مێژووی نووسینەوەی ئینجیلەکان ئەوا: (ئەی.تریکۆ) جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئینجیلەکانی (متی و مرقس و لوقا) بەر لە ساڵی ٧٠ی زایینی نووسراونەتەوە،، ئەوەش قەبووڵکراو نییە مەگەر بەبێ ئینجیلی مرقس.

کەواتە ئەم نووسەرە وەکو نووسەرانی تر هەوڵ دەدات بنووسانی ئینجیلەکان وەکو نێردراو یان هاوڕێی مەسیح بخاتەڕوو، ئەو بەمە مێژووەکانی نووسینەوە دێنێتە پێش کە نزیك دەبێتەوە لەو سەردەمەی مەسیحی تێدا ژیاوە. سەبارەت بە یوحنا کە (ئەی.تریکۆ) وای لێ کردووە تا نزیکەی ساڵی ١٠٠ی زایینی بژی، مەسیحییەکان وا ڕاهاتوون کە وا وێنا بکەن کە ئەو لە دۆخگەلێکی ڕەسمیدا هەمیشە لە مەسیح زۆر نزیك بووە، بەڵام بەڕاستی دژوارە ئەوە تەئکید بکرێتەوە کە ئەو بنووسی ئەو ئینجیلەیە کە ناوی وی هەڵگرتووە. نێردراو یوحنا (وەکو متی)، لە تێڕوانینی (ئەی.تریکۆ)و نووسەرانی تردا، بریتییە لە شایەتی لێهاتووی دانپێدانراو لەو باسانەی گێڕاویەتیەوە، لە کاتێکدا زۆرینەی نووسەران ئەو گریمانەیان بە لاوە پەسند نییە کە دەڵێ: ئەو هەر چوار ئینجیلەکەی نووسیوەتەوە.

ئەگەر دانانی ئەو چوار ئینجیلە وەکو (یاداشتەکان)ی نێردراوان یان هاوڕێیانی مەسیح دژوار بێت، کەواتە ئەسڵ و بنەڕەتەکەیان چییە؟؟

(ئۆ.کۆڵمان) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (پەیمانی نوێ)دا دەڵێ: ((مژدەدەرەکان تەنها وتەبێژ بوون بە ناوی کۆمەڵی یەکەمی مەسیحییەوە کە کەلەپوری زارەکییان چەسپاندووە. ئینجیل ماوەی سی یان چل ساڵ تەنها بە شێوەی زارەکی مابووەوە، بەڵام لە بنەڕەتدا کەلەپوری زارەکی چەند وتەو ڕیوایەتێکی پەرشوبڵاوی گواستۆتەوە. مژدەدەرەکان — هەر یەکەیان بەپێی میتۆدو کەسایەتیی تایبەت و بایەخدانە لاهوتییە تایبەتەکان — پەیوەندییەکانی نێوان ئەو ڕیوایەت و وتانەی لە کەلەپوری باویان بیستووە چنیوە. کۆکردنەوەی

وتەکانی مەسیح و پێکەوەبەستنی ڕیوایەتەکان بە دارشتەی لێلۆوێلی وەکو (دوای ئەمە) (هەر کە..) هتد...بەکورتی، چوارچێوەی سازاوی ئینجیلەکان(مرقس و متی و لوقا)،، هەموو ئەمانە مۆرکێکی ئەدەبییانەیەو بنەڕەتێکی مێژوویی نییە)).

ئەم نووسەرە خۆی دەست پێ دەکاتەوە: ((پێویستە تێبینی ئەوە بکرێ کە پێداویستییەکانی مژدەدان و فێرکردن و مومارەسەی ئایینی، وای لە کۆمەڵی یەکەم کرد ئەو کەلەپورە لەبارەی ژیانی مەسیحەوە زیاتر لە بایەخدانیان بە تۆمارکردنی ژیانی مەسیح بچەسپێنن. حەوارییەکان ڕاستییەکانی ئیمانیان ڕوون دەکردەوە کە بە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ژیانی مەسیح هانی خەڵکیان لەسەر دەدا. ئامۆژگارییەکانیان بارودۆخی چەسپاندنی ئەو ڕیوایەتانەی هێنایە ئاراوە. بەڵام وتەکانی مەسیح بە شێوەیەکی تایبەتی لە ڕێی فێرکردنی ئایینیی کەنیسەی یەکەمەوە گواستراوەتەوە.)).

ئەو نووسەرانەی لەبارەی وەرگێڕانی مەسکونی قسەیان کردووە باسی قۆناغی فۆرمەڵەبوونی ئینجیلەکانیان بە شێوەیەکی تر نەکردووە کە بەم شێوەیە: کەلەپورێکی زارەکی بە کاریگەریی مژدەدانی قوتابییانی مەسیح و مژدەدەرانی تر فۆرمەڵە بوو، مانەوەی ئەو ڕەگەزانە کە بە هۆی مژدەدان و سروت و ڕێنماییەکانی ئیماندارانی لە ئینجیلەکان دەیانبینین، پاشان شیانی بەرجەستەکردنی زوو لە شێوەی نوسراوی هەندێ لە دیاریکراوەکانی ئیمان و هەندێ لە وتەکانی مەسیح و ڕیوایەتەکانی ئێش و ئازارەکانی، پاشان سوودوەرگرتنی مژدەدەرەکان لەو شێوە نوسراوە هەمەجۆرانە وەکو سوودوەرگرتنیان لە پێدراوەکانی کەلەپوری زارەکی تاوەکو دەقگەلێك بنووسن ((لەگەڵ هەموو ناوەندەکان بگونجێت و بەدەم پێویستییەکانی کەنیسەکانەوە بێت و گوزارشت لە تێڕامان لە کتێبی پیرۆز بکات و

هەڵەکان ڕاست بکاتەوەو بەم بۆنەوە وەڵامی بەڵگەو بیانووی نەیاران بداتەوە. بەم شێوەیە مـژدەدەرەکان هـەر یەکـەیان بـەپێی تێڕوانینـی خۆیـان ئینجیلیـان کۆکردۆتەوە، بەو قەدەرەی وتە زارەکییە بۆماوەکان پێیانی بەخشیوە)).

ئەم هەڵوێستە بەکۆمەڵە کە لە لایەن زیاتر لـە ١٠٠ ڕاڤـەکار (مفسـر)ی پـەیمانی نوێ لە کاسۆلیك و پرۆتسـتانت دەرچـووە، بـە شـێوەیەکی بەرچـاو جیـاوازە لـەو هێڵەی کۆڕی مەسـکونی ڤاتیکـانی دووەم لـە دەسـتورە عەقائیدییەکـەی لـەبارەی پەیامـەوە ناسـیویەتی و ناسـاندوویەتی، ئـەو دەسـتورەی لـەنێوان ١٩٦٢ و ١٩٦٥ ئامادەکراوە. پێشتر خوێنەر ئاماژەی یەکەمی بۆ ئـەم بەڵگەنامەیـەی کـۆڕی بینـی کە پەیوەستە بە پەیمانی کـۆن. کـۆڕی مەسـکونی تـوانی لـەبارەی پـەیمانی کـۆن (تەورات)ەوە ڕایبگەیەنێت کە ئەو بەشانەی لێی پێکیدێنێ ((کـەموکوڕی و شـتێك لە پووچی تێدایە))، بـەڵام هـیچ تێبینییـەکی وەکـو ئەمـەی لـەبارەی ئینجیلـەکان دانەڕشتووە...بەڵکو بە پێچەوانەوە بەڵگەنامەکە ئەوەی وتووە:

((لای هیچ مرۆڤێـك شـاراوە نییـە کـە لـەنێو هـەموو کتێبـە پیرۆزەکـان، بـەڵکو تەنانەت کتێبەکانی پەیمانی نـوێش، هـەبوون کـە بەڕاسـتی خـاوەنی پلـەی نایـاب بوون وەکو ئینجیلەکان بەو پێیەی شایەتییەکی ڕاستەقینە بوون لـەبارەی ژیـان و وانەی ڕزگارکەرەکەمان. هەمیشەو لە هەموو شوێنێك کەنیسە تا ئێسـتاش ئەسـڵی پەیامبەرانەی چوار ئینجیلەکەی پاراستووە. لە واقیعدا ئەمە ئەوەیە کە نێـردراوان بـە فـەرمانی مەسـیح بانگـەوازیان بـۆی کـردووە، ئـەوان خۆیـان و ئـەو خەڵکـەی دەوروبـەریان بـە کاریگـەریی سروشـی خـوایی بـۆ ڕۆح، نووسـراوگەلێکیان بـۆ

گواستووینەتەوە کە بنەمای ئیمانە، مەبەستمان ئینجیلە بەپێی گێڕانەوەی متی و مرقس و لوقا و یوحنا)).

((کەنیسەی دایکی پیرۆزمان هەمیشە بەدڵنیایی و بێگومانەوە گوتویەتی و دەڵێ: ئەو چوار ئینجیلە کە بە بێدوودڵی تەئکید لە مێژووییبوونیان دەکرێتەوە بە ڕاستی بە شێوەیەکی دەسپاك وتەو کردەوەکانی مەسیح بە درێژایی ژیانی لەنێو مرۆڤدا بۆ ڕزگاربوونیان تا ئەو کاتەی بۆ ئاسمان بەرزکرایەوە دەگوازێتەوە..کەواتە نووسەرە ئاینییەکان چوار ئینجیلەکە بە شێوەیەك بەرهەڤ دەکەن کە هەمیشە زانیاری ڕاستەقینەمان لەبارەی مەسیحەوە پێ بدات)).

کەواتە ئەوە تەئکیدکردنەوەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوە کە ئینجیلەکان کردەوەو وتەکانی مەسیحیان بە ئەمانەت گواستۆتەوە.

لێرەدا خوێنەر هیچ تەبابیەك لەنێوان ئەم بانگەشەیەی کۆڕی مەسکونی و بانگەشەی نووسەرەکانی پێشوو نابینێ،بەتایبەتی ئەو قسەیەی کە دەڵێ: ((پێویست ناکات ئینجیلەکان بە حەرفی وەربگیرێن چونکە نووسراوگەلێکی دۆخاوی و ململانێ هەڵگرن، نووسەرەکانیان نووسینەوەی کەلەپوری گروپەکانیان لەبارەی مەسیحەوە دیاری کردووە)). (باوکە کانینگسەر)..

کەواتە ئینجیلەکان دەقگەلێکن ((لەگەڵ هەموو ناوەندەکان دەسازێت و بەدەم پێداویستیی کەنیسەکانەوە دێت و گوزارشت لە بیرێکی نێو کتێبی پیرۆز دەکات و هەڵەکان چاك دەکاتەوە بەڵکو بەمە بەرپەرچی بەڵگەو بیانووی نەیارەکان دەداتەوە. بەمە مژدەدەرەکان کۆیان کردۆتەوەو نووسیویانەتەوە، هەر یەکێك

بەپێی تێڕوانینی تایبەتی خۆی و بەوەی کەلەپوری زارەکی پێی داون)).
(وەرگێڕانی مەسکونی بۆ پەیمانی نوێ – ئینجیل – ).

تەواو ڕوونە کە لێدوانی مەسکونی و ئەو هەڵوێستانەی ماوەیەکی نزیك لەمەوبەر وەرگیراون دەمانخەنە نێوان چەند بانگەشەیەکی ناکۆك. بە جۆرێك ناکرێ سازان بکرێ لەنێوان لێدوانی ڤاتیکانی دووەم کە دەڵێ: ئینجیلەکان بە شێوەیەکی دەسپاك کردەوەو وتەکانی مەسیحیان گواستۆتەوە، لەگەڵ بوونی چەندان ناسازی لەم دەقانەو بابەتی نامەعقوڵ و بانگەشەی پێچەوانە بۆ هەندێ بابەت کە دەبێ لێکۆڵینەوە لە دروستییان بکرێ.

بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر خوێنەر وەها تەماشای ئینجیلەکانی کرد کە تێڕوانینی تایبەتی کۆکەرەوەی کەلەپوری زارەکی کەسانێکن کە سەر بە گروپی جیاوازن، ئەگەر خوێنەر وەکو ((نووسراوگەلی دۆخاوی یان ململانێ هەڵگر)) تەماشای کردن، ئەوا واقوڕماو نابێ کاتێ لە ئینجیلەکان ئەو هەموو کەموکورییە دەبینێ کە نیشانەیە بۆ دەسکردی مرۆڤ لەم جۆرە دۆخانە. لەوانەیە ئەم کۆکەرەوەی دەقانە تەواو دڵسۆز بووبن وێڕای ئەوەی ئەوان بابەتگەلێك دەگێڕنەوە کە گومانیان لە ناڕاستی نییە. کاتێ ڕیواتگەلێکمان پێشکەش دەکەن کە ناسازو ناکۆکە لەگەڵ ڕیوایەتی نووسەرانی تر یان کاتێ ڕیوایەتگەلێك لەبارەی ژیانی مەسیح پێشکەش دەکەن بەپێی تێڕوانینێکی تەواو جیاواز لە تێڕوانینی نەیارەکانیان، ئەوەش لەبەر کۆمەڵێك هۆکاری پەیوەست بە ململانێی ئایینی نێوان گروپێك و گروپێکی تر.

بینیمان کە سیاقی مێژوویی لە وێناکردنی ئینجیلەکان لەگەڵ ئەم میتۆدەی دوایی کۆك و تەبایە، ئەو پێدراوانەی کە لەبارەی خودی دەقەکانەوە هەمانە تەواو پشتگیری ئەمە دەکات.

## ئینجیلی متی:

لە ڕیزبەندی بەشەکانی پەیمانی نوێدا، ئینجیلی متی لە نێو چوار ئینجیلەکەدا پایەی یەکەمی گرتووە. ئەوەش پایەیەکە پاساوی خۆی هەیە، چونکە ئەو ئینجیلە بە شێوەیەك درێژبۆوەی پەیمانی کۆنە: بۆ ئەوە نووسراوە تا بیسەلمێنێت کە مەسیح ((مێژووی ئیسرائیل تەواو دەکات)): ئەمەش قسەکەران لەسەر وەرگێڕانی مەسکونی دەیلێن، ئێمە لەم وەرگێڕانەدا برگەی زۆر وەردەگرین. بۆ ئەوەی متی ئەو مەبەستە بێنێتەدی هەمیشە بەڵگە بە چەند برگەیەکی پەیمانی کۆن دێنێتەوە کە ئاماژە بەوە دەکات مەسیح وەکو ئەو مەسیحە ڕەفتار دەکات کە یەهود چاوەڕێی دەکات.

ئەم ئینجیلە بە درەختی ڕەچەڵەکی مەسیح دەست پێدەکات. متی مەسیح لە ڕێی داوودەوە دەداتە پاڵ ئیبراهیم. دواتر هەڵەی ئەو دەقە دەبینین کە هەموو قسەرەکەکان لێی بێدەنگ بوون...

متی لەسەر ئەو بیرۆکەیە بەردەوام دەبێت ئەوەش بە ڕوونکردنەوەی بەردەوامی هەڵوێستی مەسیح لەبارەی یاسای یەهودی و بنەما گشتییەکانی لە نوێژو ڕۆژوو و زەکات.

مەسیح دەیەوێ یەکەمجار ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی ئاراستەی گەلەکەی بکات. ئەو بەم شێوەیە پەیامەکەی دیاری دەکات. لەگەڵ حەوارییەکانی دەدوێت: ((مەچوونە ڕێگای بتپەرستەکان، مەڕۆنە نێو شاری سامرییەکانەوە. بەڵکو شیاوترە برۆنە لای مەڕە گومڕاکانی ماڵی ئیسرائیل)) – ئینجیلی متی ئیصحاحی ١٠ ئایەتەکانی ٥ و ٦.. ((تەنها بۆ مەڕە گومڕاکانی ماڵی ئیسرائیل نێردراوم)) ئینجیلی متی ئیصحاحی ١٥ ئایەتی ٢٤..متی لە کۆتایی ئینجیلەکەیدا بە شێوەیەکی لاوەکی مژدەدانی دوازدە قوتابییەکەی مەسیح بۆ هەموو نەتەوەکان درێژ دەکاتەوە و وا دەکات مەسیح ئەم فەرمانە دەربکات: (بڕۆن و هەموو نەتەوەکان بکەنە قوتابی)). متی ئیصحاحی ٢٨ ئایەتی ١٩..بەڵام باشتر لەوە چوونە بەرەو ماڵی ئیسرائیل،، تریکۆ لەبارەی ئەم ئینجیلەوە دەڵێ: لەژێر کراسە یۆنانییەکەدا کتێبێکی تەواو یەهودی شاردراوەتەوە، هەموو شوێنەوارێکی یەهودی هەڵگرتووەو گشت سیفەتێکی تایبەتی ئەوی پێوە نووساوە.

تەنها ئەو ئیعتیبارانە ئەسڵی ئینجیلی متی دەخاتە نێو گروپی یەهودییەتی مەسیحی ((کە هەوڵ دەدات)) بەپێی وتەی د.ئە.کولمان ((ئەو پەیوەندییانە بپچڕێنێت کە بە یەهودییەتی دەبەستێتەوە، لە هەمان کات هێڵێکی بەردەوام لەگەڵ پەیمانی کۆندا بهێڵێتەوە. خاڵەکانی گرینگی و ئاوازی گشتی ئەو ئینجیلە ئاماژە بە بوونی ڕەوشێکی گرژ دەکات)).

لەوانەیە ئەم دەقە پەیوەست بووبێت بە هۆکارگەلی سیاسییەوە: داگیرکردنی فەڵەستین لەلایەن ڕۆمانەکانەوە بێگومان ئارەزووی وڵاتی داگیرکراو بۆ سەربەخۆیی گەرم دەکات، بۆیە لە خوا دەپاڕێتەوە لە بەرژەوەندی ئەو گەلە دەخالەت بکات کە لەنێو هەموو گەلاندا هەڵیبژاردووەو هەر ئەویش پاشای

گەورەیەتی کە دەتوانێ لە کاروباری مرۆڤدا ڕاستەوخۆ یارمەتی بدات هەروەکو چەندانی جاری دیکە لە مێژوودا کردوویەتی..

کەسایەتیی متی کێیە...؟ با بە ڕاشکاوی بڵێین: ئەمڕۆ ئەو قسەیە چیتر پەسندکراو نییە کە ئەو یەکێکە لە حەوارییەکانی مەسیح..وێڕای ئەوەش، کەچی (ئە.تریکۆ) لە قسەکردنی لەبارەی وەرگێڕانی پەیمانی نوێ کە لە ساڵی ١٩٦٠ بڵاوکراوەتەوە وەکو حەواری دەیخاتەڕوو..دەڵێ: ((ناوی، متی، یە، پێشتر ناوی لیڤی بووە، ئەو کاتەی مەسیح بانگهێشتی کرد بۆ ئەوەی ببێتە یەکێك لە قوتابییەکانی، لە نووسینگەی گومرگ لە کفرناحوم باجگر بوو..)). هەر ئەوەش باوەڕی باوانی کەنیسە (ئوریگین و جیرورم و ئیبیگان) بوو.بەڵام لەم سەردەمەی ئێستاماندا کەس باوەڕی بەمە نییە. لێرەدا خاڵێکی مشتومڕ هەڵنەگر هەیە ئەویش ئەوەیە کە: ئەم بنووسە یەهودی بووە، وشەکانی کتێبەکەی فەلەستینییە، بەڵام نووسینەوەکەی یۆنانییە. (ئە.کۆلمان) دەڵێ: بنووس واتە متی، قسە لەگەڵ خەڵکانێك دەکات کە ئەگەر چی بە یۆنانی دەئاخڤن بەڵام دابونەریتی یەهودی و زمانی ئارامی دەزانن..

سەبارەت بەوانەی لەبارەی وەرگێڕانی مەسکونییەوە قسەیان کردووە ئەوا ئەسڵی ئەم ئینجیلە بەم شێوەیە دەردەکەوێ:

((بە زۆری وا دەخەمڵێنرێ کە ئینجیلی متی لە سوریا یان ئەنتاکییە یان فینیقیا نووسراوە، لەم ناوچانەدا ژمارەیەکی زۆر یەهود دەژیان، دەتوانین هەست بە بوونی جەنگێك دژ بە یەهودییەتی پەرستگای ئۆرسۆزۆکسی فریزی بکەین کە لە (جامینا) لە ساڵی ٨٠ی زایینی لە کۆڕی کەنیسەیی یەهودی سەری هەڵدا. لە

سایەی ئەم بارودۆخەدا ژمارەی ئەو نووسەرانە زۆرن کە مێژووی ئینجیلی یەکەم لە سالآنی نێوان ٨٠ بۆ ٩٠ی زایینی دادەنێن یان لەوانەیە کەمێك بەر لەمە، لەم بابەتەدا ناتوانرێ بگەینە دلّنیایی تەواو، کاتێ ناوی دانەر بە دیاریکراوی نەناسراو بوو، وا چاکترە بە هەندێ هێڵی کێشراو لە خودی ئینجیلی متی واز بێنین، لەمانە: نووسەرەکە بە پیشەکەیەوە ناسراوەو شارەزای کتێبە پیرۆزەکان و کەلەپوری یەهودییەو سەرانی گەلە یەهودییەکەی دەناسێ و ڕێزیان دەگرێ ئەگەر لە قسەکردن بۆیان توندی بنوێنێ، هەروەها ئەو لە هونەری وانەبێژی و تێگەیاندنی گوێگرانی لە وتەی مەسیح لەگەڵ جەختکردنەوەی بەردەوامی لە بەرەنجامە کردەییەکانی ئامۆژگارییەکانی ئوستادە، ئەو باش لەگەڵ ئادگارەکانی یەهودییەکی بەئەدەب کە بۆتە مەسیحی کۆکە، مامۆستایەکی زیرەکە((لە گەنجینەکەیدا نوێ و کۆن دەردێنێ))، هەروەکو خودی ئینجیلەکەی ئاماژەی بەمە دەکات (ئیصحاح ١٢ ئایەتی ٥٢). ئەو وێنەیە تەواو دوورە لە وێنەی ئەو فەرمانبەرە بیرۆکراتییەی لە کفرناحوم کە مرقس و لوقا ناوی لیفی بەسەردادەبڕن کە دواتر بوویە یەکێك لە دوازدە حەوارییەکەی مەسیح.

متی بە ئازادییەکی ترسناکەوە ڕەفتار لەگەڵ دەقەکاندا دەکات. سەبارەت بە پەیمانی کۆنیش هەر تێبینی ئەوە دەکرێ کاتێ لە سەرەتای ئینجیلەکەیدا باس لە ڕەچەڵەکی مەسیح دەکات. چەند ڕیوایەتێکی بە کتێبەکەیەوە لکاندووە کە بڕواپێکردنی ئەستەمە. ئەستەمبوونی ئەو بڕواپێکردنە ئەو سیفەتەیە کە باوکە کانینگسەر لە کتێبە ئاماژە بۆکراوەکەی بەکاری دێنێ کاتێ باس لە هەستانەوەی مەسیح دەکات، مەبەست لێی بە دیاریکراوی بەشی تایبەت بە پاسەوانەکانە. نووسەر نامەعقولّییەتی چیرۆکی پاسەوانە سەربازییەکانی گۆڕەکە دەردەخات

((ئەو سەربازە بتپەرستانەی ڕاپۆرتەکانیان بۆ سەرۆکەکانیان نابەن بەڵکو بۆ ئەو گەورە کاهینانە دەبەن کە بەرتیلیان پێ دەدەن تاوەکو درۆودەلەسە هەڵببەستن)). لەگەڵ ئەمەشدا زیاتر دەڵێ: ((پێویستە وریای گاڵتەپێکردن بین، چونکە نیازی متی نیازێکە شیاوی ڕێزو بەگەورە گرتن، بە جۆرێك ئەو بە شێوازی تایبەتی خۆی پێدراوێکی کۆن لە کەلەپوری زارەکی دەخاتە نێو دانراوە نووسراوەکەیەوە. ئەمەش دەرهێنانێکی ئەکتەرانەیە شیاوی فیلمێکە وەکو فیلمی ((مەسیح ئەستێرەیەکی سینەماییە))...(فیلمێکی ئەمریکاییە مێژووی مەسیح ناشیرین دەکات).

لەبیرمان بێت کە ئەم بڕیارە بەسەر (متی)دا لە لایەن زانایەکی لاهوتی دیارەوە دراوە، ئەو ئوستادە لە پەیمانگەی کاسۆلیکی لە پاریس.

متی لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی سەردەمی مەسیحدا نموونەیەکی تری خەیاڵە فراوانەکەی دەخاتەڕوو و دەڵێ:

((کاتێ پەردەی هەیکەل لە سەرەوە بۆ خوارێ بووە دوو پارچە. زەوی لەرزی و بەردەکان قڵیشان. گۆڕەکان کرانەوەو زۆرێك لە جەستەگەلی قەدیسە نووستووەکان هەستان. دوای هەستانەوەی (مەسیح) لە گۆڕەکانیان هاتنەدەرێ و چوونە نێو شارە پیرۆزەکەوەو بۆ زۆرێك دەرکەوتن)).

ئەو بڕگەیەی ئینجیلی متی (ئیصحاحی ٢٧ ئایەتەکانی ٥١ بۆ ٥٣) وێنەی لە ئینجیلەکانی تردا نییە. نابینین چۆن جەستەی قەدیسەکان لە کاتی مردنی مەسیح هەستاون (واتە ڕۆژی شەممە هەروەکو ئینجیلەکان وا دەڵێن)و تەنها دوای

هەستانەوەی عیسا لە گۆڕەکانیان بێنەدەرێ(واتە بەرەبەیانی شەممە بەپێی هەمان سەرچاوە).

لەوانەیە ئینجیلی متی کە ئەو قسەیەی لەخۆگرتووە لەنێو هەموو ئەو وتانەی کتێبەکە داویەتیە پاڵ مەسیح نامەعقوڵتر بێت..متی ڕووداوی نیشانە(موعجیزە)ی یونس بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە(ئیصحاحی ١٢ – ئایەتی ٣٨ تاوەکو ٤٠):

مەسیح لەنێو کۆمەڵێك لە نووسەرو فەریسییەکاندا بەو وشانە لەگەڵی دەدوێن: ئەی مامۆستا دەمانەوێ نیشانە(موعجیزە)یەکت لێ ببینین)).

مەسیح وەڵامی دانەوە: خەڵکێکی خراپ و لادەر داوای نیشانە دەکەن! هیچ نیشانەیەکی پێ نادرێ تەنها موعجیزەی یونس پێغەمبەر نەبێت. چونکە یونس سێ ڕۆژو سێ شەو لەناو سکی نەهەنگدا بوو، کوڕی مرۆڤیش بەم شێوەیە سێ ڕۆژو سێ شەو لە ناخی زەویدا دەبێت)).

مەسیح ڕایدەگەیەنێ کە ئەو سێ ڕۆژو سێ شەو لە سکی زەویدا دەمێنێتەوە. بەڵام متی، لەگەڵیدا لوقاو مرقسیش مردن و شاردنەوەی مەسیح بە ڕۆژێك بەر لە شەممە دیاری دەکەن، ئەمەش بە دڵنیاییەوە مانەوە لە زەویدا دەکاتە سێ ڕۆژ(دەقە یۆنانییەکە وا دەڵێ).

بەڵام ئەم ماوە زەمەنییە تەنها دوو شەو لەخۆدەگرێ نەك سێ شەو (دەقە یۆنانییەکە وا دەڵێ).

قسەکەران لەبارەی ئینجیلەکانەوە زۆربەی کات لە بەردەم ئەم ڕووداوەدا بێدەنگ دەبن. لەگەڵ ئەمەشدا باوکە ڕۆجی ئەم کارە بە نامەعقوڵ دەردەخات و

تێبینی دەکات کە مەسیح ((تەنها سێ ڕۆژ لـە گۆڕدا ماوەتـەوە)) تـەنها ڕۆژێکی تەواوو دوو شەو. زیاتر دەڵێ: ((گوزارشتەکە ڕەقوتەقەو جگە لە سێ ڕۆژ شـتێکی تر پیشان نادات))، ئەوەی بەڕاستی مایەی خەمە تێبینی دەکەین کە قسەکەران نادەبەزن بۆ بەکارهێنانی ئەو بەڵگەو بیانووانە کە هیچ شـتێکی ئیجـابی نـاڵێ، لـە کاتێکدا عەقڵ بەوە ئاو دەخواتەوە کە ئامـاژە بکرێ بـەوەی نموونـەی ئـەو هەڵـە گەورانە لەوانەیە بەهۆی هەڵەی یەکێك لەوانە بێت کە دەقەکەی نووسیوەتەوە.

زێدەباری ئەو بابەتە نامەعقوڵانە یەکەم و بەر لە هەموو شتێك ئەوەی ئینجیلی (متـی)ی پـێ دەناسـرێتەوە ئەوەیـە کـە ئـەو ئینجیلـی تائیفـەی یـەهودی مەسیحییە..لـە ڕوانگـەی مێـژووی یـەهودی مەسـیحی ئینجیلـی متـی گرینگییـەکی گەورەی هەیە.

## ئینجیلی مرقس:

ئـەو کـورتترینی چـوار ئینجیلەکەیـە. هـەروەها کۆنترینیشـیانە. بـەڵام کتێبـی هیچـکام لـە حەوارییـەکان نییـە: کتێبێکـە قوتـابی یـەکێك لـە حەوارییـەکان نووسیویەتیەوە.

(ئە.کۆلمان) نووسیویەتی: مرقس بە قوتابی مەسیح دانانرێ. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئاماژە بۆ ئەوانە دەکات کە گومـان لـە دانـەپاڵی ئـەو ئینجیلـە بـۆ مـرقس دەکـەن ((لوقا و متی ئەو ئینجیلەیان بەکارنەدەهێنا ئەگەر نەیانزانیبا کە بەڕاستی بـەپێی ڕێنماییـەکانی یـەکێك لـە حەوارییـەکان دانـراوە)). بـەڵام ئـەم بەڵگـەو بیـانووە بەکلاکەرەوە نییە. (ئە.کۆلمان) بۆ جەختکردنەوە لـەو تێبینیانـەی هەیـەتی بـاس

لەو ئاماژە زۆرانەی پەیمانی نوێ دەکات کە باس لە پیاوێك دەکات ناوی یوحنایەو بە مرقس ناودەبرێ. بەڵام ئەم بڕگانە باسی دانەری ئینجیل ناکەن تەنانەت خودی دەقی مرقسیش ئاماژە بۆ هیچ دانەرێك ناکات.

کەمی زانیاریی تایبەت بەم خاڵە وای لە قسەکەران کردووە دەست بە چەند وردەکارییەکی وەهمییەوە بگرن وەکو ئەوەی ڕەگەزی بایەخدار بن، وەکو ئەمە: ((بە بیانووی ئەوەی مرقس تاکە مژدەدەر بووە کە لە ڕیواتەکەیدا لەبارەی ئێشوئازارەکانی مەسیحەوە ڕووداوی گەنجێکی گێڕاوەتەوە کە شەڕواڵێکی لەبەردا بووە، کاتێ هەوڵ دراوە دەسگیربکرێ شەڕواڵەکەی بەجێهێشتووەو بە ڕووتی ڕایکردووە)). مرقس ئیصحاحی ١٤- ئایەتی ٥١و٥٢.. هەندێك لەو ڕووداوەدا وایان هەڵێنجاوە کە لەوانەیە ئەو گەنجە مرقس بووبێت ((ئەو قوتابییە ئەمینەی هەوڵ دەدات شوێنی گەورەکەی بکەوێ))، (لە وەرگێڕانی مەسکونییەوە). بە ڕای هەندێکی تریش خوێنەر دەتوانێ بە هۆی ئەو یادە شەخسییەوە نیشانەیەك بۆ ڕاستودروستی و ڕواندنی نەزانراو ببینێ..دەسەلمێنێ کە خاوەنەکەی شایەتێکی بینەر بووە)). (ئە.کۆلمان).

ئەم نووسەرە وادەبینێ کە ((پێکهاتەی زۆر ڕستە هەیە کە پاڵپشتی لەو گریمانەیە دەکات کە دەڵێ دانەری ئەم ئینجیلە بە ئەسڵ یەهودییە))، بەڵام بوونی ڕێبازی زمانەوانیی لاتینی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئینجیلەکەی لە ڕۆما نووسیبێت. ((زێدەباری ئەمەش ڕووی گوتاری لەو مەسیحییانە دەکات کە لە فەڵەستین ناژین و بایەخ بە ڕوونکردنەوەی ئەو گوزارشتە ئارامییانە دەدات کە لە قسەکردن بۆیان بەکاریدێنێ)).

له واقیعدا، کەلەپور ویستی مرقس بکاته هاوڕێی پەترۆس له ڕۆما، ئەوەش بە پشتبەستن به کۆتایی نامەکەی پەترۆسی یەکەم(ئەگەر بەڕاستی ئەمەی دوایی نووسەری ئەم نامەیە بێت). دەوترێ پەترۆس بۆ ئەوانەی نامەکەی ئاراسته کردوون نووسیویەتی: ((کۆمەڵی هەڵبژێردراو له بابل و هەروەها مرقسی براشم سڵاوتان لێ دەکەن)). ((بابل واته لەوانەیە ڕۆما))..ئەوه له کۆمێنتەکانی سەر وەرگێڕانی مەسکونی دەخوێنینەوە، لێرەوە هەندێك وا باوەڕ دەکەن مافی خۆیەتی ئەوە هەڵێنجێت کە ئەو مرقسەی لەگەڵ پەترۆسی ڕۆما بووە مژدەدەرە..ئایا هۆکارێکی لەم جۆرەیه پاڵی به پاپیاس ئوسقوفی هیراپۆلس له ساڵی ١٥٠ی زایینی ناوه تاوەکو ئینجیلی ئاماژەکراو بداته پاڵ مرقس کە لەبارەیەوە دەڵێ: ئەو ((وەرگێڕی پەترۆس بووە))و هەروەها یاریدەدەری پۆڵس بووە...؟

لەم ڕیوایەتەوە وا دەردەکەوێ کە ئینجیلی مرقس دوای بەترۆس نووسراوەتەوە، واته له نێوان ساڵانی ٦٥ و ٧٠ی زایینی بەپێی وەرگێڕانی مەسکونی، له دەوروبەری ساڵی ٧٠ش بەپێی بۆچوونی (ئە.کۆلمان).

دەقەکە خۆی کەموکوڕییەکی سەرەتایی بێ مشتومڕ له خۆیدا دەردەخات: بە بێ هیچ بایەخدانێك بە یەك بە دوایداهاتنی ڕووداوەکان نووسراوەتەوە. ئەم ئینجیله لەسەرەتای ڕیوایەتەکەیدا (إصحاح ١ ئایەتەکانی ١٦ تا ٢٠) چیرۆکی ئەو چوار ڕاوچییەی داناوه کە مەسیح داوایان لێ دەکات شوێنی بکەون و بە سادەیی پێیان دەبێژێت: ((لەمەودوا دەبنه ڕاوکەری خەڵك)) له

کاتێکدا ئەوان نایناسن. زێدەباری ئەوەش ئەو مژدەدەرە تەواو لە مەعقولییەت هەژارە.

هەروەکو باوکە ڕۆجی دەڵێ، مرقس نووسەرێکی زیرەك نەبووە و لە هەموو مژدەدەرەکان شپرو وپرتر بووە..

هەرگیز نازانێت چۆن چیرۆکێك بنووسێتەوە، قسەکەر بۆ پاڵپشتیکردنی تێبینییەکەی باسی برگەیەك دەگێڕێتەوە کە پەیوەستە بە دوازدە حەوارییەکە..ئەم برگەیە دەڵێ:

((پاشان سەرکەوت بۆ سەر چیاکەو ئەوانەی بانگ کرد کە دەیویستن و ئەوانیش چوون بۆ لای..دوازدەی دامەزراندن تاوەکو لەگەڵیدا بن و بۆ ئامۆژگاریکردن بیاننێرێت و دەسەڵاتی دەرکردنی شەیتانەکانیان هەبێت. کردیە دوازدەو ناوی بەتروس خستە بەر گوێیان.)) (مرقس (إصحاح ٣ ئایەتەکانی ١٣ تا ١٦).

سەبارەت بە هەندێ ڕووداو وەکو ئەو چیرۆکەی پێغەمبەر یونس کە پێشتر باسمان کرد ئینجیلی مرقس لەگەڵ هەردوو ئینجیلی متی و لوقا ناتەبایە. لەمە زیاتریش بە بۆنەی ئەو موعجیزانەی مەسیح لە کاتی پێغەمبەرایەتییدا بە مرۆڤی نیشان دەدات، مرقس حەکایەتێك دەگێڕێتەوە کە جێی باوەڕکردن نییە.(إصحاح ٨ ئایەتەکانی ١١و ١٢) دەڵێن:

((فەریسییەکان هاتن و دەستیان کرد بە گفتوگۆ لەگەڵ مەسیح، بۆ ئەوەی تووشی تەڵەزگەیەکی بکەن داوای موعجیزەیەکیان لە ئاسمان لێ کرد، مەسیحیش هەناسەیەکی بەقوڵی هەڵکێشاو گوتی: بۆچی ئەم نەوەیە(جیل) داوای موعجیزەو

نیشانە دەكات؟ بەڕاستی پێتان دەڵێم: ئەم نەوەیە هیچ نیشانەیەكی پێنادرێت ((پاشان بەجێی هێشتن و چووە سەر كەشتییەكە بۆ ئەوەی بچێتە بەرەكەی تر.)).

گومانی تێدا نییە كە ئەوە جەختكردنەوەیەكە لەلایەن خودی مەسیحەوە كە نیازی نەبووە هیچ كارێك كە بە ناسروشتی بێتە بەرچاو ئەنجام بدات.. لەسەر ئەوەش ئەوانەی لەسەر وەرگێڕانی مەسكونی قسەیان كردووە كاتێ لە ڕاگەیاندنی لوقا سەرسام دەبن سەبارەت بەوەی كە مەسیح تەنها یەك نیشانە دەدات بە دەستەوە، ئایەتی یونس(تەماشای ئینجیلی متی بكە)، لە هەمانكات بڕیاری بوونی (پارادۆكس – مفارقە)یەك دەدەن لە نێوان وتەی مرقس كە (ئەو نەوەیە هیچ نیشانەیەكی پێنادرێ) لەگەڵ ئەو موعجیزانەی مەسیح وەكو نیشانە پێشكەشی دەكات((ئینجیلی لوقا إصحاح ٧ ئایەتی ٢٢ و إصحاح ١١ ئایەتی ٢٠)).

ئەگەر هەموو ئینجیلی مرقس وەكو ئینجیلێكی كەنیسەیی دانی پێدابنرێ ئەوا ئەمە لەوە كەم ناكاتەوە كە نووسەرە نوێیەكان كۆتاییەكەی (إصحاح ١٦ ئایەتەكانی ٩ تا ١٩) وەكو دانراوێكی زیادكراو دادەنێن: وەرگێڕانی مەسكونی بە شێوەیەكی ڕوون ئاماژە بۆ ئەمە دەكات.

ئەو كۆتاییە بوونی نییە لە دوو كۆنترین دەسنووسی تەواوی ئەو ئینجیلانەی ناسراون بە:

(Codex Vaticanus , Codex sinaitikus) ،، ئەو دوانە مێژووەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چوارەم. لە بارەوە (ئە.كۆلمان) دەڵێت: ((هەندێ دەسنووسی یۆنانی و هەندێ دەقی تر كۆتاییەكیان لەبارەی دەركەوتنی

مەسیحەوە بۆ ئەم شوێنە زیادکردووە کە پەیوەندی بە مرقسەوە نییەو لە ئینجیلەکانی تر دەرهێنراون)). لە ڕاستیدا ڕیوایەتەکانی ئەم کۆتاییە زیادکراوە زۆرن. لە دەقەکان جارێك ڕیوایەتێکی درێژ دەبینین و، جارێکی تر ڕیوایەتێکی کورت( وەرگێڕانی مەسکونی هەردوو ڕیوایەتی تێدایە)، جارێکی تر ڕیوایەتێکی درێژ لەگەڵ پەراوێزێك دەبینین، جارێکی دیکەش هەردوو ڕیوایەت پێکەوە دەبینین.

باوکە کانینگسەر بەم شێوەیە لەبارەی ئەم کۆتاییەوە دەدوێت: ((دەبێ لە کاتی پێشوازیکردنی ڕەسمی (یان لە کاتی بڵاوکردنەوەی لەنێو خەڵکیدا) ئایەتەکانی کۆتایی کتێبی مرقس سڕابێتەوە، نە متی و نە لوقا، تەنانەت یوحناش بەو بەشە ونبووەیان نەزانیوە. لەگەڵ ئەمەشدا کەلێنەکە بەرگەی نەدەگیرا. دوای ماوەیەکی زۆر لەمەو دوای ئەوەی چەند نووسراوێکی هاوشێوەی متی و لوقا و یوحنا کەوتە بەردەستان ئینجا کۆتاییەکی بەڕێز بۆ مرقس دروست کراو ئەوەش بە یارمەتی وەرگرتن بە چەند توخمێك لێرەو لەوێی بەردەستی مژدەدەرەکانی تر. ئاسانیشە بڕینی ئەم مەتەڵەی کۆتایی مرقس بەدرێژی دەسنیشان بکەین(إصحاح ١٦ ئایەتەکانی ٩ تا ٢٠). ئەوەش ڕێ دەدات بە گەڵاڵەکردنی بیرۆکەیەکی ماددی لەبارەی ئەو ئازادییەی بە جۆرێکی ئەدەبی تایبەت بە وتەی ئینجیلانە تاوەکو سەرەتاکانی سەدەی دووەم باس دەکرا)).

ئای چ دانپێنانێکی ئاشکرایە بە بوونی ئەو دەسکاریکردنانەی مرۆڤەکان بەسەر دەقە پیرۆزەکانیاندا هێناوە ! ئای چ دانپێنانێکە ئەوەی کە ڕامان لەو جیهانە گەورەیەی لاهوتی پێشکەشمانی دەکات !

## ئینجیلی لوقا

ئەو لە بۆچوونی ئە.کۆلمان (نووسەری ساڵیانە) و لە تێڕوانینی کانینگسەریش (ڕۆماننووسێکی ڕاستەقینە)یە. لەو پێشەکییەی ئاراستەی (ساوفیلس)ی کردووە لوقا خۆی وریامان دەکاتەوە کە ئەو دوای کەسانی تر کە چیرۆکیان لەبارەی مەسیحەوە نووسیوە، ئەویش لەلایەن خۆیەوە چیرۆکێك لەبارەی هەمان ئەو ڕووداوانە دەنووسێت، بۆ ئەمەش چیرۆك و زانیاری شایەتعەیانەکان و ئەو زانیارییانەی لە ئامۆژگاری حەوارییەکان بەدەستی گەیشتووە بەکاردێنێ — ئەوەش واتای ئەوەیە خۆی لە شایەتعەیانەکان نەبووە— . کەواتە مەبەست کتێبێکی مەنهەجییەو لوقا بەم شێوەیە باسی دەکات: ((ئەگەر زۆر کەس چیرۆکیان لەبارەی ئەو ڕووداوانەی قەوماون داناوە، هەروەکو ئەوانەی لە سەرەتاوە شایەتعەیان و خزمەتکاری وشە بوون، منیش هاتمە سەر ئەوە کە ئەگەر لە سەرەتاوە بە وردی بە دوای هەموو شتێکدا چووم یەك بە دوای یەك بۆت بنووسم ئەی ساوفیلسی بەڕێز تاوەکو دروستی ئەو قسەیەی زانیومە تۆش بیزانیت)).

لە دێڕەکانی یەکەمەوەڕا خوێنەر دەتوانێت لوقا لە مرقس جیا بکاتەوە، ((ئەوە نووسەرە بێسەروبەرە)) کە لەبارەی ئینیجلەکەیەوە دواین، ئینجیلی لوقا کارێکی ئەدەبییە، لەوبارەوە مشتومڕ هەڵناگرێ، بە زمانێکی یۆنانی کلاسیکی باڵا کە لە وشەی کرچوکاڵ خاڵییە نووسراوە.

لوقا ئەدیبێکی بتپەرست بوو بڕوای بە مەسیحییەت هێنا. ئاراستەی بەرامبەر یەهودیش ڕاستەوخۆ ڕوون دەبێتەوە. هەروەکو ئە.کۆلمان ئاماژەی بۆ دەکات

لوقا لە ڕیوایەتەکەیدا زۆرێك لەو ئایەتە یەهودییانەی لای مرقس دەسڕێتەوەو ئەو وتانەی مەسیح دەردەخات کە لە ڕوبەڕو بوونەوەی کوفری یەهود و پەیوەندیی باشی لەگەڵ سامرییەکان کە یەهود دەیانبوغزێنێت گوتوویەتی، ئەمە لە کاتێکدا متی لە ئینجیلەکەیدا دەڵێ: مەسیح داوای لە حەوارییەکانی کرد لە سامرییەکان دوورکەونەوە. ئەوەش نموونەیەکی ڕوونە لەنێو زۆرێك لەو نموونانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی مژدەدەرەکان ئەو وتانە دەخەنە سەر زاری مەسیح کە لەگەڵ تێڕوانینە شەخسییەکانیان دەگونجێت، بێگومان ئەوان ئەمانە بە قەناعەتێکی دڵسۆزانەوە دەکەن، ئەوان لە وتەکانی مەسیح ئەو ڕیواتانەمان دەدەنێ کە لەگەڵ تێڕوانینی ئەو دەستەو تائیفانە دەگونجێت کە خۆیان سەر بەوانن. کەواتە لەبەردەم شتگەلێکی ڕوونی لەم چەشنەدا چۆن دەکرێ نکوڵی لەوە بکرێ کە ئینجیلەکان ((نووسراوگەلێکی نەیارانە)) یان ((بارودۆخاوی)) نین هەروەکو پێشتر وترا؟ بەراوردکردن لە نێوان ڕەوتی گشتیی ئینجیلی متی و ئینجیلی لوقا لەو بارەوە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەمان بەدەستەوە دەدات.

لوقا کێیە؟ هەندێك ویستوویانە لە ڕێی ئەو کەسایەتییە پزیشکەی ناوی لوقای هەڵگرتووەو پۆڵس لە هەندێ پەیامەکانیدا باسی دەکات، ناسنامەی ئەو کەسە بناسن. وەرگێڕانی مەسکونی تێبینی دەکات کە ((هەندێك جەخت دەکەنەوە لە پیشەی پزیشکایەتیی دانەر، ئەوەش بەهۆی وردەکاری لە وەسفکردنی نەخۆشییەکان)). ئەمەش لێکدانەوەیەکە زۆر زیادەڕەوی تێدا کراوە. ئەگەر وردەکاریمان بوێت، لوقا (وەسفگەل)ی لەو جۆرە بەدەستەوە نادات، ((ئەو وشانەی بەکاریدێنێ هەر ئەو وشانەیە کە مرۆڤێکی ڕۆشنبیری ئەم سەردەمە

ـەکاری دەبات)). لوقایەك هەیە کە هاوڕێیەتیی پۆڵسی کردووە لـە گەشـتەکانیدا. ئـایا هەمان ئەو کەسەیە؟ ئە.کۆلمان باوەڕی وایە.

دەکرێ مێژووی ئینجیلی لوقا بە تێڕوانین لە چەند هۆکارێك بخەملێنین. لوقا پشتی بە هەردوو ئینجیلی مرقس و متی بەستووە. هەروەکو تەرجەمەی مەسکونی ـەلێت، پێدەچێت لەو سەردەمەدا ژیابێت کە تێیدا سوپای تیتوس لە ساڵی ٧٠ ی زایینی گەمارۆی شاری قودسی داو وێرانی کرد. بەم پێیە دەبێ ئەم ئینجیلـە دوای ئـەم مێـژووە بێـت. ڕەخـەگرانی ئێسـتا بـە زۆری مێـژووی نووسـینەوەی لـەنێوان ساڵانی ٨٠ — ٩٠ی زایینی دیاری دەکەن. هەندێ بنووسی تر هەن بـۆ مێژوویـەکی کۆنتری دەگەڕێننەوە.

زۆرێك لە گێڕانەوەکانی ئینجیلی لوقا جیاوازیگەلی گرینگی لەگەڵ گێڕانـەوەکانی پێش خۆی هەیـە. پێشـتر ئاماژەیـەکمان پێـدا. تەرجەمـەی مەسـکونی لـە لاپـەڕە (١٨١) بەدواوە ئاماژەی پێ دەدات.

(ئە.کۆلمـان) لـە لاپـەڕە (١٨)ی کتێبـی (پـەیمانی نـوێ) هەنـدێ ڕیوایـەت لـە ئینجیلی لوقـاوە بـاس دەکـات کـە لـە ئینجیلـەکانی تـردا نییـە، مەبەسـتیش لێـی خاڵگەلی وردەکارییانە نییە.

گێڕانـەوەکانی تایبـەت بـە منـداڵێتیی مەسـیح لـە ئینجیلـی لوقـا تایبەتـە بـەم ئینجیلە. متی بە شێوەیەکی جیاواز لە لوقا بـاس لـە منـداڵێتیی مەسـیح دەکـات. کەچی مرقس وشەیەکی لەبارەوە ناڵێت.

هەریەك لە متی و لوقـا ڕەچـەڵەکی جیـاوازی مەسـیح بەدەسـتەوە دەدەن. لـە تێڕوانیی زانستییەوە،ناسازیی نێوانیان گرینگەو نامەعقوڵییەکە گەورەیە بە جۆرێك

شیاوی ئەوەیە لێرەدا بەشێکی تایبەت بۆ ئەم بابەتە تەرخان بکرێت. دەکرێ لەوە تێبگەین کە لەبەرئەوەی متی گوتاری ئاراستەی یەهود دەکات بۆیە درەختی ڕەچەڵەکی مەسیح بە ئیبراهیم دەست پێدەکات و بە داوود تێدەپەڕێ، بەڵام لوقا کە بتپەرستێك بوو باوەڕی بە مەسیحییەت هێنا، گرینگی بەوە دەدات کە ڕەگوڕیشەی ئەم درەختە لەوە دوورتر ببات. بەڵام خوێنەر دەبینێ کە هەردووکیان لە داوودەوە ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە.

لە لایەکی ترەوە، پەیامی مەسیح لە چەندان خاڵی زۆر بە شێوەیەکی جیاواز لەلایەن هەریەك لە لوقا و متی و مرقس گێڕدراوەتەوە.

دامەزراندنی نهێنیی قوربانیی پیرۆز بە لای مەسیحییەکانەوە ڕووداوێکی گرینگی سەرەکییە، لە لوقاوە بۆ مژدەدەرەکانی تر هەمەچەشن و جۆراوجۆرە. باوکە ڕۆجی لە کتێبەکەیدا ((پێشەکییەك بۆ ئینجل)) لاپەڕە (٧٥) تێبینی ئەوە دەخاتەڕوو کە ئەو وشانەی ئینجیلی لوقا (اصحاح ٢٢ ئایەتەکانی ١٩ تا ٢٤) نهێنیی قوربانیی پیرۆز جیاوازە لەوەی لە ئینجیلی (متی)دا دەیبینین (اصحاح ٢٦ ئایەتەکانی ٢٦ تا ٢٩)، لەوەی ئینجیلی مرقسیش جیاوازە (اصحاح ١٣ ئایەتەکانی ٢٢ تا ٢٤)، لەم دوانەی دوایی بە نزیکەی هاوڕێکە..((بە پێچەوانەوە، ئەو شێوەیەی لوقا دەیگوازێتەوە زۆر نزیکە لەوەی پۆڵس باسی دەکات.)) (پەیامی یەکەم بۆ خەڵکی کۆرنسە، اصحاح ١١ ئایەتەکانی ٢٣ تا ٢٥).

هەروەکو بینیمان لوقا لە ئینجیلەکەیدا لەبارەی هەڵکشانی مەسیحەوە قسەیەك دەڵێ کە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە (کارەکانی نێردراوان)دا دەیڵێ، ئەمەی دواییان تەواوکەری پەیمانی نوێیەو پسپۆڕان سەلماندوویانە کە لوقا بنووسیەتی. ئەو لە

ئینجیلەکەیدا ڕۆژی هەڵکشانی مەسیح بە ڕۆژی (فصح) دیاری دەکات بەڵام لە (کارەکانی نێردراوان) بە چل ڕۆژ دوای ئەمە وەپاشی دەخات...ئێمە دەزانین ئەو ناسازییە، لێکدەرەوە مەسیحییەکانی بەرەو چ لێدوانێکی سەیرو ئەنتیکە بردووە.

بەڵام ئەو لێدواندەرانەی بابەتیبوونیان بە لاوە گرینگە ناچارن دانی پێدا بنێن، هەروەکو ئەو لێدواندەرانەی بە گشتی لەبارەی وەرگێڕانی مەسکونییەوە قسەیان کردووە بەوەی کە ((بایەخپێدانی یەکەم (لای لوقا) وەسفکردنی بابەتەکان بە وردەکارییە مادییەکانییەوە نییە..)) باوکە کانینگسەر گێڕانەوەکانی (کارەکانی نێردراوان) کە لە دانراوی لوقایە بەراورد دەکات بە گێڕانەوەکانی بابەتی هاوشێوە لەلای پۆڵس لەبارەی مەسیح دوای هەستانەوەی و ئەم رایە لەبارەی لوقاوە پێشکەش دەکات: ((لوقا لە هەر چوار بنووسەکەی ئینجیلەکان هەست ناسکترەو نارەزوومەندتری ئەدەبە، ئەو هەموو سیفەتێکی ڕۆماننووسی ڕاستەقینەی تێدایە.))..

## ئینجیلی یوحنا:

ئینجیلی یوحنا زۆر لە سێ ئینجیلەکەی تر جیاوازە، تا ئاستێك باوکە ڕۆجی لە کتێبەکەیدا (پێشەکییەك بۆ ئینجیل)، دوای ئەوەی لەبارەی ئینجیلەکانی ترەوە دەدوێ، لەبارەی ئەم ئینجیلەی چوارەمەوە دەڵێ: (ئەو جیهانێکی ترە). لە واقیعیشدا کتێبێکی تەواو جیاوازە: لە ڕیزبەندی و هەڵبژاردنی بابەتەکان و گێڕانەوەو وتارەکاندا جیاوازە، جیاوازیی شێوازو جوگرافیاو مێژوی تایبەت بە بەدوایەکداهاتنی کاتی ڕووداوەکان تێدایە، بەڵکو لە ئاسۆکانی لاهوتییش جیاوازی

لەخۆگۆتووە(ئە.کۆلمان). وتەکانی مەسیح بە شێوەیەکی جیاواز لە لای هەر یەکە لە یوحناو مژدەدەرەکانی ترەوە دەهێنرێنەوە: لەم بارەوە باوکە ڕۆجی قامك بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە لە کاتێکدا سێ ئینجیلە هاوسازەکە وتەکانی مەسیح لە شێوازی ((داچڵەکێنەر، زۆر نزیکە لە شێوازی زارەکی))دێننەوە، کەچی هەموو شتێك لای یوحنا ملکەچی تێڕامانە تا ئاستێك ((دەتوانین هەندێ کات بپرسین ئاخۆ ئەوە هێشتا مەسیحە دەپەیڤێت یان وتەکانی بە شێوەیەکی ناهەست بە کاریگەریی تێڕامانەکانی ئەم مژدەدەرەوە دێتە سەر؟)).

دانەر کێیە؟ پرسەکە شیاوی مشتومڕێکی زۆرە، لەم بارەوە ڕاوبۆچوونی زۆر جۆراوجۆر خراوەتە ڕوو.

(ئە.تریکۆ و باوکە ڕۆجی) لەوانەن کە هیچ گومانێکیان لەوەدا نییە کە: ئینجیل لە ڕوانگەی ئەوانەوە کتێبی شایەت عەیانێکە، دانەریش یوحنا کوڕی زبیدی و برای جاکە، ئەو مژدەدەرەیە کە وردەکاری زۆری لەبارەوە دەزانرێ و لە کتێبە سادەو گشتییەکان دەخرێتەڕوو، ئایکۆنە میللییەکان وای وێنا دەکەن کە بە تەنیشت مەسیحەوە وەستاوە هاوچەشنی دوا ئێوارەی بەر لە ئازارەکان، کێ خەیاڵی بۆ ئەوە دەچێت کە ئینجیلی یوحنا دانراوی یوحنای حەواری کە وێنەی بەم ڕادەیە لای خەڵکی ڕەشۆکی بڵاوە نییە؟

زۆر درەنگ نووسینەوەی ئەو ئیجیلی چوارەمە نابێتە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە دژ بەو هەڵوێستەی هەندێك دەیگرنەبەر، کە باوەڕ وایە دوا داڕشتەی ئینجیلەکە لە نزیکی کۆتاییی سەدەی یەکەم نووسراوەتەوە.

دیاریکردنی مێژووەکەی بە شەست ساڵ دوای مەسیح شتێکە دەگونجێ لەگەڵ بوونی حەوارییەکی تەمەن بچووك لە سەردەمی مەسیح کە نزیکەی سەت ساڵێك ژیابێت.

باوە کانینگسەر لە لێتوێژینەوەکەی لەبارەی قیامەت، دەگاتە ئەو ئاکامەی کە جگە لە پۆڵس هیچ بنووسێکی پەیمانی نوێ (ئینجیل) لە ئارادا نییە، پۆڵس دەتوانێ سیفەتی شایەتێکی بەچاودیتووی هەستانەوەی مەسیح بداتە پاڵ خۆی. وێڕای ئەوەش یۆحەننا دەرکەوتنی مەسیح بۆ حەوارییەکان دوای هەستانەوەی دەگێڕێتەوە کە ئەو خۆی یەکێك بووە لەوان و جگە لە تۆما هەموویان پێکەوە بوون (الاصحاح ٢٠ — ئایەتەکانی ١٩ تاوەکو ٢٤) پاشان دوای هەشت ڕۆژ جارێکی تر بۆ هەموو حەوارییەکان دەرکەوتەوە.

(ئەی.کولمان) لە کتێبەکەیدا (پەیمانی نوێ) سەبارەت بەو بابەتە هەڵوێستێکی تایبەت نانوێنێ. هەروەکو وەرگێڕانی مەسکونی کتێبی پیرۆز وەها دیار دەکات کە زۆرینەی ڕەخنەگران ئەو گریمانەیە وەرناگرن کە دەڵێ یۆحەننا خۆی نووسیویەتیەوە ئەگەرچی وێڕای هەموو شتەکان ئەم ئەگەرە دوور نییە. بەڵام هەموو شتێك وا دەکات باوەڕ بکەیت کە ئەو دەقە بڵاوکراوەیەی ئێستا جێدەستی زیاتر لە بنووسێکی پێوە دیارە: ((ئەگەر هەیە ئینیجیل بەو شێوەیەی ئێستا لەبەردەستماندایە لە ڕێی قوتابییانی دانەر بڵاوبووبێتەوە، ئەو قوتابییانە الاصحاحی ٢١ و بێگومان هەندێ پەراوێزیشیان (وەکو ٤ ، ٢ هەروەها لەوانەیە ١،٤ — ٤٤،٤ — ٣٧،٧ ب — ٢،١١ — ١٣،١٩)یان بۆ زیاد کردبێت. هەمووان لەسەر داننان بەوەی کە ئەو دەقە ئەسڵەکەی نەزانراوە کۆکن و دواتر پێوەی لکێنراوە (ئەگەرچی خراوەتە پاڵ کتێبی پیرۆز کە لە لایەن کەنیسەوە دانی

پێدانراوە)..)). برگەی ١٩ تا ٣٥ وەکو (واژۆی شایەت عەیان)ێك دەردەکەوێ. (ئەی.کۆلمان)، لە هەموو ئینجیلی یۆحەننادا ئەوە تاکە واژۆی ئاشکرایە، بەڵام قسەبێژان لەوبارەوە باوەڕیان وایە کە بێگومان ئەوە برگەیەکی زیادە.

(ئەی.کۆلمان) بڕوای وایە کە لەم ئینجیلەدا زیادکردنەکانی دواتر ڕوونە: وەکو الاصحاح ٢١.. بڕوای کە ئەوە کاری یەکێك لە قوتابییەکانی بێت((هەروەها یەکێك لە قوتابییەکان هەندێ دەسپێداهێنانی بۆ دەقی ئینجیل زیاد کردووە.)).

بە بێ باسکردنی گریمانەکانی دیکەی ڕاڤەکاران باسیان کردوون، ئەو تێبینیانەی دیارترین نووسەرە مەسیحییەکان ئاماژەیان پێداون کە لێرەدا لەبارەی گرفتی دانەری ئینجیلی چوارەم هێنامانەوە تەنێ هەر ئەمان پەنجە بۆ ئەمە ڕادەکێشن کە ئێمە سەبارەت بە باوکێتیی ئەم کتێبە گرفتاری لێڵی و تێکەڵوپێکەڵین..

بەهای مێژوویی گێڕانەوەکانی یۆحەننا مایەی ناکۆکیی زۆر بوون. ئەو شتانەی لەگەڵ سێ ئینجیلەکەی تردا ناکۆکن زەق و دیارن. بەڵام (ئەی.کۆلمان) وەها لێکی دەداتەوە: ئەو دان بەوەدا دەنێ یۆحەننا مەبەستی لاهوتی جودای لەگەڵ مەبەستی مژدەدەرەکانی تردا هەبوو. ئەو مەبەستانەیە کە (سەروکاری هەڵبژاردنی وتەکانی مەسیح Logia دەکات، هەر ئەویش ڕێگای گواستنەوەی ئەم وتانە دیاری دەکات. بەم جۆرە زۆر جار نووسەر دێڕەکان لێك دەکێشێ و ئەو قسانە دەخاتە سەر زاری مەسیح کە خودی فریشتەی سروش بۆی هێناوە)). بە ڕای ئەم ڕاڤەکارە ئەمەیە هۆکاری کۆکنەبوونی لەگەڵ ئینجیلەکانی دیکە.

بێگومـان ئـەوە مەعقوڵـە یۆحـەننا کـە دوای مـژدەدەرەکانی تـر دەسـتی بـە نووسینەوە کردووە دەیتوانی هەندێ لەو ڕیوایەتانە هەڵبژێرێ کە بانگەشەکانی بـە شێوەیەکی ڕوونتر وێنا دەکات، ئێمە نابێ واقوڕماو بین کاتێ لە ئینجیلی یۆحـەننا ئـەوە نـابینین کـە لـە هـەموو گێڕانـەوەکانی تـردا هەیـە. وەرگێڕانـی مەسـکونی ژمارەیەکی دیاریکراو لە حاڵەتی لەم جۆرە بـاس دەکـات (لا ٢٨٢). بـەڵام ئـەوەی مایـەی حەپەسـانە هەنـدێ کەلێنـە، هەنـدێکیان کـەمێك مەعقوڵـە، وەکـو ئـەوەی تایبەتە بە گێڕانەوەی دامەزراندنی قوربانیی پیرۆز. چۆن دەکرێ ئەمە وێنـا بکـرێ کە یۆحەننایەك کە بە واتای وشـە مـژدەدەرێکی هزرڤـانی تێڕامـان بـووە لـەبارەی ڕووداوی سەرەکی لە مەسیحییەت کە دواتر بوویە پایەیەك لە گرینگترین پایـەکانی سروتی کەنیسە(واتە قوداس) قسە نەکات؟! سەبارەت بەو ڕووداوە یۆحەننا تەنها بەوە واز دێنێ کە باس لەو ئێوارەیەی بەر لە ئازارەکان بکات، وەسفی شووشـتنی پێـوپلی حەوارییـەکان و پێشبینی ناپـاکیی یـەهودای ئەسـخریوتی و نکـوڵیکردنی پەترۆس بکات.

هـەروەها پێچـەوانەی ئەمـە لـە ئینجیلـی گێڕانـەوەی وا هەیـە لـە ئینجیلـەکانی دیکەدا نییە، وەرگێڕانی مەسکونی لە لاپەڕەی ٢٨٣ ئاماژەی بۆ دەکات. لەوانەیـە یەکێك بڵێ: سیانەکەی تر لە هەندێ ڕووداودا ئەو گرینگییەیان بەدی نەکردووە کـە یۆحەننا بەدی کردووە. بەڵام چۆن سەرسـام نـابین کـاتێ لـە ئینجیلـی یۆحـەننادا ڕیوایـەتێك دەبیـنین لـەبارەی دەرکـەوتنی مەسـیحەوە بـۆ قوتابییـەکانی لەسـەر دەریاچەی تەبەرییە دوای ئەوەی لەنێو مردووەکان هەڵدەستێتەوە (الاصـحاح ٢١: ئایەتـەکانی ١ بـۆ ١٤). ئـەو ڕیوایەتـە بـە وردەکارییـەکی زۆرەوە گواسـتنەوەی موعجیزەی شکارە کە لۆقا گێڕاویەتەوەو لە ژیانی مەسـیحدا ڕووی داوە (الاصـحاح

٥: ئایەتەکانی ١ بۆ ١١). لۆقا لە ڕیوایەتەکەیدا ئاماژە بە بوونی یۆحەننای نێردراو دەکات کە لە کەلەپوردا وەکو مژدەدەر باسی کراوە.

هەروەها چەندان جیاوازیی گرینگی دیکە لەنێوان ئینجیلی یۆحەننا و ئینجیلەکانی تردا هەیە، ئەو جیاوازییەش تایبەتە بە ماوەی کاتی ناردنی مەسیح. مرقس و متی و لوقا بە ساڵێك دیاری دەکەن. بەڵام بە لای یۆحەنناوە بۆ زیاتر لە دوو ساڵ درێژ دەبێتەوە. (ئەی.کۆلمان) ئاماژە بۆ ئەم بابەتە دەکات. بەڵام وەرگێڕانی مەسکونی لەبارەی ئەم بابەتەوە ئاوا دەدوێ:

((لە کاتێکدا سێ ئینجیلە کۆکەکە لەبارەی ماوەیەکی درێژ لە جەلیل و دواتر ڕۆیشتن بۆ الناصرە و ئینجا مانەوەیەکی کورت لە قودس دەدوێت، کەچی یۆحەننا بە پێچەوانەوە چەند هاتوچۆیەکی مەسیح لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگێڕێتەوە و باس لە مانەوەیەکی درێژ لە خاکی ناصرە و قودس بەتایبەتی دەکات (١-١٩: ٥١ ; ٢-١٣ بۆ ٣- ٣٦ ; ٥-١: ٤٧; ١٤-٢٠: ٣١). ئاماژە بۆ چەند ئاهەنگێکی فصحی دەکات (٢-١٣ ; ٥ ص-١ ; ٦-٤ ; ١١-٥٥) بەوەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ناردنی مەسیح زیاتر لە دوو ساڵی خایاندووە.

کەواتە پێویستە باوەڕ بە کێ بکرێت؟ باوەڕ بە متی یان مرقس یان لوقا یان یوحنا بکەین؟

## سەرچاوەی ئینجیلەکان:

باوانی کەنیسە لە سەردەمی خۆیاندا بە میتۆدێکی سافیلکانە ڕوبەڕووی گرفتی سەرچاوەکان بوونەتەوە. لە سەدە بەراییەکانی سەردەمی مەسیحی تەنها سەرچاوە هەر ئەو ئینجیلە هەبوو کە دەسنووسە تەواوەکان لە سەروویان دادەنا ئەویش تەنها ئینجیلی متی بوو. گرفتی سەرچاوەکان بەرامبەر هەر دوو ئینجیلی مرقس و لوقا دەخرایە ڕوو چونکە ئینجیلی یوحنا حاڵەتێکی جودای هەیە. ئینجیلی مرقس کە لە ڕیزبەندیدا دووەم ئینجیلە، قەدیس ئۆگەستین بە ئیلهام وەرگرتن لە ئینجیلی متی پوختی کردۆتەوە، ئینجیلی لوقا کە لە ڕیزبەندی دەسنووسە دانراوەکان سێیەمە سوودی لە یەکەم و دووەم وەرگرتووە: پێشەکییەکەی کە پێشتر باسمان کرد ئاماژە بەوە دەدات.

ڕاڤەکارانی ئەم سەردەمە وەکو ئێمە دەکارن ئاستی ڕێکەوتنی دەقەکان بخەملێنن و ژمارەیەکی زۆر ئایەتی هاوبەش لە نێوان دوو یان سێ لە دەسنووسە کۆکەکانی ئینجیلەکان بدۆزنەوە. لەم سەردەمەماندا قسەکەران لەبارەی وەرگێڕانی مەسکونییەوە ژمارەی ئایەتەکان بەم شێوەیە حیساب دەکەن:

ئایەتە هاوبەشەکانی نێوان سێ ئینجیلەکە: متی و مرقس و لوقا ٣٣٠..

ئایەتە هاوبەشەکانی نێوان هەردوو ئینجیلی مرقس و متی ١٧٨..

ئایەتە هاوبەشەکانی نێوان هەردوو ئینجیلی مرقس و لوقا ١٠٠..

ئایەتە هاوبەشەکانی نێوان هەردوو ئینجیلی متی و لوقا ٢٣٠..

ئەمە لە کاتێکدا ئایەتە تایبەتەکانی هەر یەك لە سێ مژدەدەرە یەکەمەکان بریتیین لە:

٢٣٠ ئایەت بە نیسبەت متی، ٥٣ ئایەت بە نیسبەت مرقس، ٥٠٠ ئایەت بە نیسبەت لوقاوە.

لە سەردەمی باوانی کەنیسەوە تاوەکو کۆتاییی سەدەی هەژدە، هەزار و پێنج سەت ساڵ تێپەڕی بێ ئەوەی هیچ گرفتێکی نوێ — هەر چییەك بوو بێت — لەبارەی سەرچاوەگەلی مژدەدەرەکان بوروژێنرێ: گوێڕایەڵیی بۆ کەلەپوور هەبوو...تەنێ لە سەردەمی نوێ و لەبەردەم ئەم پێدراوانەدا هەندێك دەرکیان بەوە کرد کە: هەر مژدەدەرێك بە پێی میتۆدی تایبەت و تێڕوانینی کەسیی خۆیەوە بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی لە کەسانی تر چنگی کەوتووە، ڕیوایەتێکی دروست کردووە. ئەو کات لە لایەکەوە تۆژەران گرینگییەکی زۆریان بە سەرجەم بابەتەکانی ڕیوایەت لە کەلەپووری زارەکیی تایەفە ڕەسەنەکان و بە سەرچاوەیەکی نووسراوی (ئارامی) هاوبەش دا کە نەدۆزراوەتەوە. ئەو سەرچاوە نووسراوە بۆی دەکرا ببێتە بارستەیەکی کەڕ یان لە چەند پەرەگرافێکی زۆری ڕیوایەتگەلێکی جیاواز پێکهاتبێ کە لەوانەیە خزمەتی هەر مژدەدەرێکی کردبێت بۆ هەڵنانی دەقە ڕەسەنەکەی..

نزیکەی سەدەیەك دەبێت، چەند لێکۆڵینەوەیەکی زیاتر قوڵ سەری کێشاوە بۆ بیردۆزگەلێکی وردتر کە بە تێپەڕبوونی کات زیاتر ئاڵۆز بوون. یەکەمینی ئەم بیردۆزە نوێیانە بیردۆزێکە بە ناو (دوو سەرچاوەکەی هۆلتزمان) ١٨٦٣..بە پێی ئەم بیردۆزە هەروەکو (ئە.کولمان و وەرگێڕانی مەسکونی) دیاریان کردووە، متی

و لوقا لە لایەك ئیلهامیان لە مرقس وەرگرتووە، لە لایەکی ترەوە لەو بەڵگەنامە هاوبەشە وەرگرتووە کە لەمڕۆدا ونە، هەر دوو مژدەدەرەکەی تریش کە هەر یەکەیان سەرچاوەیەکی تایبەتیان لەبەردەستدا بووە بۆ ئەمە زیاد دەکرێ. ئەمەش سەری کێشاوە بۆ ئەم وێنە ڕوونکەرەوەیە:




(ئە.کۆلمان) پەیوەست بەم خاڵانەی خوارەوە ڕەخنە لەم ڕوونکردنەوەیە دەگرێت:

١- دانراوی مرقس کە لوقا و متی بەکاریانهێناوە ئینجیلی مرقس نییە، بەڵکو دانراوێکی پێش مرقسە.

٢- ئەمە گرینگییەکی پێویست نادات بە کەلەپووری زارەکی، وا دەردەکەوێت ئەو سەرەکی بێت چونکە - تەنها ئەو - بە درێژاییی سی یان چل ساڵ وتەکانی مەسیح و ڕیوایەتەکانی تایبەت بە ناردنی پاراستووە، بە جۆرێك هەر مژدەدەرێك تەنها وتەبێژ بووە بە ناوی ئەو تایەفە مەسیحییەی کەلەپووری زارەکی چەسپاندووە.

بەمە دەگەینە ئەو بیرۆکەیەی کە ئینجیلەکان کە ئەمڕۆ لەبەردەستمانە زایەڵەیەکی داوە بەو زانیارییانەی تایەفە سەرەتاییە مەسیحییەکان هەیانبووە

لــەبارەی ژیــان و پــەیامی مەســیح و بــاوەڕ و تێگەیشــتنە لاهوتییــەکانیان کــە مژدەدەرەکان بە ناویەوە دواون.

بەڵام نوێترین لێکۆڵینەوەکانی ڕەخنەگرتن لە دەقەکانی تایبەت بە سەرچاوەی ئینجیلەکان ڕوونی کردۆتەوە کە لە فۆرمەڵەبوونی دەقەکاندا پرۆسـەیەکی ئـاڵۆزتر هەبووە. چاپی چوار ئینجیلە هاوسازەکەی (لایـن بینـوا و بومـار) لـە پەیمانگـەی کتێبــی پــیرۆز لــە قــودس(١٩٧٢ –١٩٧٣) بــە شــێوەیەکی تایبــەت ئامــاژە بــۆ پەرەسەندنی دەقەکان بە چەند قۆناغێکی هاوتەریب لەگەڵ پەرەسەندنی کەلەپوور دەکات، ئەمەش سەردەکێشێ بۆ ئەنجامگـەلێك کـە باوکـە بینـوا بـەم واژانـە لـەو پێشەکییەی بۆ کتێبەکەی باوکە بوماری نووسیوە دەیخاتە ڕوو: (....) شێوەگەلی وتەکان یان ڕیوایەتەکان کە لە ئەنجامی پەرەسەندنێکی درێژی کەلـەپوور بەرهـەم هـاتووە هـەمان دروسـتیی ئـەو وتـە یـان ڕیوایەتانـەی نییـە کـە هـەن. هەنـدێ لـە خوێنەرانی ئەم کتێبە دەحەپەسێ یان هەست بە قەڵسی دەکات کاتێ دەزانـێ کـە ئەم وتەیەی مەسیح یان ئەم نموونەیە یان ئەو لێدوانە لەبارەی چارەنووسیەوە بەو شـێوەیە نـەگوتراوە کـە ئێمـە ئـەمڕۆ دەیخوێنینــەوە و، ئەوانــەی ئەمــەیان بــۆ گواستووینەتەوە هەندێ دەسکارییان کردووە. ئەوانەی لەم جـۆرەی لێکۆڵینـەوەی مێژوویی ڕانـەهاتوون لێـرە سەرچـاوەیەکیان بـۆ سەرسـوڕمان بـەڵکو تەنانـەت بـۆ نکوڵیکردنیش دەست دەکەوێ)).

ئــەم دەســپێداهێنان و ئــەو دەســکاریکردنانە کــە ئەوانــەی دەقــەکانیان بــۆ گواسـتووینەتەوە ئـەنجامیان داوە بـە ڕێگایـەك جێبـەجێ کـراوە کـە باوکـە بومـار لەبارەیەوە وێنەیەکی ڕوونکـەرەوەی زۆر ئاڵۆزمـان دەداتـێ کـە خسـتنەڕووی ئـەو

بیردۆزەیە کە ناونراوە بە تیۆری دوو سەرچاوەکە. ئەم وێنەیەشی دوای کاری پشکنین و بەراوردکردنی دەقەکان کە پوختەکردنی ئەستەمە، داناوە.

لێرەدا چوار بەلگەنامەی بنەڕەتی هەیە کە بریتیین لە: أ ، ب ، ج ، ق ئەمانە سەرچاوە ڕەسەنەکانی ئینجیلەکان دەنوێنن (سەیری وێنە ڕوونکەرەوە گشتییەکە بکە).

بەلگەنامەی أ بەلگەنامەیەکە لە ناوەندگەلێکی یەهودی – مەسیحی هەلقولاوە و ئیلهامبەخشی متی و مرقس بووە.

بەلگەنامەی ب بریتییە لە دووبارە تەفسیرکردنەوەی بەلگەنامەی أ ، کەنیسە بتپەرستی – مەسیحییەکان بەکاریان هێناوە: جگە لە متی ئیلهامبەخشی هەموو مژدەدەرەکان بووە.

بەلگەنامەی ج ئیلهامبەخشی مرقس و لوقا و یوحنا بووە.

بەلگەنامەی ق زۆربەی سەرچاوە باوەکانی نێوان متی و لوقا بووە، لە تیۆری دوو سەرچاوەکە (بەلگەنامەی هاوبەش)ە..

هیچ بەلگەنامەیەك لەم بەلگەنامە بنچینەییانە سەری نەکێشاوە بۆ نووسینەوەی ئەو دوا دەقانەی ئێستا لەبەر دەستمانە.لە نێوان ئەو و دوا نووسینەوەدا چەند دانراوێکی نێوەندکار تایبەت بە هەر ئینجیلێك هەیە و ئەو چوار بەلگەنامە نێوەندکارە بۆتە هۆی دوا داڕشتەی چوار ئینجیلەکە...هەر دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو وێنە ڕوونکەرەوە گشتییە تاوەکو لەو تۆڕە ئالۆزە تێ بگەین کە دانەر دایدەنێ.

ئەنجامەکانی ئەو لێکۆڵینەوە تایبەتە بە کتێبی پیرۆز گرینگییەکی فرەی هەیە. لێکۆڵینەوەکە دەیسەلمێنێ کە تێکستەکانی ئینجیلەکان کە مێژوویەکیان هەیە، هەروەرها بە پێی گوزارشتی باوکە بومار (مێژوویەکی پێش مێژوو)شیان هەیە، واتە بەر لە دەرکەوتنی دوا دارشتەیان لە قۆناغی بەڵگەنامە نێوەندکارەکان دەسکارییان کراوە. بۆ نموونە، بەمە ڕوون دەبێتەوە چیرۆکێك کە زۆر باش زانراوە و لە سەردەمی مەسیح ڕووی داوە، چیرۆکی موعجیزەی ڕاو، هەروەکو لە پێشەوە لە ئینجیلی لوقادا بینیمان کە ڕووداوێك بووە لە سەردەمی ژیانی مەسیحدا ڕووی داوە، لە کاتێکدا یوحنا وەکو ڕووداوێکی دوای هەستانەوەی دەیخاتە ڕوو.

## م.ئە.بومار
## چوار ئینجیلە هاوڕێکەکە
## وێنەی ڕوونکەرەوەی گشتی (بە دەسکارییەوە)



– بەڵگەنامـــەی أ، ب، ج، ق: بەڵگەنامـــەی بنـــەڕەتی کـە لــە دوا دارشـــتەدا بەکارهێنراوە.

– نێوەندکار: دارشتەی نێوەندکار.

لە ئاکامی هەموو ئەمانـەدا ئەوەیـە کـە ئێمـە هـەرگیز دڵنیـا نـین لـەوەی کـاتێ ئینجیل دەخوێنینەوە وتەی مەسیح دەبیستین. باوکە بینوا ڕوو دەکاتە خوێنـەری ئینجیل و لەمە وریای دەکاتەوە و بریتییەك دەخاتە ڕوو و دەڵێ: (ئەگەر لەسـەری پێویست بکات کە لە زیـاتر لـە بارێـك دەسـبەرداری بیسـتنی ڕاسـتەوخۆی دەنگـی مەسیح ببێت ئەوا گوێبیستی دەنگی کەنیسە دەبێت.).

چۆن دەکرێ سازان بکرێ لە نێوان ئەو تێبینییە ڕاشـکاوە لـەبارەی نادروسـتی هەندێ دەق و ئەو دەستەواژەی دەستوری عەقائیدی لـەبارەی کتێبـی خـوایی کـە کوڕی دووەمی ڤاتیکان دەنگی لەسەر داوە؟ ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە دەوتـرێ وتەکانی مەسیح بە ئەمانەتەوە گواستراونەتەوە. ئـەم دەسـتەواژەیە دەڵـێ: (ئـەو چوار ئینجیلە کە کەنیسە بە بێ دوودڵی جەخت لە مێژووییبوونیان دەکاتـەوە، بـە شێوەیەکی دەسپاك وتە و کردەوەکانی مەسیحی کوڕی خـودا بـە درێـژاییی ژیـانی لـەنێو مرۆڤـدا بـۆ ڕزگـاربوونی هەمیشـەییان و تـا ئـەو کاتـەی بـۆ ئاسمـان بـەرز کراوەتەوە، دەگوازێتەوە.).

بە ڕوونییەکی تەواو دەردەکەوێ کە کاری قوتابخانەی کتێبی پـیرۆز لـە قـودس بە درۆخستنەوەیەکی توندی بانگەشەکانی کوڕی ڤاتیکانە..

## مێژووی دەقەکان:

هەڵە دەکات ئەوەی وا باوەڕ بکات ئینجیلەکان تەنها بە نووسینەوەیان، کتێبە پیرۆزە بنەڕەتییەکانی مەسیحییەتی تازە لەدایکبوویان فۆرمەڵە کردووە و، چۆن پشتی بە پەیمانی کۆن بەستووە ئەوهاش پشتی بەو بەستووە. دەسەڵاتی باو لەو کاتەدا بە دەست کەلەپووری زارەکییەوە بووە کە وتەکانی مەسیح و ڕێنماییەکانی حەوارییەکانی دەگواستەوە. یەکەمین نووسراوە بەردەستەکان بەر لە ئینجیلەکان بریتی بوو لە نامەکانی پۆڵس: ئایا بە دەیانساڵ لەمەوبەر نەنووسرابوون؟

بینیمان کە بەر لە ساڵی ١٤٠ی زایینی کەسێك نەبوو گەواهی ئەوە بدات کە کەسێك هەیە بە بوونی کۆمەڵێك نووسراوی ئینجیلیانە دەزانێ بە پێچەوانەی ئەوەی هەندێ لە نووسەران تاوەکو ئەمڕۆش دەینووسن. بەڵکو پێویستە چاوەڕێی ساڵی ١٧٠ی زایینی بکرێ تاوەکو ئینجیلەکان سیفەتی ئەو ئەدەبە وەربگرن کە لە لایەن کلێساوە دانی پێدا نراوە.

لەو سەردەمە بەراییانەی مەسیحییەت دەستاودەستکردنی نووسراوگەلێکی زۆر لەبارەی مەسیحەوە هەبوو بەڵام وەکو نووسراوگەلێکی نوێ کە سیفەتی ڕاست و دروستی هەیە دانی پێدا نەنرا، هەروەکو کەنیسە ڕایسپارد بشاردرێنەوە، لێرەوە ناوی ئینجیلە ساختەکان هاتە گۆڕێ. لەم دەقانە چەند نووسراوێك مانەوە باش دەپارێزران چونکە ((ڕێزێکی گشتی هەبوو))، هەروەکو وەرگێڕانی مەسکونی پێمان دەڵێ، لەمەش نامەی بەرنابایە، بەڵام هەندێ دەقی تر هەن کە ((بە شێوەیەکی توندتر دوور خراونەتەوە)) تەنها چەند بەشێکی کەمیان لێ ماوەتەوە، لەبەرئەوەی بە گوێزەرەوەی هەڵەی گشتی دادەنرا بۆیە لەبەر چاوی ئیمانداران

شاردرایەوە. وێڕای ئەوە دانراوگەلی تر هەن وەکو ئینجیلەکانی ناصرییەکان و ئینجیلەکانی عیبرانییەکان و ئینجیلەکانی میسرییەکان، ئەمانە بە هۆی سەرنجەکانی باوانی کەنیسەوە پێ زانراون کە لەوە دەچێ نزیک بووبن لەوەی لەلایەن کەنیسەوە دانیان پێدا بنرێ. هەمان شتیش بە سەر ئینجیلی توما و ئینجیلی بەڕنابا دەچەسپێ.

هەندێ لەم نووسراوە ((ساختانە)) چەندان وردەکاریی خوڕافییان تێدایە کە خەیاڵی میللی بەرهەمی هێناوە، لەسەر ئەوە هەندێ لە دانەرانی لێکۆڵینەوەکان لەبارەی ئینجیلە ساختەکان زۆر بە ڕەزامەندییەکی ڕوونەوە بڕگەگەلێك لەم وردەکارییانە باس دەکەن کە بە ڕاستی شیاوی گاڵتەجارییە. بەڵام دەکرێ نموونەی ئەم بڕگانە لە هەموو ئینجیلەکان ببینین. با تەنها باسی وەسفی وەهمی ئەو ڕووداوانە بکەین کە (متی) دەڵێ لە کاتی مردنی مەسیحدا ڕوویان داوە. کەواتە دەکرێ بڕگەگەلێك لە هەموو نووسراوەکانی سەردەمە بەراییەکانی مەسیحییەت بدۆزینەوە کە لە جیددییەتدا هەژارن: پێویستە قسەکەران (نووسەران) شەڕەفی داننان بەمەیان هەبێ.

فرەیی گێڕانەوەکان لەبارەی مەسیحی کەنیسەوە لە قۆناغی ڕێکخستنیدا سەری کێشاوە بۆ ڕێوشوێنی دوورخستنەوەی زۆرێك لە دانراوەکان. لەوانەیە ئەوانەی سڕدراونەتەوە سەت ئینجیل بووبن! تەنها چوار ئینجیل هێڵدراونەتەوە کە چوونەتە لیستی فەرمیی نووسراوەکانی پەیمانی نوێ کە پێیان دەگوترێ: ئەم کتێبانە کەنیسە دانی پێدا ناون.

لە نیوەی سەدەی دووەمدا، (مارسیۆن) بەتوندی پاڵی نا بە دەسەڵاتدارانەوە تا هەڵوێستێك وەربگرن. ئەو نەیارێکی سەرسەختی یەهود بوو و هەموو پەیمانی نوێ (تەورات)ی ڕەت دەکردەوە و هەموو ئەو نووسینانەی دواتر کە لەسەر مەسیح نووسرا بوو و وا دەردەکەوت پەیوەندییەکی پتەوی بە پەیمانی کۆن یان کەلەپووری یەهودی — مەسیحیەوە هەبوو ڕەت دەکردەوە. مارسیۆن تەنها دانی نا بە ئینجیلی لوقاوە چونکە بە ڕای ئەو لوقا وتەبێژ بە ناوی پۆڵس و نووسراوەکانی پۆڵسەوە بووە.

کەنیسە تۆمەتی بێباوەڕی بەسەر مارسیۆندا سەپاند و هەموو نامەکانی پۆڵسی لە لیستی ڕەسمییدا دانا بەڵام هاوشان لەگەڵ ئینجیلەکانی تری متی و مرقس و لوقا و یۆحنا و هەروەها هەندێ کتێبی تری وەکو (کارەکانی نێردراوان)ی پێوە لکاند. لەگەڵ ئەوەشدا لیستە ڕەسمییەکە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و لە سەدەکانی بەراییی سەردەمی مەسیحیدا هەمەچەشن بوون. هەندێ دانراو هەبوون کە دواتر بە بێبەها (ساختە) دانران لەو لیستەدا شوێنێکی کاتییان گرتبوو لە کاتێکدا هەندێ نووسراوی تر هەن لە لیستی ئێستای پەیمانی نوێدان لەو سەردەمدا دوورخرابوونەوە. تاوەکو بەستنی دوو کۆڕ دوودڵی هەر هەبوو: هیبون لە ساڵی ٣٩٣ز، قرتاجنە لە ٣٩٧ز، بەڵام چوار ئینجیلەکە هەمیشە هەر لەو لیستەدا هەبوون.

هاوڕا لەگەڵ باوکە بومار تەنها دەبێ ئاخ هەڵکێشین بۆ ئەو (بڕ)ە زلەی کتێب کە کەنیسە بە ساختەی دانان و ون بوون، گرینگییەکی مێژوویيان هەبوو. لە واقیعدا باوکە بومار لە کتێبەکەیدا (چوار ئینجیلە هاوڕێکەکە) بە تەنیشت ئینجیلە

ڕەسمییەکانەوە شوێنێکیان دەداتێ. تێبینی دەکرێ تا کۆتاییی سەدەی چواردە ئەو کتێبانە لە کتێبخانەکان هەبوون.

ئەم سەدەیە سەردەمێك لە ڕێکخستنی توندی بەخۆوە بینی، کۆنترین دەسنووسە تەواوەکانی ئینجیلەکان بۆ ئەم سەردەمە دەگەڕێتەوە. لەو بەڵگەنامانەی بەر لەم سەردەمە، چەند دەسنووسێکن کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەم، دەسنووسێکی تر ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ سەدەی دووەم، بەڵام تەنها چەند بەشێکی پچڕپچڕمان بۆ دەگوازنەوە. بەڵام کۆنترین دەسنووسی پێستین دوو دەسنووسی یۆنانین لە سەدەی چوار، شوێنی دۆزینەوەیان نەزانراوە و ئێستا لە پەڕتووکخانەی ڤاتیکان هەڵگیراون. دەسنووسێکی تر لە شاخی سینا دۆزراوەتەوە و ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانی پارێزراوە. بەڵگەنامەی دووەم دوو دانەری ساختەی تێدایە.

هەروەکو وەرگێڕانی مەسکونی دەڵێ: ٢٥٠ دەسنووسی ناسراوی دیکەی پێستین لە جیهاندا هەیە، دواهەمین بۆ سەدەی یازدە دەگەڕێتەوە. بەڵام ((هەموو ئەو نوسخانەی پەیمانی نوێ کە بە دەستمان گەیشتوون هاوڕێك نین. بەڵکو بە پێچەوانەوە خوێنەر دەتوانێ جیاوازیگەلێك لەنێوانیاندا بدۆزێتەوە ئەگەرچی لە ڕووی گرینگییەوە جیاواز بن بەڵام لە هەر بارێکدا ژمارەیان فرەیە. هەندێ لەم جیاوازییانە تەنها تایبەتن بە وردەکاریی ڕێزمان یان تاکەوشە یان ڕیزبەندیی وشەکان. بەڵام لە هەندێ دانراوی تردا تێبینی دەکرێ لە نێوان دەسنووسەکاندا جیاوازی وەها هەیە کە تەواوی واتای بڕگەکان دەگۆڕێت. ئەگەر بمانەوێ پەی بە جیاوازیی ئەو دەقانە ببەین ئەوەندە بەسە چاوێك بگێڕین بە پەیمانی نوێی

یۆنانی، ئەم کتێبە دەقێکی یۆنانی لەخۆگرتووە کە پێی دەوترێ (ناوەند) کە بریتییە لە دەقێکی ئاوێتە لە پەراوێزەکانیدا خوێنەر هەموو ئەو خاڵە جیاوازانە دەبینێت کە لە سەرجەم نوسخەکاندا هەیە.

ساغ و دروستیی هەر دەقێك، تەنانەت بەڕێزترینی دەقەکانیش، هەمیشە شیاوی مشتومڕە. دەسنووسی ناسراو بە (Godex Vaticanus) نموونەیەکمان لەو بارەوە دەداتێ. ئەو چاپەی هاوڕێکی ئەسڵەکەیەتی و ڤاتیکان لە ساڵی ١٩٦٥ دووبارە چاپی کردۆتەوە ئاگادارکردنەوەیەکی لە هەمان سەرچاوە تێدایە پێمان دەڵێ کە ((دوای تێپەڕبوونی چەند سەدەیەك بەسەر نوسخەکەدا (کە لەوانەیە سەدەی دەیەم یان یازدەیەم بێت) یەکێك لە نووسەرەوەکان هەموو پیتەکانی نووسیوەتەوە تەنها ئەوانە نەبێ کە پێی وا بووە هەڵەیە)). هەندێ دەستەواژە لە دەقەکەدا هەیە کە هێشتا پیتە بەراییەکانی تێدایە و بە ڕوونی دەبینرێ و بە ڕەنگێکی جیاواز نووسراوە. هیچ شتێك نییە بیسەلمێنێ کە نۆژەنکردنەوەی دەقەکە دەسپاکانە بووە. زێدەباری ئەوەش ئاگادارکردنەوەکە ئەمە دیاری دەکات: ((تا ئێستا بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە نەمانتوانیوە هەموو ئەو دەستە جیاوازانە لێك جودا بکەینەوە کە بە درێژاییی سەدەکان دەسنووسەکەی ڕاست کردۆتەوە و پەراوێزی بۆ داناوە، بێگومان لە دەمی نووسینەوەی دەقەکەدا ژمارەیەك ڕاستکردنەوە لە کاردابوون)). لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کتێبەکانی فێرکاریی ئایینی ئەم دەسنووسە وەکو نوسخەیەکی سەدەی چوارەم دەخاتە ڕوو. دەبێ سەرێك بە سەرچاوەکانی ڤاتیکاندا بگرین بۆ ئەوەی بزانین کە دوای چەندان سەدە هەندێ دەست دەقەکەیان دەسکاری کردووە.

لەوانەیە یەکێك وەڵامی ئەمە بداتەوە بەوەی کە چەند دەقێك هەیە بۆ بەراوردکردن سوودی هەیە. بەڵام خوێنەر لە نێوان ئەو خاڵە جیاوازانەدا کە جیاوازیی واتای لێ دەکەوێتەوە، چۆن و کامەیان هەڵبژێرێ؟ ئەوە باش زانراوە کە ڕاستکردنەوەیەکی زۆر کۆنی یەکێك لە نووسەرەوەکان سەردەکێشێ بۆ دواداڕشتنەوەی دەقێك کە بەم شێوەیە ڕاست کراوەتەوە. دواتر بەتەواوی تێدەگەین کە تاکە وشەیەکی ئینجیلی یۆحەننای تایبەت بە paraclet بە شێوەیەکی ڕیشەیی واتای بڕگەکەی گۆڕیوە و لە ڕوانگەی لاهوتییەوە دەلالەتەکەشی بەرەواژوو کردۆتەوە.

((ئە.کۆلمان)) لەبارەی وردەکارییە جیاوازەکان لە کتێبەکەیدا (پەیمانی نوێ) نووسیویەتی: ((ئەوە لە ئەنجامی هەڵەی ناویستانەوە(غیر ارادی) ڕوودەدەن: یان نووسەرەوە– لەبەرگرەوە(ناسخ) وشەیەکی پەڕاندووە یان ئەوەتا دوو جاری بە دوای یەکدا نووسیوەتەوە، یاخود غافڵانە و نەزانانە بەشێکی ڕستەیەکی سڕیوەتەوە. لەوانەیە خۆویستانە ڕاستکردنەوەکەی ئەنجام داوە: یان نووسەرەوە ڕێی بە خۆی داوە بە پێی بیروبۆچوونە کەسییەکانی خۆی دەقەکە ڕاست بکاتەوە، یاخود بە دوای ئەوەدا گەڕاوە هاوڕێکی و تەباییەك لەنێوان دەقەکە و دەقێکی هاوشێوەی تر بکات تاوەکو جیاوازییەکانی نێوانیان کەم بکاتەوە. پلە بە پلە بە جودابوونەوەی نووسراوەکانی پەیمانی نوێ لە سەرجەم ئەدەبی بەرایی مەسیحی و سەیرکردنی وەکو کتێبێکی پیرۆز، ڕاڕایی نووسەرەوەکان لە ئەنجامدانی ئەم جۆرە ڕاستکردنەوانە پەرەی سەند کە ئەوانەی پێشتر ئەنجامیان دەدا: بەمەش باوەڕیان هات کە ئەوان دەقی ڕاستودروست دەگوازنەوە و بەمەش خاڵە وردەکارییە جیاوازەکانیان جێگیرکرد. هەندێ جاریش نووسەرەوە بۆ

ڕوونکردنـەوەی دەسـتەواژەیەکی نـاڕوون کـۆمێنتێکی لـە پـەراوێزی دەقەکـەدا دەنووسـی. نووسـەرەوەی دواتـر دەهـات و وا گومـانی دەبـرد کـە دەسـتەواژە نووسراوەکەی سەر پەراوێزی دەقەکە لە لای نووسـەرەوەیەکی تـر کـەوتووە و بـە پێویستی دەزانی کۆمێنتە پەراوێزییەکە بخاتەوە نێو دەقەکە. بەمەش هەندێ جار دەقە نوێیە گوازراوەکە زیاتر لێڵ و ناڕۆشن دەبوو.)).

نووسەرەوەی هەندێ دەسنووس لە تەك دەقدا ئازادیی زۆر بـە خۆیـان دەدەن. ئەوە بە نیسبەت نووسـەرەوەی یـەکێك لـە پیرۆزتـرین دەقـی دوای دوو دەقەکـەی پێشـوو کـە بریتییـە لـە Codex Bezae Cantabrigiensisکـە مێژووەکـەی بـۆ سـەدەی شەشـەم دەگەڕێتـەوە. بێگومـان نووسـەرەوە تێبینـی ئـەو جیاوازییـەی کردووە کە لە نێـوان زنجـیرە نـەژادی مەسـیح لـە هـەر یـەك لـە ئینجیلـی (لوقـا و متـی)دا هەیـە، بۆیـە هـاتووە نـەژادی مەسـیحی لـەوەی متـی وەرگرتـووە و لـە نووسخەی خۆی ئینجیلـی لوقـای دانـاوە. لەبەرئـەوەی ئینجیلـی متـی بـەراورد بـە ئینجیلی لوقا ژمارەیەکی کەمتر ناوی تێدایە بۆیـە هـاتووە بـە هەنـدێ نـاوی زێـدە قەبەی کردووە(بێ ئەوەی لەگەڵ ئەوەدا هاوسەنگییەك چێ بکات.).

پرسـیارەکە ئەوەیـە: وەرگێڕانـە لاتینییـەکانی وەکـو: Vulgate ی قـەدیس یـەرونیمس (سـەدەی چـوارەم) و وەرگێڕانـی دێـرین Vetus Itala و وەرگێڕانـە سـریانی و قیبتییـەکان زیـاتر ئـەمینترن لـە دەسنووسـە بنەڕەتییـە یۆنانییـەکان؟ لەوانەیە بە پشتبەستن بە دەسنووسی کۆنتر لەوانەی ئێمە باسمان کرد و لە ئێستا لەبەردەستدا نین نووسرابنەوە. کەس لەوبارەوە هیچ نازانێ.

پسپۆڕان ئـەم دەقانـەیان لـە چـەند خێزانێـك کـە خـودانی ژمارەیـەك سیفەتی هاوبەشن پۆلێن کردووە. بە پێی قسەی کۆلمان بێت بەم شێوەیەیە:

– دەقێك كە دەوترێ سوورییە، كۆنترین و زۆرترین دەقە یۆنانییەكان لەمەوە هاتوون، ئەم دەقە لە سەرەتای سەدەی شازدەوە بە هۆی ئامێری چاپەوە بەفراوانی بە ئەورووپادا بڵاوبوویەوە و بە رای پسپۆران ئەمەیان خراپترینی دەقەكانە.

– دەقێك بە نوسخە لاتینییە كۆنەكەی پێی دەوترێ رۆژئاوایی، لە یەك كاتدا دەقێكی یۆنانی و لاتینییە.(بە رای وەرگێرانی مەسكونی ئاراستەیەكی روونی روەو پاساودان و ناوردی و درێژدادری و هاورێكی هەیە).

– دەقێك هەیە پێی دەوترێ بێلایەن و پاك و خاوێنترە، ئەمە ئەو دەقەیە كە چاپەكانی ئەمرۆی پەیمانی نوێ پشتی پێ دەبەستێ ئەگەرچی ئەویش هەندێ كەموكورتی هەیە(وەرگێرانی مەسكونی).

لەم تێروانینەوە، هەموو ئەوەی رەخنەی نوێی دەقەكان دەتوانێ پێشكەشمانی بكات هەوڵدانیەتی بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی ((دەقێك خاوەنی زۆرترین دەرفەتی شیاو بێت بۆ ئەوەی بتوانێ لە دەقی ئەسڵی نزیك ببێتەوە. بە هەر حاڵ هەرگیز هیچ ئومێدێك نییە بۆ گەیشتن بە خودی دەقە ئەسڵییەكە)) (وەرگێرانی مەسكونی).

# ئینجیلەکان و زانستی نوێ

## دوو درەختە بنەچەی مەسیح

ئینجیلەکان ژمارەیەکی زۆر کەم لەم برگانەیان تێدایە کە دەتوانێ سەربکێشێ بۆ بەراوردکردن لەگەڵ پێدراوە زانستییە نوێیەکان.

بەر لە هەموو شتێك زۆرێك لەو گێڕانەوانەی ئینجیلەکان کە پەیوەندییان بە موعجیزەکانەوە هەیە ڕێ بە هیچ لێدوانێکی زانستی نادات. ئەم موعجیزانەش پەیوەستن بە کەسانێکەوە: وەکو چاکبوونەوەی نەخۆشەکان(شێت و کوێر و شەل و بەڵەك و، زیندووکردنەوەی ئیلعازر)، هەروەها پەیوەستن بە دیاردەگەلێکی ماددیی ڕووت کە دەکەونە پەراوێزی یاسا سروشتییەکان(وەکو ڕۆیشتنی مەسیح بەسەر ڕووی ئەو ئاوەی هەڵیگرتووەو گۆڕانی ئاوەکە بۆ مەی). هەندێ جار موعجیزەکە دیاردەیەکی سروشتیی نائاساییە ئەوەش بە هۆی هاتنەدی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا وەکو ئارامبوونەوەی زریانێکی لەناکاو یان وشککردنەوەی هەنجیر لە ساتێکدا یان ئەو ڕاوەماسییەی نائاساییەی وەکو بڵێی هەموو ماسییەکانی دەریاچەکە لە یەك خاڵی دیاریکراو کۆبوونەوە کە لەوێدا تۆڕەکە هەڵدرا بوو.

لەم ڕووداوانەدا خودا بە توانای خۆی دەخالەت دەکات، مرۆڤ لە تواناکانی خودا تووشی سەرسامی نابێ کە وەکو موعجیزە بۆی دەردەکەوێ ئەگەرچی بە لای خوداوە وەها نییە، ئەمە واتای ئەوە نییە کە نابێ مرۆڤی ئیماندار دەخالەت لە کاروباری زانستدا بکات. باوەڕ بە موعجیزەی خوایی و باوەڕ بە زانست دوو بابەتن تەواو تەبا و ڕێکن. یەکەمیان ئاستی خواییە و ئەویتریان ئاستی مرۆییە.

ئەز بە خاترجەمییەوە باوەڕ بەوە دەکەم کە مەسیح توانیویەتی بەڵەک چاک بکاتەوە بەڵام ناتوانم ئەوە قەبووڵ بکەم کە ئەوە بە دروستی و ئیلهامی خودا لە دەقێکدایە کە تێیدا ئەوە دەخوێنمەوە کە تەنها بیست نەوە لەنێوان یەکەم مرۆڤ و ئیبراهیمدا ژیاوە، ئەو قسەیەش لوقا لە ئینجیلەکەیدا(٣ ، ٢٣ ، ٢٨) دەیکات. دوای کەمێکی تر ئەو هۆکارانە دەبینین کە بڕیاری ئەوە دەدات کەوا دەقەکەی لوقا وەکو دەقی تایبەت بە هەمان بابەت لە پەیمانی کۆن لە خەیاڵی مرۆڤەوە زاوە.

ئینجیلەکان (وەکو قورئان) لەبارەی ئەسڵی بایۆلۆژیی مەسیحەوە هەمان پێدراومان پێدەدەن. گەشەکردنی مەسیح لە منداڵدانی دایکیدا لە دەرەوەی یاسا سروشتییە هاوبەشەکانی نێوان هەموو بوونەوەرە مرۆییەکان ڕوویداوە. ئەو هێلکۆکەیەی هێلکەدانی دایکی دروستی کردووە پێویستی بەوە نەبووە بگات بە سپێرمی باوکی تاوەکو کۆرپەلە پاشان منداڵێکی شیاوی ژیان چێ بکات. ئەو دیاردەیەی دەبێتە هۆی لەدایکبوونی بوونەوەرێکی زیندوو بێ ئەوەی تۆخمێکی پیتێنەری نێر دەخالەت بکات پێی دەوترێ (خودەپیتاندن)، دەتوانین لە هەندێ دۆخی تایبەتدا تێبینی خودەپیتاندن لە جیهانی گیانلەبەران بکەین، ئەوەش حاڵەتی مێرووگەلێکی جۆراوجۆر و هەندێ گیانلەبەری نابڕبڕەدارە، ئەمەش تایبەتە بە حاڵەتی ڕەگەزێکی هەڵبژاردە هەندێ باڵندە بەڵام ئەمە زۆر تایبەت و ئاوارتەیە، لە لای هەندێ مەمکدار بە تاقیکردنەوە بۆ نموونە کەروێشك سەرەتایەك وەدەسهاتووە بۆ پەرەسەندنی هێلکۆکە بۆ حاڵەتێکی کۆرپەلەیی بە بێ تێنانی سپێرم لە قۆناغێکی زۆر بەراییدا، بەڵام لەوە زیاتر تێنەپەڕیوە و، لە لای مەمکدارەکان هیچ حاڵەتێکی خودەپیتاندنی تەواو نە بە تاقیکردنەوە نە بە

سروشت نازانرێ. بەڵام مەسیح حاڵەتێکی تایبەتە، مەریەم دایکێکی پاکیزە و دەست لێنەدراو بوو، پاکیزەیی خۆی پاراست و جگە لە مەسیح منداڵی تری نەبووە. مەسیح ئاوارتەیەکی بایۆلۆژییە.

## دوودرەختە بنەچەی مەسیح:

ئەو دوو درەختەنەژادەی لە ئینجیلەکانی متی و لوقادا هەیە گرفتگەلێکیان پەیوەست بە ماقوڵییەت و ڕێکەوتن لەگەڵ پێدراوە زانستییەکاندا هەیە، لێرەوە ئەمەش گرفتگەلێکی پەیوەست بە ڕاست و دروستین. ئەمە گرفتگەلێکە نووسەرە مەسیحییەکان زۆر قەڵس و شەرمەزار دەکات، ئەوان ڕەتی ئەوەی تێدا ببینن کە بەڕوونی دیارە بەرهەمی خەیاڵی مرۆڤە: لە بابەتی وەچە یەکەمەکانی مرۆڤ، ئەندێشەی مرۆڤ ئیلهامی داوەتە نووسەرە کەهەنووتییەکانی بەشی التكوين لە سەدەی شەشەمی پێش زایین. هەر ئەمەش ئیلهامی داوەتە متی و لوقا لەو بابەتانەی ئەم دوو نووسەرە لە پەیمانی کۆن وەریان نەگرتووە.

سەرەتا دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ سەبارەت بە مەسیح ئەو دوو نەژادە لە لایەنی پیاوانەوە بێواتایە. ئەگەر پێویست بووایە نەژادێك بدرێتە مەسیح ئەوا تەنها دایکە مەریەمە. ئەو هیچ باوکێکی نییە، دەبێ ئەو نەژادە تەنها لە لایەن دایکییەوە بێت.

ئەمەش دەقەکانی ئەو نەژادەیە کە لە وەرگێڕانی مەسکونی بۆ پەیمانی نوێ هاتووە: متی درەختە نەژادی مەسیح لە سەرەوەی ئینجیلەکەی دادەنێ:

## بنەچەکانی عیسای مەسیح کوڕی داوود کوڕی ئیبراهیم

ئیبراهیم ئیسحاقی بوو، ئیسحاق یەعقوبی بوو، یەعقوب یەهودا و براکانی بوو، یەهودا لە سامار فارص و زارحی بوو، فارص حصرونی بوو، حصرون ئارامی بوو، ئارام عمینا دابی بوو، عمینا داب نحشونی بوو، نحشون سلمونی بوو، سلمون لە راحاب بوعزی بوو، بوعز لە راعوس عوبیدی بوو، عوبید یسی بوو، یسی داودپاشای بوو، داودپاشا لە التی لاوریا سلیمانی بوو، سلیمان رحبعامی بوو، رحبعام أبیای بوو، أبیا أسای بوو، أسا یوهاشافاتی بوو، یوهاشافات یورامی بوو، یورام عزیای بوو، عزیا یوتامی بوو، یوتام أجازی بوو، أجاز حزقیای بوو، حزقیا منسی ی بوو، منسی أمونی بوو، أمون یوشیای بوو، یوشیا یکنیا و براکانی بوو، پەراگەندەکردن بۆ بابل ڕوویدا، دوای دەربەدەرکردن بۆ بابل: یکنیا شالتیئیلی بوو، شالتیئیل زربابلی بوو، زربابل ابیهودی بوو، ابیهود الیاقیمی بوو، الیاقیم عازوری بوو، عازور صادوقی بوو، صادوق اخیمی بوو، اخیم یهودی بوو، یهود الیعازاری بوو، الیعازار متانی بوو، متان یەعقوبی بوو، یعقوب یوسفی بوو، یوسف پیاوی مەریەم ئەو عیسایەی لێ بەوەلەد بوو کە پێی دەوترێ مەسیح.

بەم پێیە ژمارەی نەوەکان لە ئیبراهیمەوە بۆ داوود چواردەیە و لە داوودەوە تا دەربەدەرکردن بۆ بابل چواردە نەوەیە، لە دەربەدەرکردن بۆ بابل تاوەکو مەسیحیش چواردە نەوەی ترە.

بەڵام لوقا(٣ ، ٢٣ — ٢٨) نەژادێکی تری جیاواز لەوەی ئینجیلی متی دەداتە مەسیح. بە پێی هەمان تەرجەمە دەیخەینەڕوو:

ئەو کاتەی عیسا دەستی بە بانگەواز کرد تەمەنی سی ساڵ بوو. وا گومان دەبرا ئەو کوڕی یوسف کوڕی هالی بێت، کوڕی متتات کوڕی لاوی کوڕی ملکی کوڕی ینا کوڕی یوسف، کوڕی متائیا کوڕی عاموص، کوڕی ناحوم کوڕی حسلی کوڕی ناجای کوڕی ماس کوڕی متاسیا کوڕی شمعی کوڕی یوسف کوڕی یهودا کوڕی یوحنا کوڕی ریسا کوڕی زربابل کوڕی شالتیئیل کوڕی نیری کوڕی ملکی کوڕی إدی کوڕی قصم کوڕی المودام کوڕی عیر، کوڕی موسی کوڕی الیعازر کوڕی یوریم کوڕی متساس کوڕی لاوی، کوڕی شمعون کوڕی یهودا کوڕی یوسف کوڕی یونان کوڕی الباقیم، کوڕی ملیا کوڕی مینانا کوڕی متاسا کوڕی ناسان کوڕی داود کوڕی یسی کوڕی عوبید کوڕی بوعز کوڕی شالح کوڕی نحشون کوڕی عمیناراب کوڕی أدمنی کوڕی عرنی کوڕی حصرون کوڕی فارص کوڕی یهودا کوڕی یعقوب کوڕی اسحاق کوڕی ابراهیم کوڕی تارح کوڕی ناحور کوڕی سروح کوڕی رعون کوڕی فالح کوڕی عابر کوڕی شالح، کوڕی قینان کوڕی أرفکشار کوڕی سام کوڕی نوح کوڕی لامك، کوڕی متوشالح کوڕی أخنوخ کوڕی یارد کوڕی مهللئیل کوڕی قینان کوڕی أنوش کوڕی شیت کوڕی ادم کوڕی خوا))!! (لەبەر ئەو قسەیەیان داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەین).

ئەو نەژادانە بە دانانیان لە دوو خشتەدا ڕوونتر دەردەکەون، خشتەی یەکەم نەژادەکانی مەسیح پێش داوود و خشتەی دووەمیش نەژادەکانی دوای داوود دەخاتەڕوو.

## بنەچەی مەسیح پێش داوود:

به پێی ئینجیلی متی

متی باسی هیچ ناوێك

بەر لە ئیبراهیم ناكات......

به پێی ئینجیلی لوقا

١- ادم

٢- شیت

٣- أندش

٤- قینان

٥- مهلئیل

٦- یارد

٧- أخنوخ

٨- متوشالح

٩- لامك

١٠- نوح

١١- سام

١٢- أرفكشاد

١٣- قنان

١٤- شالح

١٥- عابر

١٦- فالج

١٧- راعو

١٨- سروج

| | |
|---|---|
| | ١٩- ناحور |
| | ٢٠- تارح |
| ١- ابراهیم | ٢١- ابراهیم |
| ٢- اسحاق | ٢٢- اسحاق |
| ٣- یعقوب | ٢٣- یعقوب |
| ٤- یهودا | ٢٤- یهودا |
| ٥- فارص | ٢٥- فارص |
| ٦- حصرون | ٢٦- حصرون |
| ٧- ارام | ٢٧- ارام |
| | ٢٨- أدمنی |
| ٨- عمیناداب | ٢٩- عمیناداب |
| ٩- نحشون | ٣٠- نحشون |
| ١٠- سلیمان | ٣١- شالح |
| ١١- بوعز | ٣٢- بوعز |
| ١٢- عبید | ٣٣- عوبید |
| ١٣- یسی | ٣٤- یسی |
| ١٤- داود | ٣٥- داود |

## بنەچەی مەسیح دوای داود

١٥- سليمان
١٦- رحبعام
١٧- ابيا
١٨- أسا
١٩- يوشافات
٢٠- يورام
٢١- عزيا
٢٢- يوتام
٢٣- أجاز
٢٤- حزقيا
٢٥- منسى
٢٦- أمون
٢٧- يوشيا
٢٨- يكنيا
دەربەدەرکردن بۆ بابل
٢٩- شالتئيل
٣٠- زربابل
٣١- أبيهود
٣٢- ألياقيم
٣٣- عازور

٣٦- ناتان
٣٧- متاتا
٣٨- منا
٣٩- مليا
٤٠- ألياقيم
٤١- يونان
٤٢- يوسف
٤٣- يهودا
٤٤- شمعون
٤٥- لاوى
٤٦- متات
٤٧- يوريوم
٤٨- عازر
٤٩- يوسى
٥٠- عير
٥١- المودام
٥٢- قوساى
٥٣- ادى
٥٤- ملكى
٥٥- نيرى

٣٤- صادوق

٣٥- أكيم

٣٦- اليهود

٣٧- ألعازار

٣٨- متان

٣٩- يعقوب

٤٠- يوسف

٤١- عيسى

٥٦- شالتئيل

٥٧- زربابل

٥٨- ريسا

٥٩- يوحنا

٦٠- يهودا

٦١- يوسف

٦٢- شمعي

٦٣- متتبا

٦٤- مات

٦٥- نجاي

٦٦- حسلي

٦٧- ناحوم

٦٨- عاموس

٦٩- متتيا

٧٠- يوسف

٧١- ينا

٧٢- ملكي

٧٣- لاوي

٧٤- متات

٧٥- عالي

٧٦- يوسف

٧٧- عيسى

## جیاوازییەکان بە پێی دەسنووس و بەراورد بە پەیمانی کۆن

ئەگەر جیاوازییە ڕێنووسییەکانمان وەلانا پێویستە باسی ئەوە بکەین:

### أ- ئینجیلی متی:

نەژادی مەسیح لەم دەقە لادراوە کە ناسراوە بە ناوی Codex Bezae Cantabrigiensis ، ئەمەش دەسنووسێکی زۆر گرینگە، لە سەدەی شەشەم بە هەردوو زمانی یۆنانی و لاتینی هەبووە: دەقە یۆنانییەکە بەتەواوی ون بووە و زۆربەی دەقە لاتینییەکەش بزر بووە، ئەوەی پەیوەستە بە بەشە بزربووەکە لەوانەیە ئەوەی ڕووی داوە تەنها بزربوونی پەڕەکانی سەرەتاکەی بووە. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین متی لە بەرامبەر پەیمانی کۆندا ئازادییەکی زۆری بە خۆی داوە: چەندان نەژادی لابردووە لەبەر چەند پێویستییەك کە پەیوەستە بە بەڵگەهێنانەوەی بیرکارییانەی سەیر. (لە کۆتاییشدا متی ئەو بەڵگەیە نادات بە دەستەوە هەروەکو دواتر دەیبینین).

### ب- ئینجیلی لوقا:

١- پێش ئیبراهیم: لوقا ئاماژە بە بیست ناو دەکات، بەڵام پەیمانی تەنها نۆزدە ناو دێنێ(سەیری وەچەکانی ئادەم لە باسی پەیوەست بە پەیمانی کۆن بکە). لوقا دوای أرفکشاد(ژمارە ١٢) پیاوێکی بە ناوی کاینام(ژمارە ١٣) زیاد کردووە لە (سفر التكوين) وەکو کوڕی أرفکشاد هیچ شوێنەوارێکی نابینین.

٢- لە ئیبراهیمەوە بۆ داوود: بە پێی دەسنووسەکان ژمارەیەك ناو دەبینین کە ١٤ تا ١٦ ناوێك دەبێ.

٣- لە داودەوە بۆ مەسیح: خاڵی گرینگی جیاوازی ئەوەیە کە لە نوسخەی ناسراو بە Codex Bezae Cantabrigiensis دایە کە نەژادە درەختێکی وەهمی دەدرێتە پاڵ لوقا و لەو نەژادانەی لای (متی)وە دروست کراون، نووسەرەوەش پێنج ناوی بۆ زیادکردوون. بە داخەوە لەم دەستنووسانە بەشی تایبەت بە نەژادی مەسیح ون بووە، لەبەرئەوە بەراوردکردنەکە ناکرێ.

## توێژینەوەیەکی ڕەخنەگرانەی دەقەکان:

لێرەدا خوێنەر دوو درەختەنەژادی مەسیح دەبینێ کە خاڵی هاوبەشی بنەڕەتییان لە تێپەڕبوون بە ئیبراهیم و داوودەوەیە. بۆ ئاسانکردنی ئەم توێژینەوەیە و ڕەخنەگرتنەکە کۆمەڵەکان دەکەین بە سێ بەش:

- لە ئادەمەوە بۆ ئیبراهیم.
- لە ئیبراهیمەوە بۆ داوود.
- لە داوودەوە بۆ مەسیح.

## ١- ماوەی نێوان ئادەم بۆ ئیبراهیم

لەبەرئەوەی متی درەختەنەژادی مەسیح بە ئیبراهیم دەست پێدەکات بۆیە لێرەدا ئەم بابەتە پەیوەست نییە بەو. تەنها لوقایە کە لەبارەی باوباپیرانی ئیبراهیمەوە تا ئادەم زانیاری دەدات: ئەو بیست ناو دەخاتەڕوو کە هەروەکو گوتمان نۆزدە ناویان لە سفر التكوين‌دا هەن(الاصحاحات ٤، ٥، ٦).

دەکرێ وێنای ئەوە بکرێ کە بەر لە ئیبراهیم جگە لە ١٩ یان ٢٠ وەچەی مرۆڤ چیتر نەبووە؟ ئەوەی پەیوەستە بە پەیمانی کۆن (تەورات) دیراسەی گرفتەکەم کردووە. ئەگەر خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ نەوەکانی ئادەم بە پێی بەشی (التكوين) کە چەند ڕایەڵێکی زەمەنیی بیرکارییانەی تێدایە کە دەکرێ لە دەقی تەورات هەڵێنجرێ، دەبینین کە نێوانی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی تاوەکو لەدایکبوونی ئیبراهیم نۆزدە سەدە دەبێ. بەڵام ئێستا کە پسپۆڕان وا دەخەمڵێنن کە ئیبراهیم بە نزیکەیی ساڵی ١٨٥٠ی پێش زایین لە ژیاندا بووە کەواتە ئێمە لەو ڕایەڵانەی بەشی التكوين پێمان دەدات ئەوە هەڵدێنجین کە دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی ٣٨ سەدە بەر لە مەسیح بووە. بێگومان لوقا بۆ نووسینەوەی ئینجیلەکەی ئیلهامی لەم پێدراوانە وەرگرتووە. لەبەرئەوەی ئەم پێدراوانەی گواستۆتەوە کەواتە وەهمی کردووە. پێشتر خوێنەر ئەو بەڵگە یەکلاکەرەوانەی بینی کە سەری بۆ ئەم بانگەشەیە کێشاوە.

بەم پێیە گەڵاڵەکردنی پێدراوەکانی پەیمانی کۆن لەم سەردەمەی ئێستاماندا پەسندکراو نییە. بۆ ئەمەش پاساوی خۆی هەیە: بە جۆرێک ئەم پێدراوانە دەکەونە ئەو خانە (پووچەڵ — البطلان) ەوە کە کۆڕی دووەمی ڤاتیکان باسی کردووە. بەڵام کە مژدەدەرەکان هەمان ئەم پێدراوانە کە لەگەڵ زانستدا ناگونجێ بخەنە سەر شانیان و قەبووڵی بکەن ئەوا ئەمە بڕیاردانێکی زۆر زلە و ناسازە لەگەڵ ئەوانەی بەرگری لە ساغ و دروستیی مێژوویی دەقە ئینجیلییەکان دەکەن.

نووسەرەکان بەباشی لە مەترسیی ئەم بڕیاردانە تێگەیشتوون. ئەوان بەو قسەیەیان خۆی لەم دژوارییە دوور دەخەنەوە کە دەڵێن: مەبەست لەمە بە تەواوی درەختەنەژادی مەسیح نییە و، مژدەدەرەکانیش بە ئەنقەست هەندێ ناویان

لابردووه و ئەوەی پێویستە حیسابی بۆ بکرێ تەنها (نیازی دانانی هێڵە پانەکان یان ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی نەژادی مەسیحە بە پشتبەستن بە واقیعی مێژوویی. لە دەقەکان شتێك نییە ڕێ بەم گریمانەیە بدات. دەقەکانی پەیوەست بە نەژادەکان بە دیاریکراوی ئەوە نیشان دەدات کە فلان فیساری لێ بووە و ئەمەش کوڕی ئەوەیە. زیاتر لەوەش بە تایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە بەر لە ئیبراهیم، مژدەدەر لە تەورات نەژادەکانی وەرگرتووە کە بەم شێوەیەیە:

(س)لە ساڵی ئەوەندە (ص)ی هێنایە دونیاوە..(ص)یش ئەوەندە ساڵ ژیا و (ع)ی بەوەلەد هێنا. کەواتە لێرەدا هیچ پسانێك لە زنجیرەکەدا نییە..

بەم پێیە لەژێر ڕۆشنایی زانیارییە نوێیەکان بەشی بەر لە ئیبراهیم لە نەژادی مەسیح بە گوێرەی ئینجیلی لوقا پەسندکراو نییە..

## ٢- ماوەی نێوان ئیبراهیم بۆ داوود

لێرە هەر دوو درەختەنەژاد ڕێك دەکەون یان نزیك دەبنەوە لە ڕێککەوتن، یەك دوو ناوێکیان جیاوازە: ئەوەش بەوە پینە دەکرێ کە ڕەنگە هەڵە نەویستانەی نووسەرەوەکان بێت.

بەڵام ئایا لێرەدا ئەگەری ڕاستگۆیی بە لای مژدەدەرەکانەوەیە؟

مێژوو سەردەمی داوود بە ١٠٠٠ ساڵ بەر لە زایین دیاری دەکات، سەردەمی ئیبراهیمیش بە نزیکەیی لە دەوروبەری ١٨٠٠ — ١٨٥٠ی پێش زایین واتە نزیکەی

١٤ یان ١٦ نەوەی هەشت سەدە..ئایا ئەمە مەعقولە؟ کەواتە با بڵێین ئەو دەقانەی ئینجیل کە پەیوەستن بەو ماوەیە دەکەوێتە سنووری پەسندکراوەوە.

## ٣- ماوەی دوای داوود

بە داخەوە دەقەکان لە دیاریکردنی پێشینان(باووباپیران)ی مەسیح هەرگیز ڕێك نەکەوتوون.

با ئەو ساختەکارییە ڕۆشنە کە لە بەڵگەنامەی Codex Bezae Cantabrigiensis سەبارەت بە لوقا کراوە، با بەراورد لە نێوان Vaticanus Codex و Codex Sinaiticus بکەین کە ڕێزدارترن.

درەختەنەژادی مەسیح دوای داوود لە کن لوقا ٤٢ ناو لەخۆدەگرێ(ژمارە ٣٥)(ژمارە ٧٧). بەڵام ئینجیلی متی دوای داوود تاوەکو مەسیح ئاماژە بە ٢٧ ناو دەکات(ژمارە ١٤)(ژمارە ٤١). کەواتە ژمارەی پێشینانی مەسیح دوای داوود لە هەردوو ئینجیلەکەدا جودایە. زیاتر لەوەش ناوەکانیش جیاوازن.

بەڵام لێرەدا لەوە زیاتریش هەیە:

متی پێمان دەڵێ کەوا ئەو ئەوەی دۆزیوەتەوە کە پێشینانی مەسیح لە ئیبراهەمەوەڕا بۆ سێ کۆمەڵە دابەش دەبن کە هەر کۆمەڵەیەك ١٤ ناو لەخۆدەگرێ: کۆمەڵەی یەکەم لە ئیبراهیمەوە بۆ داوود، کۆمەڵەی دووەم لە ئیبراهیمەوە تا دەربەدەرکردن بۆ بابل، کۆمەڵەی سێیەم لە دەربەدەرکردن بۆ بابلەوە تاوەکو مەسیح. دەقەکەی متی لە هەردوو کۆمەڵەی یەکەم و دووەم هەر

يەكەيان ١٤ ناويان تێدايە بەڵام كۆمەڵەی سێیەم تەنها ١٣ ناوی تێدايە نەك ١٤، نەخشەكە ئامـاژە بۆ ئەوە دەكات كە ژمـارەی شـالتئيل ٢٩ يـە و مەسـيحيش ٤١..هـيچ نوسـخەيەكی تـری متـی نييـە كـە لەمـە جيـاواز بێـت و لـەم كۆمەڵـەی سێيەمەدا ١٤ ناوی تێدا بێت.

متی بۆ ئەوەی ١٤ ناو بۆ كۆمەڵەی دووەم كۆبكاتەوە زۆر ئازادانە هەڵسوكەوتی لەگەڵ تەوراتدا كردووە. نـاوی شـەش پێشـينەكەی يەكـەمی داوود(لـە ١٥ بـۆ ٢٠) لەگەڵ پێدراوەكانی تەورات تێكدەكاتەوە. بەڵام متی وەچەكانی يـورام(ژمـارە ٢٠) فەرامۆش دەكات كە بە پێی سەرچاوەكان بريتی بـوون لـە (ئـەخازياس و يـواس و ئەماسيا). ئەوەش زياد دەكات گوايە يكنيا(ژمارە ٢٨) كوڕی يوشيايە(ژمارە ٢٧) لە كاتێكدا سەرچاوەيەكی تـر دەڵـێ: ئـەو الياقيمـە و شـوينی لـە نێـوان يوشـيا و يكنيادايە.

بەوە ساغ دەبێتـەوە كـە متـی لـە زنجـيرە نـەژادی تـەورات لای داوە تـەنێ بـۆ ئەوەی كۆمەڵە دروستكراوەكەی لە ١٤ ناوی نێوان داوود تا دەربەدەركردن بۆ بابل پێشكەش بكات.

بەڵام كە لە كۆمەڵەی سێيەم ناوێك كـەم بێـت كـەوا ئێسـتا هـيچ دەقێكـی ئـەم ئينجيلە نييە كە ٤٢ ناوە ئامـاژەپێكراوەكەی تێدا بێت، سەرسوڕمان لە بوونی ئـەم كەلێنــەدا نييــە(لەوانەيــە پاســاوی ئەمــە هەڵەيــەكی زۆر كــۆنی يــەكێك لــە نووسەرەوەكان بێت و تا ئێستا بەردەوام بێت) بەڵكو ئەوەی مايەی سەرسـوڕمانە ئەو بێدەنگييەی نووسـەرانی مەسـيحييە لـە بەرامبـەر ئـەم بابەتـە.(و.تـريلينگ — W.Triling) لـە كتێبەكەيـدا (ئينجيلـی متـی) بـە يـەك دێـڕ ئـەم بێدەنگييـەی

براندۆتەوە. بەڵام بابەتەکە دوورە لەوەی بێبایەخ بێت، قسەکەران لەبارەی ئەم ئینجیلەوە، گرینگیی گەورەی هێمای ژمارە ( ١٤ × ٣ )یان بە لای (متی)وە ئاشکرا کردووە. ئایا ئەم مژدەدەرە بێ دوودڵی چەند ناوێك کە لە تەوراتدا هاتووە تەنها بۆ ئەوە لانەبردووە تاوەکو لە بەڵگەهێنانەوە بیرکارییانەکەیدا سەرکەوتوو بێت؟

ئەمە گرینگ نییە چونکە قسەکەران هێندە ستایش و پاساوهێنانەوەیان ڕۆناوە کە پاساوی لابردنی ئەو ناوانە دەداتەوە و لە کەلێنەکە دوور دەکەوێتەوە و بەوەش ئەوەی مژدەدەرەکە دەیویست بنیاتی بنێت هەرەس دێنێت.

## کۆمێنتی ڕاڤەکارە نوێیەکان:

لە کتێبی (ئینجیلی منداڵێتی ١٩٦٧)دا کاردینال دانیلو بەهایەکی هێمایانەی زۆر بایەخدار دەبەخشێتە (ڕوونکردنەوە بیرکارییانەکەی ئینجیلی متی). بە تێڕوانینی ئەم، ئەو ڕوونکردنەوەیە باووباپیرانی مەسیح دیاری دەکات کە لوقاش جەختیان لێ دەکاتەوە. لە ڕوانگەی کاردینال دانیلۆوە لوقا و متی دوو مێژوونوسی ئەوتۆن (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی)یان ئەنجام داوە، لەبەرئەوەی نەژادی مەسیح (لە ئەرشیفی خانەوادەی مەسیح وەرگیراوە)..دەبێ ئەوەش دیاری بکرێ کە ئەم ئەرشیفە هەرگیز نەدۆزراوەتەوە.

کاردینال دانیلۆ نەفرەت لەوانە دەکات کە ڕەخنە لەم تێڕوانینەی دەگرن، دەڵێ: (عەقڵییەتی ڕۆژئاوایی و ناشارەزایی لە یەهودییەت — مەسیحییەت و

نەبوونی هەستێکی بەرز، هەموو ئەمانە زۆرێك لە ڕاڤەکارانی ئینجیلەکانی بەلاڕێدا بردووە.)).

ناوبراو لە واتای ژمارە (٣ × ١٤) دەکۆڵێتەوە و لەبارەی چەند گریمانەیەکەوە درێژدادڕییەکی زۆر دەکات کە باسکردنی بەجێ نییە.

قسەکەرانیش لەبارەی تەرجەمەی مەسکونییەوە چەند وەڵامێکی پاساودەرانە و ستایشئامێز لەم بارەوە دەخەنە ڕوو.

بێگومان نەژادی مەسیح لە ئینجیلەکان بابەتێکە لە میانەیدا نووسەرە مەسیحییەکان پاڵەوانێتیی جەدەلیی زەقی خۆیان دەرخستووە کە هاوشانی وەهم و ئارەزووەکانی هەر یەك لە متی و لوقایە ! !

## ناسازی و هەندێ بابەتی ناماقووڵی ڕیوایەتەکان

هەر چوار ئینجیلەکە ژمارەیەکی گرینگ ڕیوایەتیان تێدایە کە ڕووداوگەلێك دەگێڕنەوە کە ڕەنگە هەندێکیان لە یەك ئینجیل یان چەند ئینجیلێك یان هەموویاندا هەبێت، ئەگەر تەنها لە یەك ئینجیلدا باس کرا بێت ئەوا گرفتی گرینگ دەخاتە ڕوو، بە پێیە جاری وا هەیە حاڵەتەکە ڕووداوێکی دوور ئامانجە خوێنەر سەری سووڕدەمێنێ لەوەی تەنها یەك مژدەدەر باسی کردووە: بۆ نموونە بەرزبوونەوەی مەسیح بۆ ئاسمان لە ڕۆژی دواییدا. زێدەباری ئەوەش، زۆرێك لە ڕووداوەکان بە شێوەیەکی جیاواز و هەندێ جار بە شێوەیەکی زۆر جیاواز لە نێوان دوو مژدەدەر یان زیاتر گێڕدراوەتەوە. زۆر جار مەسیحییەکان واقوڕماو دەبن کاتێ بوونی ئەم ناسازییانە لە نێوان ئینجیلەکاندا بەدی دەکەن، ئەوان وەها

بە گوێیاندا دووپات کراوەتەوە و تەئکیدیش کراوەتەوە کە نووسەرانی ئینجیلەکان ئەو ڕووداوانەی گێڕاویانەتەوە خۆیان شایەتی بوونە و بە چاو بینیویانە.

لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان بە هەندێ لەم بابەتە ناماقووڵ و ناسازانە کرد، بەڵام ئەوەی بە تایبەتی بابەتی ڕیوایەتە ناساز و ناکۆکەکان پێکدێنێ بریتییە لە ڕووداوەکانی کۆتایی ژیانی مەسیح.

## ڕیوایەتەکانی ئازارەکان

باوکە ڕۆجی تێبینی ئەوەی کردووە کە جەژنی (الفصح) و دوا ئێوارەخواردنی مەسیح لەگەڵ هاوەڵەکانی لە ڕووی زەمەنەوە لە نێوان سێ ئینجیلە هاوڕێکەکە و ئینجیلی یوحنا لە یەکتر جیاوازە. یوحنا دەڵێ ئەم ئێوارەیە بەر لە جەژنی الفصح بووە. بەڵام ئینجیلەکانی تر دەڵێن لە میانەی جەژنی الفصح دا ڕووی داوە.

کاتێ گرینگیی جەژنی الفصح لە سروتەکانی یەهودی و گرینگیی ئەو ئێوارەیەی مەسیح خواحافیزی لە هاوەڵەکانی کرد دەزانین چۆن دەبێ ئەو کەلەپورەی مژدەدەرەکان گواستوویانەتەوە کاتی ئەو ئێوارەیەی بە نیسبەت جەژنی الفصحەوە لەبیرکردووە؟!

بە شێوەیەکی گشتیتر ڕیوایەتەکانی ئازارەکان لە ئینجیلەکان لە یەکتر جیاوازن و جیاوازییەکە لە نێوان سێ ئینجیلەکەی یەکەم و ئینجیلی یوحنا تایبەتترە. دوا ئێوارەی مەسیح و ئازارەکان لە ئینجیلی یوحنادا دوو هێندەی هەر یەك لە لوقا و مرقسە. دەقی یوحنا هێندە و نیو لە دەقی متی زیاترە. یوحنا وتارێکی درێژی مەسیح بۆ قوتابییەکانی دەگێڕێتەوە کە لە ئینجیلەکەیدا چوار إصحاحی(لە ١٤

تاوەکو ١٧) گرتووە. لە ڕێی ئەم ڕووداوە گەورەوە مەسیح دوا ڕێنمایی دەدا بە قوتابییەکانی و هەروەها وەسیەتە ڕۆحییەکەیشی بەوان دەبەخشێ. لە ئینجیلەکانی تر هیچ شتێك لەم بارەوە نابینرێ. بە پێچەوانەوە متی و مرقس و لوقا دوعای مەسیح بۆ گیتسمانی دەگێڕنەوە و یوحناش هیچ ئاماژەیەکی پێ ناکات.

## نەبوونی ڕیوایەتی دامەزراندنی قوربانی پیرۆز لە ئینجیلی یوحنا

لە گرینگترین ئەو شتانەی سەرنجی خوێنەری ئازارەکان لە ئینجیلی یوحنا ڕادەکێشێ ئەوەیە کە ئەو هیچ ئاماژەیەك ناکات بۆ دامەزراندنی قوربانی پیرۆز لە کاتی دوا ئێوارەی مەسیح لەگەڵ قوتابییەکانی.

هیچ مەسیحییەك نییە لەبارەی وێنەی دوا ئێوارەی مەسیح لەگەڵ قوتابییەکانیدا نەزانێ. مەزنترین وێنەکێشەکان وێنەی ئەو دوا کۆبوونەوەیان کێشاوە کە تێیدا یوحنا بە تەنیشت مەسیحەوە دانیشتووە..ئەو یوحنایەی کە ڕاهاتووین بە دانەری ئەو ئینجیلەی دابنێین کە ناوی وی هەڵگرتووە.

ئەگەرچی ئەوە مایەی سەرسوڕمانی زۆرێك بێت کەچی زۆربەی پسپۆڕان یوحنای قوتابی بە دانەی ئینجیلی چوارەم دانانێن و ئەمیش باس لە دامەزراندنی قوربانی پیرۆز ناکات. لە کاتێکدا کە بە پیرۆز دانانی نان و مەی کە دەبنە جەستە و خوێنی مەسیح کردارێکی بنچینەییی سروتگەرای کلێسایی مەسیحییە. سێ ئینجیلەکەی تر ئەگەر بە واژەی جیاوازیش بێت باس لەم کردارە دەکەن، بەڵام یوحنا یەك وشەشی لەبارەوە ناڵێ. ڕیوایەتەکانی چوار ئینجیلەکە تەنها دوو خاڵی

هاوبەشیان تێدایە: پێشبینیکردنی نکوولّیکردنی بطرس و ناپاکیی یەکێك لە قوتابییەکان(تەنها لە ئینجیلی متی و یوحنا ناوەکەی دەهێنرێ کە یهوذا الاسخریوطي)ە. تەنها ئینجیلی یوحنا باسی شووشتنی پێی قوتابییەکان لە لایەن مەسیحەوە لە سەرەتای ئێوارەوە دەگێڕێتەوە.

## چۆن تەفسیری ئەم کەلێنە لە ئینجیلی یوحنادا دەکرێ؟

ئەگەر وامان دانا کە ڕیوایەتی سێ ئینجیلەکەی یەکەم ڕاستە و ویستمان بابەتییانە بیربکەینەوە ئەوا یەکەم شت کە بە زەینماندا دێت دەبێت وا دابنێین کە ئەم بڕگەیەی ئینجیلی یوحنا کە ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە ون بووە. بەلاّم نووسەرە مەسیحییەکان لێرەدا نەوەستاون. با لە هەندێ لە هەلّوێستەکانیان بکۆلّینەوە.

(ئە.تریکۆ) لە کتێبەکەیدا ( petit dictionaire du nouveau testament) لە وتارێکدا بە ناونیشانی (دوا ئێوارە)دا دەلّێ: ((ئەوە دوا نانی ئێوارە کە مەسیح لەگەلّ دوازدە قوتابییە هاوەلّەکەی خواردی کە تێیدا قوربانی پیرۆزی دامەزراند.ئێمە ڕیوایەتی ئەم ئێوارەیەمان لە هەر سێ ئینجیلە هاوڕێکەکە هەیە))(سەرچاوەکانی متی و لوقا و مرقس). ((ئینجیلی چوارەمیش وردەکاریی تەواوکاریمان پێدەدات))(سەرچاوەکانی یوحنا). لە وتارێکدا بە ناونیشانی (قوربانی پیرۆز) هەمان نووسەر دەلّێ: ((سێ ئینجیلەکەی یەکەم دامەزراندنی قوربانیی پیرۆز بە شێوەیەکی کورت دەگێڕێتەوە، ئەوەش خالّێکی زۆر گرینگ بوو لە ڕێنماییی مەسیحیدا. قەدیس یوحناش تەواوکارییەکی پێویستی داوەتە ئەو ڕیوایەتە کورتانە ئەوەش بە گێڕانەوەی وتاری مەسیح لەبارەی نانی

ژیان(الاصحاح٦: ٣٢–٥٨) )). نووسەر ئاماژە بەوە ناکات کە یوحنا دامەزراندنی قوربانی پیرۆزی لە لایەن مەسیحەوە نەگێڕاوەتەوە. دانەر باس لە وردەکاریی تەواوکاری دامەزراندنی قوربانی پیرۆز دەکات(لە واقیعدا مەبەست قاچ شووشتنی قوتابییەکانە). سەبارەت بە (نانی ژیان)یش کە نووسەر باسی دەکات مەبەست لێی باسکردنی مەسیحە لەو گەزۆیەی کە خودا لە بیابان بە جوولەکەکانی سەردەمی موسای بەخشی. یوحنا تاکە مژدەدەرە کە باسی ئەمە دەکات. بێگومان یوحنا لە برگەی دواتری ئینجیلەکەیدا ئاماژە بە ئاماژەی مەسیح بۆ قوربانیی پیرۆز دەکات، ئەوەش لە شێوەی تایبەت بە نان، هیچ مژدەدەرێکی تر باسی ئەم ڕووداوەی نەکردووە.

کەواتە مایەی سەرسوڕمان ئەوەیە کە یوحنا لەوەی سێیەکەی تر دەیگێڕنەوە بێدەنگ بووە و ئەوانەی تریش لە بەرامبەر ئەو قسانەی مەسیح لەسەر زاری یوحناوە کردوونی قرِوقەپ بوون.

ئەمە کەلێنێکی گەورەیە لە ئینجیلی یوحنادا و نووسەرە مەسیحییەکانیش لە تەرجەمەی مەسکونی بۆ ئینجیل دانی پێدا دەنێن بەڵام پاساوێك بۆ نەگێڕانەوەی دامەزراندنی قوربانی پیرۆز لە لایەن یوحناوە دێننەوە و دەڵێن: ((یوحنا بە گشتی هیچ بایەخێك بە نەریت و دامەزراوە کۆنەکانی ئیسرائیل نادات، ڕەنگە هەر ئەمەش بوویێت وای لێ کردبێت ئاماژە بە قوربانیی پیرۆز لە سروتەکانی جەژنی الفصح نەدات)).

ئەم گرفتە ڕاڤەکارانی ئەوەندە شڵەژاو کردووە تا ئاستێك زانایانی لاهوت لە گەڕانیان بە دوای وێنەیەکی سەرەتایی یان هاوشێوەی قوربانیی پیرۆز لە ڕووداوەکانی ژیانی مەسیح کە یوحنا دەیگێڕێتەوە فێڵ و حیلەبازی دەکەن. بەم

جۆرە (ئەی.کولمان) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (پەیمانی نوێ) وای دەبینێ کە: پەرجوو(معجزە)ی قانا و زۆربوونی نان بە جێگەی وێنەیەکی پێشوەختی نهێنیی ئێوارەی پیرۆزە(خواردنی قوربانیی پیرۆز). ئەوەی لە قانا ڕوویدا گۆڕینی ئاو بوو بۆ مەی کاتێ لە دەمی بووکگواستنەوەیەکدا ڕژێنرا((ئەوەش یەکەم پەرجووی مەسیح بووە و لەنێو هەموو مژدەدەرەکان تەنێ یوحنا لە الاصحاحی دووەمی ئینجیلەکەیدا — ئایەتەکانی ١ بۆ ١٢ باسی دەکات)). سەبارەت بە زۆربوونی کولێرەش(یوحنا إصحاحی شەشەم ئایەتەکانی ١ - ١٣) بە هۆی پەرجوویەکەوە پێنج کولێرە ئەوەندە زیادی کرد بەشی نانی پێنج هەزار کەسی کرد. کاتێ یوحنا ئەم ڕووداوانەی گێڕایەوە هیچ کۆمێنتێکی تایبەتی لەبارەوە نەداوە، کردەی نزیکخستنەوەی ئەم پەرجووانە لە دامەزراندنی قوربانیی پیرۆز تەنها لە سروشی خەیاڵی ڕووتی ڕاڤەکارە. خوێنەر هیچ هۆکارێك بۆ ئەم نزیکخستنەوەیە نابینێ، زۆر پەشۆکاویش دەمێنێتەوە کاتێ دەبینێ کە هەمان ئەم نووسەرە پێی وایە چاککردنەوەی ئیفلیج و کوێر مژدەی بەکاورکردن(تعمید)ن و (ئاو) و خوێنی هاتوو لە سینگی مەسیح دوای مردنی لە یەك ڕووداودا کۆدەبنەوە((ناردن بۆ تەعمید و قوربانیی پیرۆز)).

نزیکخستنەوەیەکی تری تایبەت بە قوربانیی پیرۆز لای هەمان ڕاڤەکار هەیە و باوکە ڕۆجی لە کتێبی (پێشەکییەك بۆ ئینجیل) باسی دەکات و دەبێژێت: (هەندێ لە زانایانی پسپۆڕی کتێبی پیرۆز وای دەبینن کە چیرۆکی شووشتنی قاچەکان بەر لە دوا ئێوارە هاوشێوەیەکی ڕەمزیی دامەزراندنی قوربانیی پیرۆزە)).

پێمان وا نییە قسەی نووسەرە مەسیحییەکان وا لە خەڵك بکات ئەو کەلێنە سەرسوڕهێنەی لە ئینجیلی یوحنادا هەیە بەئاسانی قەبوولّ بکەن، ئەم بنچینەیەی ئەم نزیکخستنەوە وەهمییانەی لەسەر دامەزراوە زۆر فشۆڵە.

## دەرکەوتنی مەسیح دوای هەستانەوەی:

پێشتر لەبارەی خەیاڵەوە نموونەیەکی زەقمان لە گێڕانەوە لە ئینجیلی متی خستە ڕوو بە تایبەت لە وەسفکردنی چەند دیاردەیەکی ناسروشتی کە هاوشانی مردنی مەسیح بووە. ئەو ڕووداوانەشی بە دوای هەستانەوەیدا هاتوون بۆتە کەرەستەیەك بۆ چەندان گێڕانەوەی ناساز بەڵکو نامۆ و سەمەرەی گشت مژدەدەرەکان.

باوکە ڕۆجی لە کتێبەکەیدا (پێشەکییەك بۆ ئینجیل) لاپەڕە ١٨٢ نموونەگەلێکمان لەبارەی ئەو تێکەڵ و پێکەڵی و پاشاگەردانی و ناسازییەی لەم گێڕانەوانەدا هەیە دەداتێ:

((لیستی ئەو ژنانەی هاتوونەتە لای گۆڕەکەی مەسیح لە سێ ئینجیلە هاوڕێکەکە یەکناگرنەوە. لە ئینجیلی یوحنا هەر ژنێك هەیە ئەویش مەریەمی مەجدەلییە. بەڵام ئەم بە جێناو کۆ قسە دەکات وەك ئەوەی هاوڕێی تری هەبن و دەڵێ: (نازانین لە کوێیان داناوە). بەڵام لە ئینجیلی متی فریشتەیەکە ئەوە بۆ ژنان ڕادەگەیەنێ کە ئەوان مەسیح لە جەلیل دەبینن. بەڵام ساتێك دواتر لە نزیك گۆڕەکەوە چاوی پێیان دەکەوێ. بێگومان لوقا هەستی بەم دژوارییە کردووە و لە سەرچاوەکەی کەمێك لایداوە، فریشتەکە دەڵێ: (لەبیرتانە چۆن لەگەڵتان دوا ئەو

کاتەی لە جەلیل بوو...) لە واقیعدا لوقا تەنها ئاماژە بە دەرکەوتنی سێ جاری مەسیح دوای هەستانەوەی دەکات..(بەڵام یوحنا دەڵێ: ئەو لە ماوەی هەشت رۆژدا دوو جار لە کۆڕی بیت المقدس دەرکەوت، پاشان بۆ جاری سێیەم لە نزیک دەریاچە دەردەکەوێت..کەواتە لە جەلیل. بەڵام متی تەنها باس لە یەك جار دەرکەوتنی مەسیح لە جەلیل دەکات)). نووسەر لەم توێژینەوەیەدا کۆتایی ئینجیلی مرقس کە باس لە دەرکەوتنی مەسیح دەکات دوور دەخاتەوە چونکە پێی وایە کە (بە قەڵەمێکی تر نووسرایە).

هەموو ئەمانە ناسازە لەگەڵ ئاماژەکانی دەرکەوتنی مەسیح کە لەو نامەیەی پۆڵسی یەکەمدایە بۆ خەڵکی کۆرنسوس(١٥ ، ٥ — ٧)، کە دەڵێ: مەسیح بێ ئەوەی خۆی لە یاد بکات لە یەك کاتدا بۆ ٥٠٠ کەس و جاك و هەموو حەوارییەکان دەرکەوتووە.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە باوکە رۆجی لە هەمان کتێبدا سەرکۆنەی ئەو ((ڕووداوە یاسابەدەرە بە هاشوهوش و منداڵانەی نێو هەندێ لە ئینجیلە ساختەکان لەبارەی هەستانەوەی مەسیح بکات)).

ئەم وەسفانە بەتەواوی بۆ متی و پۆڵسیش شیاو نین کە سەبارەت بە دەرکەوتنی مەسیح دوای هەستانەوەی لەگەڵ مژدەدەرەکانی تر ناتەبا و ناسازن؟!

زێدەباری ئەوەش ناسازییەك هەیە لە نێوان گێڕانەوەی (کاری پەیامبەران)ی دانراوی لوقا لەبارەی دەرکەوتنی مەسیح بۆ پۆڵس و قسەی پۆڵس لەو بارەیەوە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی باوکە کانینگسەر لە کتێبەکەیدا بە ناوی (ئیمان بە

هەستانەوە و زیندووکردنەوەی ئیمان) ١٩٤٧ ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە پۆڵس ((تاکە شایەتی بینەرە لەسەر هەستانەوەی مەسیح کە لە ڕێی نووسینەکانییەوە ڕاستەوخۆ دەنگی دەگاتە ئێمە، بەڵام هەرگیز باس لە دیداری شەخسیی خۆی لەگەڵ مەسیح دوای هەستانەوەی ناکات — ئەمە ئەگەر سێ ئاماژە زۆر بەپارێزانەمان هەڵوارد..)) ((بەڵکو لەمە زیاتریش: ڕێ بە خۆی نادات وەسفی ئەم دیدارە بکات)).

ناسازیی نێوان ئینجیلەکان و پۆڵس کە تاکە شایەتی بینەرە بەڵام جێی گومانە، ڕوونە.

(ئە.کۆلمان) لە کتێبەکەیدا (پەیمانی نوێ) تێبینی ناسازییەکانی نێوان لوقا و متی ی کردووە: یەکەم دەڵێ مەسیح لە الناصرە دەرکەوتووەتەوە، دووەمیان دەبێژێ لە جەلیل دەرکەوتووەتەوە.

سەبارەت بە ناسازیی نێوان لوقا و یوحنا با باسی ئەو ڕووداوە بکەین کە یوحنا دەیگێڕێتەوە(إلاصحاح ٢١، ئایەتەکانی ١ بۆ ١٤) لەبارەی دەرکەوتنی مەسیح دوای هەستانەوەی لە کەناری دەریاچەی تەبەرییە بۆ ماسیگرەکان و دوای ئەوەش ئەوان ماسییەکی زۆری ئەوتۆیان دەست کەوت کە نەیاندەتوانی هەڵی بگرن، ئەو گێڕانەوەیە هەمان ئەو موعجیزەی ڕاوەماسییەیە کە لە گێڕانەوەی لوقادا لە هەمان شوێن لە ژیانی مەسیحدا ڕووی داوە(إصحاحی پێنجەم، ئایەتەکانی ١ بۆ ١١).

## بەرزبوونەوەی مەسیح:

ناسازییەکان تا کۆتایی گێڕانەوەکان درێژ دەبنەوە چونکە نە یوحنا و نە متی ئاماژەیان بە بەرزبوونـەوەی مەسـیح نـەکردووە. تـەنها مـرقس و لوقـا بـاس لەمـە دەکەن.

بە لای مرقسـەوە(١٦ ، ١٩) مەسـیح ((بـۆ ئاسمـان بـەرز کراوەتـەوە و لـە لای ڕاستی خودا دانیشتووە))، ئەمەش بێ دیـاریکردنی مێـژووی هەسـتانەوەی. بـەڵام پێویسـتە تێبینییـەك بکـەن کـە کۆتـایی ئینجیلـی مـرقس کـە ئـەم ڕسـتەیەی لەخۆگرتووە دەقێکی ڕاست نییە: دەقێکە نوسراوە و دواتر زیاد کـراوە ئەگەرچـی کەنیسە بە یاسایی دادەنێ، ئەمەش بە پێی بۆچوونی باوکە ڕۆجی.

دەمێنێتەوە ئینجیلی لوقا کە ئەو تاقانەیە لە باسکردنی ڕووداوی بەرزبوونـەوە، ئەوەش لە دەقێکدا کە هیچ کەس مشتومڕی لـەبارەوە ناکـات. (٢٤ ، ٥١) دەڵـێ: ((مەسـیح لێیـان جیـا بـۆوە و بـۆ ئاسمـان هـەڵگیرا)). لوقـا ڕووداوەکـە دەخاتـە کۆتـایی گێڕانـەوەی هەسـتانەوەی مەسـیح دەرکـەوتنی بـۆ یـازدە حەوارییەکـە: وردەکـاریی گێڕانـەوەی ئینجیـل ئـەوەی تێدایـە کـە گوایـە بەرزبوونەوەکـە ڕۆژی هەستانەوە ڕووی داوە، بەڵام لە (کارەکانی پەیامبەران) — کە هـەمووان وا بـاوەڕ دەکـەن خـۆی نووسـەریەتی — جارەکـانی دەرکـەوتنی مەسـیح بـۆ حەوارییـەکان لەنێوان ئازارەکان و بەرزبوونەوە بەم واژانە وەسف دەکات: ((ئەو کاتەی خۆی بۆ دەرخستن و بە درێـژایی چـل ڕۆژ لـەبارەی مەلـەکوتی خـودا قسـەی بـۆ کـردن و ئەوانیش زیاتر لە نیشانەیەکیان لێی دەست کـەوت))(١ ، ٢-٣). ئـەم بڕگەیـە لـە (کارەکانی پەیامبەران) بنچینەی دیاریکردنی جەژنی مەسیحیی بەرزبوونەوەیـە بـە

چل ڕۆژ دوای الفصح کەوا بە بۆنەی هەستانەوەوە ئاهەنگ دەگێڕدرێ. کەواتە مێژوو بە پێچەوانەی ئینجیلی لوقاوە دیاریکراوە، زیاد لەوەش هیچ دەقێکی تری ئینجیل نییە ئەم دیاریکردنە مێژووییە پاساو بدات.

کابرای مەسیحی کە ئەم هەڵوێستە دەزانێ هەست بە سەرسوڕمان دەکات چونکە ناسازییەکە ڕوونە. لەگەڵ ئەوەشدا تەرجەمەی مەسکونی بۆ ئینجیل دان بەم واقیعەدا دەنێت بەڵام لە باسکردنی ئەو ناسازییە ڕۆناچێ، بەڵکو تەنها بەوەندە واز دەهێنێ ئاماژە بە ئەگەری گرینگیی ئەو چل ڕۆژە بۆ پەیامی مەسیح بکات.

ئەو نووسەرانەی دەیانەوێ هەموو شتێك ڕاڤە بکەن و سازان لەنێوان ئەو بابەتانە بکەن کە ناسازێن، لەم بارەوە چەند لێکدانەوەیەکی نامۆ و سەیرمان پێ دەدەن.

چاپی چوار ئینجیلە هاوڕێکەکە کە قوتابخانەی کتێبی پیرۆز لە قودس لە ساڵی ١٩٧٢ بڵاوی کردەوە کۆمێنتی زۆر سەیری تێدایە.

تەنانەت وشەی (بەرزبوونەوە) بابەتی ئەم ڕەخنەیەیە: ((لە واقیعدا بەرزبوونەوە بە واتای فیزیکی وشە ڕووی نەداوە، بۆ خودا ژوورو و خوارو یەکە))(ئەوها !). خوێنەر بە باشی لەم سەرنجە تێ ناگات و دەپرسێ لوقا چۆن دەیتوانی ئەم قسەیە بە شێوەیەکی تر دەربڕێ..

## دوا قسەکانی مەسیح، paraclet لە ئینجیلی یوحنا:

یوحنـا تاکـە مـژدەدەرە کـە ڕووداوەکـانی دوا ئێـوارەی مەسـیحی بـەر لـە دەسـگیرکردنی گێڕاوەتـەوە، واتـە دوا قسـەکانی لەگـەڵ حەوارییـەکان، ئـەم ڕووداوەش بە وتارێکی درێژ کۆتایی دێت. ئینجیلی یوحنا چوار إصحاح(لە ١٤ تا ١٧) بۆ ئەم ڕیوایەتە تەرخان دەکات کە لە ئینجیلەکانی تردا هیچ شوێنەوارێکی لێ نابینین.

چۆن نەبوونی ئەم ڕیوایەتی ماڵئاواییە کاریگەرە کە ڕاسپاردەی ڕۆحیی مەسیح لە خۆدەگرێ لە ئینجیلەکانی متی و مرقس و لوقا ڕوون بکەینەوە؟ دەکرێ ئەم پرسیارە بکەین: ئایا یەکەم جار دەقەکە لە کن سێ مژدەدەرەکەی تر هەبووە؟ ئایا دواتر لانەبراوە؟ بۆچی؟ با دەسبەجێ بڵێین: ناتوانرێ هیچ وەڵامێک بدرێتەوە، بە نیسبەت ئەم کەلێنە گەورەیەی لە ڕیوایەتی هەر سێ مژدەدەرەکەی یەکەمدا هەیە مەتەڵەکە بەتەواوی کلۆم دراوە.

کرۆکی ڕیوایەتەکە بریتییە لە ئایندەی ئەو مرۆڤەیە کە مەسیح لەبارەیەوە دەدوێ و بایەخپێدانی مەسیحە بە قوتابییەکانی و مرۆڤایەتی لە ڕێی ئەمانەوە، ڕێنمایی و فەرمانەکانی دەدات و بە شێوەیەکی کۆتایی ئەو ڕێبەرە دیاری دەکات کە پێویستە دوای نەمانی خۆی مرۆڤایەتی شوێنی بکەوێت. دەقی ئینجیلی یوحنا – تەنێ ئەم دەقەش– بە شێوەیەکی ئاشکرا ناوی ئەم ڕێبەرە بە ناوێکی یۆنانی parakletos دەهێنێ کە لە فەرەنسیدا بۆتە paraclet. ئەمەش چەند بڕگەیەکی بنەڕەتیی ئەم وتارەیە بەپێی تەرجەمەی مەسکونی:

((ئەگەر منتان خۆشدەویٚ ئەوا کار بۆ شوێنکەوتنی فەرمانەکانم دەکەن، منیش نوێژ بۆ ئەو باوکە دەکەم کە paraclet یێکی ترتان پێ دەبەخشێ.))(١٤، ١٥ – ١٦).

وشەی paraclet واتای چییە؟ ئەو دەقەی ئینجیلی یوحنا کە ئێستا لە لامانە بەم واژانە واتاکەی ڕوون دەکاتەوە:

((paraclet ڕۆحی پاك (الروح القدس)، لەمەودوا باوك بە ناوی منەوە بۆتانی دەنێرێ و هەموو شتێکتان پێ ڕادەگەیەنێ و واتان لێ دەکات هەموو ئەو شتانەتان بیربێتەوە کە پێتانم گووتوە.))(١٤ ، ٢٦).

((ئەو خۆی شایەتیم بۆ دەدات)) (١٥ ، ٢٦).

((کۆچکردنم سوودی بۆتان هەیە، چونکە ئەگەر ئەز نەڕۆم paraclet نایەت بۆ کنتان، بە پێچەوانەوە ئەگەر ڕۆیشتم ئەوا ئەوتان بۆ دەنێرم. ئەو بە هاتنی، سەبارەت بە گوناە و داد و دەسەلات جیهان سەرسام دەکات..))(١٦، ٧–٨).

((کاتێ ڕۆحی حەقیقەت دێت، واتان لێ دەکات بەرەو حەقیقەتی تەواو بەرز ببنەوە، چونکە ئەو بە ویستی خۆی نادوێ بەڵکو ئەوە دەڵێ کە دەیبیستێ و هەموو ئەو شتانەتان پێ دەناسێنێ کە دواتر دێت. بەرز و پایەداریشم ڕادەگرێ..))(١٦، ١٣–١٤).

باوکە تریکۆ لە (فەرهەنگی بچووکی پەیمانی نوێ) لەبارەی وشەی paraclet دەڵێ:

((ئەم ناوە یان ئەم سیفەتە گواستراوە لە یۆنانییەوە بۆ فەرەنسی لە پەیمانی نوێدا بەکارنەهاتووە تەنها لە ئینجیلی یوحنادا نەبێ: ئەو لە دەمی گێڕانەوەی وتارەکەی مەسیح لە دوا ئێوارەیدا چوار جار ئەم وشەیە باس دەکات(١٤ ، ١٦ و ٢٦: ١٥ ، ٢٦ ، ١٦ ، ٧) جارێکیش لە پەیامی یەکەمیدا(٢ ، ١). وشەکە لە ئینجیلی یوحنادا بە واتای رۆحی پاك دێت، بەلام لە پەیامەکەدا مەبەست لێی مەسیحە. وشەی paraclet لە لای جوولەکە هیللنستییەکانی سەدەی یەکەم بە واتای ناوەندکار و بەرگریکار بلاو بووە(...)مەسیح رایدەگەیەنێ کە رۆح بە باوك و کورەوە بۆ رزگاركردن دەنێردرێ. رۆح دەخالەت دەکات و وەکو جێگرەوە(بدیل)ی مەسیح بە ئیعتیباری paraclet کاردەکات یان ناوەندکارێکی زالّ بەسەر هەموو شتێك)).

کەواتە ئەم کۆمێنتە رۆحی پاك دوای نەمانی مەسیح دەکاتە رێبەرێکی بالاتر لە مرۆڤ. ئایا ئەمە لەگەلّ دەقی یوحنا دەگونجێ؟

پێویستە گرفتەکە بخەینە روو، لە رووی مەبدەئییەوە سەیر دێتە بەرچاو ئەگەر ئەم برگەیەی پێشوو بدەینە پالّ رۆحی پاك کە دەلّێ: ((ئەو بە ویستی خۆی نادوێ بەلّکو ئەوە دەلّێ کە دەیبیستێ و هەموو ئەو شتانەتان پێ دەناسێنێ کە دواتر دێت.)).

وا دەردەکەوێ کە نامەعقولّ بێت کە دەسەلاتی قسەکردن و گوتنی ئەوەی دەیبیستێ بدەینە پالّ رۆحی پاك.. بە پێی زانیاریی من ئەم پرسە کە لۆژیك رادەسپێرێ بخرێتە روو بە گشتی بابەتی هیچ کۆمێنتێك نییە.

بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی دروستمان لەبارەی گرفتەکەوە هەبێ پێویستە بگەڕێینەوە بۆ دەقە یۆنانییە بنەڕەتییەکە، ئەمەش لە گرینگییەکەیدا یەکسانە بە داننان بەوەی کە یوحنا بە یۆنانی نووسیوە نەك بە زمانێکی تر.

ئەو دەقە یۆنانییەی بۆی گەڕاینەوە بریتییە لە دەقی Novum Testamentum Graece چاپی نەستلی و ئەلەند ١٩٧١.

هەر ڕەخنەگرتنێکی جیددیانە لە دەقەکان بەوە دەست پێدەکات بە دوای جیاوازییەکانی نێو دەقەکان بگەڕێیت. لێرەدا دەردەکەوێ کە لە کۆی دەسنووسە ناسراوەکانی ئینجیلی یوحنا دەقێکی تری جیاوازی ئەوتۆ نییە کە واتاکە بگۆڕێ جگە لە برگەی( ١٤ ، ٢٦ ) لەو دەسنووسە سریانییەی بە Palimpsete بەناوبانگە، برگەکەش تەنها ئاماژە بۆ ڕۆح ناکات بەڵکو بۆ ڕۆحی پاك. ئایا ئەمە تەنها لەبیرچوونەوەیەکە لە لایەن نووسەرەوەوە یان نەیوێراوە شتێك بنووسێ کە پێی وا بووە نامەعقووڵە لە بەرامبەر دەقێکدا کە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە ڕۆحی پاك دەبیستێ و دەدوێ؟ جگە لەم تێبینییە و هەندێ جیاوازیی ڕێزمانی کە هیچ لە واتای گشتیی دەقەکە ناگۆڕێ، لێرەدا هیچ بوارێك نییە بۆ پێداگرتن لەسەر جیاوازیی دیکەی دەقەکان.

ئەوەی گرینگە ئەمەیە کە ئەوەی لێرەدا لەبارەی دەلالەتی دیایکراوی هەردوو کاری (دەبیستێ) و (دەدوێ) بەسەر هەموو دەسنووسەکانی ئینجیلی یوحنادا دەچەسپێ و لەنێویدا ئەم حاڵەتەی ئێرەش.

کاری (دەبیستێ enenedre) لە وەرگێڕانی فەڕەنسییدا بریتییە لە کاری (Akouo) بە یۆنانی و واتە وەرگرتنی دەنگەکان. بۆ نموونە کارە یۆنانییەکە

دەکاتە وشەی (Acoustique)ی فەرەنسی و (Acoustics) بە ئینگلیزی و واتە: دەنگناسی(علم الاصوات).

بەڵام کاری (parlet) لە وەرگێرانی فەرەنسی بریتییە لە کاری Laleo بە یۆنانی و واتای گشتی بریتییە لە دەرکردنی دەنگەکان بە تایبەتی دەنگی قسە.ئەم کارە لە دەقە یۆنانییەکە زۆر دووبارە دەبێتەوە ئەوەش وەکو ئاماژەیەك بۆ لێدوانی مەسیح لە کاتی بانگەوازەکەیدا. کەواتە وا دەردەکەوێ کە لێرەدا مەبەست لە پەیوەندیکردن بە خەڵك هەرگیز وای لێ ناخوێنرێتەوە کە لە کاری رۆحی پاکە. بەڵکو بریتییە لە پەیوەندییەکی خاوەن مۆرکێکی ماددییانەی روون، ئەوەش بە هۆی چەمکی دەرکردنی دەنگ کە چەمکێکە پەیوەستە بەم وشە یۆنانییەی دەیزانیت.

هەر دوو کارە یۆنانییەکە (Akouo و Laleo) مەبەست لێیان دوو کاری ماددییە ناکرێ تایبەت بن بوونەوەرێك مەگەر ئەندامێکی بۆ بیستن و یەکێکی تری بۆ قسەکردن هەبێ. بەم جۆرە پیادەکردنی ئەم دوو کارە بەسەر رۆحی پاك کارێکی نەکردەنییە. دەقی ئەم برگەیەی ئینجیلی یوحنا هەروەکو لە دەسنووسە یۆنانییەکانەوە بە دەستمان گەیشتووە بە هیچ شێوەیەك شیاوی تێگەیشتن نییە ئەگەر بەتەواوی لەگەڵ هەردوو وشەی (رۆحی پاك) لە ئایەتی ٢٦ی إصحاحی ١٤ پەسندمان کرد: ((paraclet ئەو رۆحە پاکەی کە باوك بە ناوی منەوە دەینێرێ...))هتد. ئەوە تاکە رستەیە لە ئینجیلی یوحنا کە هاوشێوەییەك لەنێوان paraclet و رۆحی پاك دەچەسپێنێ.

بەڵام ئەگەر هەر دوو وشەی رۆحی پاکمان (to pneume to again) لەم رستەیەدا سرییەوە ئەوا ئەو کات هەموو دەقەکەی یوحنا دەلالەتێکی زۆر روون بە

دەستەوە دەدات. زیاتر لەوەش ئەم دەلالەتە شێوەیەکی ماددی وەردەگرێ و ئەوەش لە میانەی دەقێکی تری یوحناوە کە بریتییە لە دەقی نامەی یەکەم کە هەمان ئەم وشەیە paraclet بەکاردێنێ بۆ ئاماژەکردن بۆ مەسیح وەکو ناوەندکارێکی لای خودا.

بە پێی ئینجیلی یوحنا (١٦ ، ١٤) کاتێ مەسیح دەڵێ: ((نوێژ بۆ خودا دەکەم و paraclet ێکی ترتان بۆ دەنێرم)) دەیەوێ بڵێ: ئەو بۆ مرۆڤ ناوەندکارێکی (دیکە) دەنێرێ هەروەکو خۆی لە کاتی ژیانیدا لەسەر زەوی لە بەرژەوەندی مرۆڤ ناوەندکاری لای خودا بوو.

ئەوەش بەوپەڕی لۆژیکەوە دەمانبات بەرەو ئەوەی کە لە paraclet ی لای یوحنا بوونەوەرێکی مرۆیی وەکو مەسیح خاوەن هەر دوو هەستی بیستن و قسەکردن ببینین، دەقەکەی یوحناش بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە هەر ئەم دوو هەستەی لەخۆگرتووە. کەواتە مەسیح ڕایدەگەیەنێ کە دواتر خودا بوونەوەرێکی مرۆیی بۆ سەر ئەم زەوییە دەنێرێ تا ئەم ڕۆڵە بگێڕێ کە یوحنا باسی کردووە و با بە کورتی بڵێین: ڕۆڵی پێغەمبەرێکە دەنگی خودا دەبیستێ و پەیامەکەی بە گوێی خەڵك دەدا. ئەوەش تەفسیری لۆژیکییانەی دەقەکەی یوحنایە ئەگەر واتای ڕاستەقینەمان بە وشەکان بەخشی.

بوونی هەر دوو وشەی (ڕۆحی پاك روح القدس) لەو دەقەی ئەمڕۆ لەبەر دەستمانە لەوانەیە لە زیادکردنێکی تەواو خۆویستانەی دواتر هەڵقوڵا بێت کە ئامانج لێی بەلاڕێدا بردنی واتای یەکەمی ئەو برگەیە بێت کە هاتنی پێغەمبەرێکی تر دوای مەسیح ڕادەگەیەنێ، چونکە ئەمە ناسازە لەگەڵ بیروباوەڕی کەنیسەی مەسیحی کە دەیەویست مەسیح دوا پێغەمبەر بێت.

# دوماهی

ئەو باسوخواسانەی ئێرە و قسە و کۆمێنتی ئەو ڕاڤەکارە دیارە مەسیحییانەی ئاماژەیان پێ کرا سەر دەکێشێ بۆ ڕەتکردنەوەی بانگەشە پووکەشەکان، ئەوەش بە پشتبەستن بەو هێڵەی ئەم کۆڕەی دوایی پەسندی کردووە کە تایبەتە بە مێژوویبوونی ڕەهای ئەو ئینجیلانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکرێ گوایە بە ئەمانەتەوە کردەوە و زانیارییەکانی مەسیحیان گواستۆتەوە.

ئەو بەڵگانەشی خرانەڕوو چەند بەشێك بوون:

یەکەم: دەستەواژەگەلێك لە ئینجیلەکان هاتوون خۆیان ناسازیی گەورە دەسەلمێنن. ناکرێ باوەڕ بە دوو بابەتی ناساز بکرێ. ناکرێ هەندێ بابەتی نامەعقوول قەبوول بکرێ کە ناکۆکە لەگەڵ ئەو پێدراوانەی زانیارییە نوێیەکان بە تەواوی سەلماندوویانە. دوو درەختەنەژادی مەسیح کە ئینجیلەکان دەیخەنەڕوو لەگەڵ ئەو بابەتە نادروستانەی تێیاندایە بەڵگەیەکی دیارن لەم بارەوە.

زۆرێك لە مەسیحییەکان ئاگایان لەو ناسازی و بابەتە نامەعقولانە یان ئەوانەی لەگەڵ زانست ڕێکناکەون نییە، ئەوان تووشی حەپەسان دەبن کاتێ هەموو ئەوانە کەشف دەکەن: ئەوان هەمیشە کاریگەر بوون بە خوێندنەوەی ئەو کۆمێنتانەی ڕوونکردنەوەی ورد دەدەن کە دڵنیایان دەکاتەوە، لەمەشدا گۆرانی ستایشکارانە کۆمەکییان دەکات. هەندێ نموونەی دیارمان لەبارەی زیرەکیی هەندێ ڕاڤەکار لە شاردنەوەی ئەوەی بە شەرمەوە ناوی دەنێن((دژواری)).

لە واقیعدا ئەو بڕگانەی ئینجیلەکان کە دان بە ناڕاستییان نراوە زۆر کەمن، لەگەڵ ئەوەشدا کەنیسە یاساییبوونیانی ڕاگەیاندووە.

دووەم: توێژینەوە نوێیەکانی ڕەخنەگرتن لە دەقەکان ئەو پێدراوانەیان ڕوون کردۆتەوە کە بە پێی ڕای باوکە کانینگسەر دەبێتە (شۆڕشێك لە ڕێبازەکانی تەفسیر) کە سەردەکێشێ بۆ ئەوەی حەرفییانە بابەتەکانی پەیوەست بە مەسیح لە ئینجیلەکان لێك نەدەینەوە. زانیارییە نوێیەکان کە ڕووناکییان خستۆتە سەر مێژووی یەهودی — مەسیحی و ململانێی نێوان تایەفەکان بوونی بابەتگەلێك ڕۆشن دەکەنەوە کە خوێنەرانی ئەم سەردەمە واقوڕماو دەکەن، چیتر چەمکی مژدەدەرەکان وەکو شایەت عەیان شیاوی داکۆکی لێکردن نییە ئەگەرچی تا ئەمرۆش هێشتا ئەمە تێگەیشتنی زۆرێك لە مەسیحییەکانە.دانراوەکانی قوتابخانەی کتێبی پیرۆز لە قودس (باوکە بینوا و باوکە بوامار) بەباشی ئەوە دەسەلمێنێ کە ئینجیلەکان زیاتر لە جارێك نووسراونەوتەوە و پاکنووس کراون و ڕاستکراونەتەوە، بۆ ئەم دوو نووسەرە ورِیایی دەدەنە خوێنەری ئینجیل کەوا لەسەری پێویستە لە زیاتر لە حاڵەتێك واز لەوە بێنێ گوێبیستی دەنگی ڕاستەوخۆی مەسیح بێت.

سێیەم: مۆرکی مێژووییانەی ئینجیلەکان هیچ مشتومڕێك هەڵناگرێ، بەلام ئەم بەڵگەنامانە بەر لە هەر شتێك و لە ڕێی گێڕانەوەکانی تایبەت بە مەسیح عەقڵییەتی وتەبێژانی تایەفە بەراییەکانی مەسیحییەتمان پێ دەناسێنن و بەتایبەتی ئەو دوژمنایەتییانەمان پێ دەناسێنن کە لە نێوان یەهودە مەسیحییەکان و پۆڵسدا هەبووە: توێژینەوەکانی کاردینال دانیلۆ لەم خاڵانە بە بەڵگە دادەنرێن.

کەواتە چۆن سەرسوڕماو دەبین لە شێواندنی هەندێ لە ڕووداوەکانی ژیانی مەسیح لە لایەن مژدەدەرەکانەوە، ئەوانەی کە ئامانجیان بەرگریکردن لە

تێڕوانینی شەخسیی بووە. چۆن لە سرپینەوەی هەندێ ڕووداو واقورماو دەبین، چۆن لە مۆرکی ڕۆمانئاسایانەی هەندێ ڕووداوی تر سەراسیمە دەبین؟

ئەمە سەردەکێشێ بۆ ئەوەی ئینجیل بە هۆنراوەی داستانی لە ئەدەبی سەدەکانی ناوەڕاست بەراورد بکەین. ئەم بەراوردکردنە لەگەڵ (داستانی ڕۆلان) تێك دەکاتەوە، ئەو داستانە کە لە شێوەی ڕۆمان دەگێڕدرێتەوە و لە بەناوبانگترین داستانەکانە بە ڕاستی ڕوویداوە. ئایا خوێنەر دەزانێ کە ئەم داستانە ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەگێڕێتەوە: دواوەی سوپای شارلمان کە ڕۆلان لە ڕاڕەوی ڕەنسفۆ فەرماندەیی دەکرد دەکەوێتە نێو بۆسەیەکەوە، ئەم ڕووداوە کە خودان گرینگایەتییەکی لاوەکییە لە ١٥ی ئابی ساڵی ٧٧٨ ز ڕوویداوە، ئەم ڕووداوە ئەوەندە گەورە کراوە تا ئەوەی کراوەتە شەڕێکی پیرۆز. ڕیوایەتەکە خەیاڵییە، بەڵام ئەم خەیاڵە حەقیقەتی یەکێك لە شەڕەکانی شارلمان ناشارێتەوە کە بۆ پاراستنی سنوورەکانی لە دزەکردنی گەلە دراوسێیەکانی کردوویەتی: ئەمە ڕاستەکەیە، شێوە داستانئاساکەی ڕیوایەتەکە نایسرێتەوە.

هەمان شتیش بە نیسبەت ئینجیلەکانەوە: خەیاڵەکانی متی و ناسازییە زەقەکانی نێوان ئینجیلەکان و بابەتە نامەعقوڵەکان و نەسازان لەگەڵ پێدراوەکانی زانستی نوێ و دەسکارییە یەك لە دوای یەکەکانی دەقەکان، هەموو ئەمانە وا لە ئینجیلەکان دەکات إصحاح و بڕگەگەلێك لە خۆبگرن کە تەنێ هەڵقوڵاوی ئەندێشەی مرۆڤ بن. بەڵام ئەم خەوشانە بوونی پەیامی مەسیح ناخەنە گومانەوە: تەنها گومان دەکەوێتە سەر ئەو چۆنێتییەی پێی ئەنجام دراوە.

# دەسپێك

سەرەتا کۆکردنەوە لەنێوان قورئان و زانست مایەی سەرسوڕمانە. بەتایبەت کە مەبەست لەم پەیوەندیی کۆکردنەوەیە پێکەوەسازانی هەردووکیانە نەك لێك دوورکەوتنەوە. ئایا زۆرانێك وا نابینن کە پێکگرتنی کتێبێکی ئایینی بە پێدراوە زانستییەکان کارێکی تازەبابەتی سەردەمەکەمانە؟ لە واقیعدا بەدەر لە هەندێ حاڵەتی دەگمەن دەنا زۆرینەی زاناکان کە تیۆرە ماددییەکان مەشرەبیانە زۆربەی کات لە بەرامبەر پرسە ئایینییەکان هەڵوێستێکی بایەخ پێنەدان یان سووك سەرنجدان دەگرنەبەر و زۆر جاریش ئایین بە دامەزراو لەسەر ئەفسانە دادەنێن.

لەوە زیاتریش، ئێمە کاتێك لێرە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا باس لە زانست و ئایین دەکەین ئەوە فەرامۆش دەکەین ئیسلام ڕەگەڵ یەهودییەت و مەسیحییەت بخەین، بڕیارگەلی نادروست کە لەسەر تێگەیشتنی هەڵە دامەزراوە و لە دژی ئیسلام دەرچووە ئەوەندە فرەیە بە چەشنێك زۆر سەختە بۆ مرۆڤ بیرۆکەیەکی ساغڵەمی لەبارەی ئیسلام لە واقیعدا هەبێ.

بۆیە ئەگەر ئەمڕۆ بمانەوێ هەر بەراوردێك لەنێوان ئیسلام و زانستەکاندا بکەین سەرەتا پێویستە چاوپێداخشانێکی گشتی بە ئیسلامدا بکەین، ئەو ئیسلامەی هەمیشە لە وڵاتەکانماندا بەدحاڵیبوونمان لێی هەبووە.

ئەو بڕیارگەلە تەواو چەوتانەی لە ڕۆژئاواوە لەبارەی ئیسلامەوە دەردەچن هەندێ کات لە نەزانینەوەو هەندێ کاتیش لە گەوجاندنی بەئەنقەستەوە سەرچاوەی گرتووە. بەڵام ترسناکترین ناڕاستییەکان ئەوانەن کە پەیوەستن بە کارە کردەنییەکان، ئەگەر ئێمە بتوانین لە هەڵەکانی تایبەت بە خەمڵاندن ببوورین ئەوا ناتوانین لەوە چاو بپۆشین کە ڕووداوەکان بە جۆرێك بخرێنەڕوو کە

پێچەوانەی حەقیقەت بن. بەڵکو ئێمە تووشی حەپەسان دەبین کاتێ لە دانراوە زۆر جیددییەکان درۆگەلێکی زەق دەبینین ئەگەرچی دانەرەکانیشیان بە دانەری لێهاتوو حیساب دەکرێن. فەرموون ئێوەو نموونەیەك لەم بارەیەوە: لە ئینسکلۆپێدیای یونیڤێرسالیس، بەشی شەشەم، لەژێر ناوونیشانی (ئینجیلەکان)دا ئاماژەیەك لەبارەی جیاوازیی ئینجیلەکان لە قورئان دەبینین. دانەر دەبێژێ: ((مژدەدەران ئەو بانگەشەیە ناکەن هەر وەکو قورئان دەیکات گوایە گواستنەوەی ژیاننامەیەکە خودا بە شێوەیەکی موعجیزەئاسا بەسەر موحەممەدیدا دابەزاندووە)). لە ڕاستیدا هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێوان قورئان و ئەوەی دانەر ناوی دەنێ ((ژیاننامە)): قورئان پەیامە. تەنانەت ئەگەر دانەر سەیری خراپترین تەرجەمەی قورئانیشی کردبایە ئەوەی بۆ ساغ دەبۆوە..بەرپرسی ئەم درۆیەی کە تایبەتە بە قورئان ئوستازێکی زانکۆی یەسوعییە لاهوتییەکانی شاری لیونە. بڵاوکردنەوەی درۆگەلی لەم چەشنە بەشداری دەکات لە بەخشینی وێنەیەکی ساختە لەبارەی قورئان و ئیسلام.

لەگەڵ ئەمەشدا لێرەدا هۆکارگەلێکی ئومێدبەخش هەن، لەبەرئەوەی ئەمڕۆ ئایینەکان چیتر داخراو و گۆشەگیر نەماون، زۆرێکیش بە دوای لێکتێگەیشتنی هاوبەش دەگەڕێن. ئەوەی ئەمڕۆ مایەی پێزانینە ئەوەیە کە لە بەرزترین ئاستە فەرمییەکان ڕوودەدات بە جۆرێك کەوا مەسیحییە کاسۆلیکەکان دەکۆشن ئەڵقەکانی پەیوەندی لەگەڵ موسڵمانان دامەزرێنن و هەوڵ دەدەن لێکتێنەگەیشتن نەهێڵن و تەقەلا دەدەن تێڕوانینە ناڕاستە باوەکان لەبارەی ئیسلام ڕاست بکەنەوە.

لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا باسم لەو گۆڕانکارییە مەزنە کرد کە لەم ساڵانەی دوایی ڕوویداوە و ئاماژەم بەو بەڵگەنامەیە کرد کە لە سکرتارییەتی ڤاتیکان بۆ کاروباری نامەسیحییەکان بە ناونیشانی (ڕێنماییگەلێك بۆ دامەزراندنی گفتوگۆ لەنێوان مەسیحی و موسڵمانان) دەرچووە.

بەڵگەنامەیەکی زۆر واتامەلگرە لەمەڕ ئەو هەڵوێستە نوێیانەی بەرامبەر ئیسلام دەگیرێنەبەر. لە چاپی سێیەمی ساڵی ١٩٧٠ ی ئەم توێژینەوەیە ئەم ڕێنماییانە داوای (پێداچوونەوە بە هەڵوێستەکانمان لەبارەی ئیسلام و ڕەخنەگرتن لە بڕیارە پێشوەختەکانمان) دەکات... (پێویستە یەکەم جار وردە وردە عەقڵییەتی برا مەسیحییەکانمان بگۆڕین، ئەوە بەر لە هەموو شتێك شیاوی بایەخە)).. پێویستە وازبهێنرێ (لەو وێنە ڕزیوەی ڕابردوو بۆی بەجێهێشتووین یان درۆ و بڕیاری پێشوەخت شێواندوویەتی)).. هەروەها (پێویستە دان بنرێ بەو ستەمانەی ڕۆژئاوای مەسیحی دەرهەق موسڵمانانی کردووە).. بەم شێوەیە بەڵگەنامەکەی ڤاتیکان — سەت و پەنجا لاپەڕەیەك دەبێ — ڕوانینە کلاسیکییەکانی مەسیحییەکان لەبارەی ئیسلامەوە پووچەڵ دەکاتەوە و هەروەها خستنەڕوویەکیش لەبارەی ئیسلام لە واقیعدا دەخاتەڕوو.

لەژێر ناونیشانی (ئەگەر لە زۆربەی بڕیارە پێشوەختەکانمان خۆ ڕزگار بکەین گەورەییە)، دانەرانی ئەم بەڵگەنامەیە ئەم بانگەوازەیان ئاراستەی مەسیحییەکان کردووە: (هەروەها پێویستە لێرە بەقووڵی لە عەقڵییەتەکانمان خۆ پاکبکەینەوە، ئەوە دەڵێین و بەتایبەتی بیر لە هەندێ لەو بڕیار ئامادەکراوانە دەکەینەوە کە زۆر جار بە سووکایەتییەوە لەبارەی ئیسلامەوە دەرماندەکرد. وا دەردەکەوێ گرینگ

و بنەڕەتی بێت بۆمان کە واز لەوە بێنین لە ناخی دڵەکانمان پەرە بە ڕوانینە خێراکان بەڵکو کۆنترۆڵخوازییەکان بدەین)..

لێرەدا یەکێك لە ڕوانینە ناڕەوایەکان کە زۆر گرینگە و بەرەو ئەوەمان دەبات وشەی Allah لە زمانەکەمان وەکو واتایەك بۆ خودای موسڵمانان لە زمانی فەڕەنسی خراپ بەکاربێنین، وەکو ئەوەی موسڵمانان خودایەکی غەیری خودای مەسیحییەکان بپەرستن. وشەی Dieu بە زمانی عەرەبی واتای خودای بالاّ و مەبەست لێی خودای تاك و تەنیایە. ئەوە واتای ئەوەیە کە گواستنەوەی دروستی وشەکە بۆ فەڕەنسی ڕاست نابێ مەگەر بە پەنابردن بۆ وشەی Dieu نەبێ.خودای موسڵمان خودایەکی تر نییە جگە لە پەروەردگاری موسا و مەسیح.

بەڵگەنامەی سکرتارییەتی ڤاتیکان بۆ کاروباری نامەسیحییەکان بەم واژانە جەخت لەسەر ئەم پێدراوە بنەڕەتییە دەکاتەوە:

(وای دەبینین ناڕەوایە لەگەڵ هەندێ لە ڕۆژئاواییەکان دەست بەوەوە بگرین کە الله لە حەقیقەتدا خودا نییە).! دەقەکانی ئوسقوفەکانی ڤاتیکانی دووەم ئەم چەشنە گومانەی شەرمەزار کردووە. ئەگەر بمانەوێ ئیمانی موسڵمانان بە خودا کورت بکەینەوە بەو دەستەواژانە باشتر ناهێنین کە لە کتێبی Lumen Gentium دا هاتووە: (ئەو موسڵمانانەی باوەڕیان بە ئیبراهیم هەیە لەگەڵ ئێمە خودای تاقانە دەپەرستن، خودای بەسۆز و خاوەن پاداشت و سزای ڕۆژی دوایی)).

لێرەوە ناڕەزاییی موسڵمانان لەو نەریتە زۆر بڵاوە تێدەگەین ئەویش گواستنەوەی حەرفییانەی واژەی Allah یە لە زمانە ئەورووپییەکان لەبری

وەرگێـڕان بـە وشـەی Dieu ی فەڕەنسـی. ڕووناکبیرە موسـڵمانەکان ستایشـی وەرگێڕانی قورئانیـان لـە لایـەن د.ماسـونەوە کـرد چـونکە دواجـار وشـەی Allah وشەی Dieu بەکارهێنا..

دەقەکەی ڤاتیکان ئاماژە دەکات بەوەی کە(الله تاکە وشـەی عەرەبییـە کـە لـە کن مەسیحییە عەرەبەکان دەلالەت بێت بۆ خودای تاك و تەنیا).

موسـڵمانان و مەسـیحییەکان یـەك خـودا دەپەرسـتن. بەڵگەنامەکـەی ڤاتیکـان ڕەخنە لە هەندێ بڕیاری تری هەڵە سەبارەت بە ئیسلام دەگرێ:

((زەبروزۆری ئیسلام))، ئەم بڕیـارە پێشـوەختە زۆر بـڵاوە، بەڵگەنامەکە لێـی دەکۆڵێتەوە و بە بەڵگەی چـەند ئایـەتێکی قورئـان و بـە چـەمکی بەرپرسـیارێتیی مرۆڤ لە بەرامبەر کردەوەکانیـدا پووچـەڵی دەکاتـەوە. بەڵگەنامەکـە چـەوتیی ئـەو تێگەیشـتنە ڕوون دەکاتـەوە کـە پێـی وایـە بنـەما ئیسـلامییەکان حـەرفیین و بـە تێگەیشتنێکی پێچەوانە کە بڕوای بـە دڵسـۆزی لـە ئیمانـە بـەرەنگاری دەبێتـەوە، ئـەوەش بـە باسـکردنی ئـەم دوو دەسـتەواژەیەی قورئـان کـە ڕۆژئاواییـەکان لێـی بێئاگان.

﴿لا إكراه في الدين﴾ (سورة البقرة ئایەتی ٢٥٦).

﴿وما جعل عليكم في الدين من حرج﴾(سورة الحج ئایەتی ٧٨)

بەڵگەنامەکە بەرهەڵستی ئەو بیرۆکەیەی لـەبارەی ئیسـلامەوە بـڵاوە کـە گوایـە ئایینی ترسە، بە بیرۆکەی ئیسلام ئایینی خۆشەویسـتییە دەکـات، خۆشەویسـتیی مرۆڤ لە ئیمان بە خوداوە ڕەگی داکوتاوە. ئەو بیرۆکەیەش وەپاش دەدات کـە بـە هەڵـە بـڵاو بۆتـەوە و دەڵـێ گوایـە ئاکـاری ئیسـلامی کەموکورتـە و هـەروەها ئـەو

بیرۆکەیەش دەپووچێنێتەوە کە زۆرێك لە یەهود و مەسیحییەکان لەبارەی دەمارگرژیی ئیسلام وەشاندوویانە، لەم بارەوە دەڵێ: (لە واقیعدا، ئیسلام بە درێژایی مێژوو لە شاری مەسیحی دەمارگرژتر نەبووە ئەو کاتەی مەسیحییەت لەم شارەدا بە شێوەیەك لە شێوەکان بەهایەکی سیاسی دەست دەکەوت).لێرەدا دانەرەکان چەند گوزارشتێکی قورئان دەکەنە گەواهی بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵەی ڕۆژئاواییەکان سەبارەت بەوەی ناوی دەنێن (شەڕی پیرۆز)، لە زمانی عەرەبییدا پێی دەڵێن(جیهاد لەپێناو خودا) واتە کۆششکردن بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام و بەرگری لێکردنی لە هێرشی دەسدرێژیکاران). بەڵگەنامەکەی ڤاتیکان زیاتر دەڵێ: (هەرگیز جیهاد ئەوە نییە کە لە تەوراتدا بە Kherem ناسراوە، جیهاد هەوڵی لەناوبردن نادات بەڵکو تەقەلا دەدات بۆ ئەوەی مافی خودا و مرۆڤ بگەیەنێتە شوێنی نوێ). (لە ڕابردوودا کردەوەکانی توندوتیژی لە شەڕەکانی جیهاددا بە گشتی ملکەچی یاساکانی جەنگ بوو، لە سەردەمی شەڕەکانی خاچهەڵگرانیش ئەوانەی گەورەترین قەسابخانەیان دەنایەوە هەمیشە موسڵمانان نەبوون).

دواتر بەڵگەنامەکە باس لەو بڕیارەی پێشوو دەکات کە دەیگوت: ئیسلام ئایینێکی وشك و دۆگمایە شوێنکەوتووەکانی هەر لە سەردەمێکی بەسەرچوودا دەمێننەوە و ئەوەش وا دەکات ئامادەییان تێدا نەبێ بۆ گونجان لەگەڵ دەسکەوتە تەکنیکییە نوێیەکانی سەردەم).بەراوردی هەندێ هەڵوێستی هاوشێوە دەکات کە لە هەندێ وڵاتی مەسیحییدا تێبینی کراوە و ڕایدەگەیەنێ(ئێمە لە بیری ئیسلامییدا بنەمایەك دەبینین بۆ توانای گەشەکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی).

ئەز یەقینم هەیە کە بەرگریی ڤاتیکان لە ئیسلام دەبێتە مایەی سەرسوڕمانی زۆرێك لە هاوچەرخەکانمان جا موسڵمان بن یان جوولەکە یان مەسیحی، ئەوە

ڕاگەیاندینکە بە دڵسۆزی و گیانی کرانەوە ئاودێرکراوە و بە شێوەیەکی ناوازە لە هەڵوێستەکانی ڕابردوو جیاوازە، بەڵام بە ڕاستی چەند کەمن ئەو ڕۆژئاواییانەی بەو هەڵوێستە نوێیانەیان زانیوە کە باڵاترین دەسەڵاتی کەنیسەی کاسۆلیکی گرتوویەتییەبەر. بەڵام کاتێ ئەم ڕووداوە دەزانی سەرسوڕمانەکە کەم دەبێتەوە بەتایبەتی کاتێ بەو کردەوە و ڕووداوانە دەزانین کە ئەم نزیکبوونەوەیەی هێناوەتە بوون: یەکەم جار سەرۆکی سکرتارییەتی ڤاتیکان بۆ کاروباری نامەسیحییەکان سەردانی شافەیسەڵی شاری سعودییەی کرد. دوای ئەمە پاپا پۆڵسی شەشەم بە فەرمی لە ساڵی ١٩٧٤ پێشوازی لە گەورە زانایانی سعودییە کرد.لێرەدا زۆر بە ڕوونی ئەو دەلالەتە ڕۆحییە مەزنە لە پێشوازیکردنی ئوسقوف ئیلچینگەر لە زاناکان لە کاتدرائیییەکەی خۆی دەبینین، لەو سەردانەدا داوای لە زاناکان کرد نوێژ لە هۆڵی کاتدرائیییەکەی بکەن و ئەوانیش ڕوو بە قیبلە نوێژەکەیان کرد.

کەواتە ئەگەر نوێنەرانی هەر دوو جیهانی موسڵمان و مەسیحی لە بەرزترین ئاستدا بەم شێوەیە لە دڵسۆزییان بۆ پەروەردگاری تەنها و لە ڕێزگرتنیان بۆ جیاوازییەکانیان لێك تێ دەگەن، و ڕێکدەکەون بۆ گفتوگۆی ئایینی، ئەی کەواتە کە بارەکە بەم جۆرە سروشتی نییە بەراورد لەنێوان سەرجەم لایەنەکانی کتێبە پیرۆزەکاندا بکرێت؟! بابەتی بەراوردکردنەکە بریتییە لە توێژینەوەی کتێبە پیرۆزەکان لەبەر ڕۆشنایی پێدراوە زانستییەکان و ئەو زانیارییانەی پەیوەستن بە دروستیی دەقەکان.پێویستە ئەم توێژینەوەیە چۆن لەسەر تەورات و ئینجیل کرا بە هەمان شێوە لەسەر قورئانیش بکرێ.

پەیوەندیی نێوان ئایینەکان و زانست لە هەموو شوێن و سەردەمێك وەکو یەك نەبووە. ئەوەی هیچ مشتومڕێك هەڵناگرێ ئەوەیە کە لە هیچ کتێبێکی پیرۆزی ئایینەکانی یەکتاپەرستی ئیدانەکردنی زانست بوونی نییە. بەڵام لە ڕووی کردەییەوە پێویستە دان بەوەدا بنێین کە زانایان لەلایەن هەندێ دەسەڵاتی ئایینی هەندێ ئایین گرفت و دژواری زۆریان هاتۆتە ڕێ.لە ناوەندی مەسیحی و بەدرێژایی چەندان سەدەی زۆر دەسەڵاتگەلی بەرپرس بە بێ ئەوەی پشتئەستوور بێت بە هیچ دەقێکی ڕاستەقینەی کتێبی پیرۆز بەرهەڵستی پێشکەوتنی زانستەکانیان کردووە.ئەو دەسەڵاتانە دژ بەو زانایانەی هەوڵی پەرەپێدانی زانستەکانیان دەدا ڕێوشوێنی ئەوتۆیان گرتەبەر کە هەموومان دەیزانین، ئەو ڕێوشوێنانە پاڵی بە هەندێ زاناوە نا لە ترسی سووتاندن ڕوو بکەنە تاراوگە یان بە گۆڕینی هەڵوێستەکانیان داوای لێخۆشبوون بکەن.لەم بارەوە هەمیشە باسی کێشەی گالیلۆ دەکرێ کە لەبەرئەوەی دەستی کردەوە بە دۆزینەوەکانی کۆپەرنیك سەبارەت بە سووڕانەوەی زەوی حوکم درا. گالیلۆ بە هۆی لێکدانەوەیەکی هەڵەی تەورات تاوانبارکرا چونکە هیچ دەقێکی پیرۆز نییە کە بتوانرێ بکرێتە گەواهی بە شێوەیەکی وەها نرخی هەبێ دژ بە گالیلۆ.

بەڵام لە ئیسلامدا بە گشتی هەڵوێست بەرامبەر زانست جودایە، لێرەدا ڕوونتر لەو فەرموودە بەناوبانگەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) نییە کە دەفەرموێ: (أطلب العلم ولو في الصين). یان ئەو فەرموودەیەی تر کە دەفەرموێ: (طلب العلم فرض على كل مسلم و مسلمة). لێرەدا بابەتێکی سەرەکی هەیە: قورئان لەپاڵ ئەوەی داوای بەردەوامبوون لەسەر سەرقاڵبوون بە زانست دەکات، لە هەمان کات چەندان تێڕامانی تایبەت بە دیاردە سروشتییەکان و وردەکاری ئەوتۆ ڕوون

دەکاتەوە کە بەتەواوی لەگەڵ پێدراوە زانستییە نوێیەکان یەکدەگرێتەوە.شتێکی هاوشێوەی ئاوا لە تەورات و ئینجیلدا نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیە وا بڕوا بکەین کە لە هیچ سەردەمێکی مێژووی ئیسلامدا موسڵمانان هەڵوێستێکی تریان بەرامبەر زانست نەبووە. لە هەندێ سەردەمدا لە بەرامبەر ئەرکی فێربوون و فێرکردن بەدحاڵیبوون هەبووە و هاوشێوەی جیهانەکانی تر لە جیهانی ئیسلامیشدا هەندێك هەوڵیان داوە پەرەسەندنی زانست بوەستێنن. بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەبیر بێت کە لە چاخی مەزنایەتیی ئیسلامدا واتە لە نێوان سەدەی هەشتەم و سەدەی دوازدەمی سەردەمی مەسیحی، لە کاتێکدا کە لە وڵاتە مەسیحییەکانی ئێمە کۆتوبەند دەخرایە سەر پێشکەوتنی زانستی، ئەوا لە زانکۆ ئیسلامییەکان بڕێکی زۆر لە لێکۆڵینەوە و دۆزینەوە ئەنجام دران، لەو سەردەمەدا توێژەر لەم زانکۆیانە هۆکارگەلی ڕۆشنبیری مەزنی دەست دەکەوت. لە شاری قورتوبەدا کتێبخانەی خەلیفە ٤٠٠ هەزار بەرگی تێدا بوو. لەوێ ئیبن ڕوشد فێرکاری دەکرد،هەر لەوێ زانستی یۆنانی و هیندی و ئێرانی دەگوازرایەوە. لەبەر ئەم هۆیە زۆرانێك بۆ خوێندن لە وڵاتانی ئەورووپاوە دەچوونە قورتوبە هەروەکو چۆن لەم سەردەمەی ئێستاماندا بۆ باشکردن و تەواوکردنی هەندێ توێژینەوە گەشت بەرەو ئەمریکا دەکەین. ئەو دەسنووسە کۆنانە چەندە زۆرن کە بە هۆی ئەدیبە عەرەبەکانەوە گەیشتۆتە دەستمان بەوەش ڕۆشنبیری و کولتور بۆ وڵاتە ئازادکراوەکان گوازراوەتەوە...! ئێمە لە زانستەکانی بیرکاری (جەبر عەرەبییە) و گەردوونناسی و فیزیا و جیۆلۆجیا و ڕووەکناسی و پزیشکی (ئیبن سینا) و هیتر چەند قەرزاری ڕۆشنبیریی عەرەبیین. خەڵك لەو سەردەمەدا زۆر زیاتر لە ئێستا لەژێر کارتێکردنی ڕۆحی

ئایینیدا بوون. بەڵام ئەوە ڕێگری لێ نەکردن لەوەی لە یەك کاتدا ئیماندار و زانا بن. زانست برای جمکیی ئایین بوو. چەندە پێویست بوو زانست هەر وا بووایە..

لەو ماوەیەی سەدەکانی ناوەڕاست وڵاتانی مەسیحی لە چەقبەستوویی و توندگرییەکی ڕەهادا بوو. توێژینەوەی زانستی وەستابوو، نەك بە هۆی تەورات و ئینجیلەوە، پێویستە ئەوە دووبارە بکەینەوە، بەڵکو لەسەر دەستی ئەوانە بوو کا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە خزمەتکاری تەورات و ئینجیلن. دوای سەردەمی هەستانەوە و ڕاپەڕین (ڕێنسانس) کاردانەوەی سروشتی ئەوە بوو زاناکان تۆڵەی خۆیان لە نەیارەکانی دوێنێ وەرگرنەوە و ئەم تۆڵەیەش تا ئەمڕۆ بەردەوامە، تا ئەو ڕادەیەی کە هەنووکە قسەکردن لە ناوەندە زانستییەکانی ڕۆژئاوا لەبارەی خوداوە بە کردەوەیەکی وەها دادەنرێ نیشانە بێت بۆ ئارەزووی تاکگەرایی و تەنیایی، ئەم هەڵوێستەش کاریگەریی خراپی هەیە لەسەر عەقڵە لاوەکان(هەروەها موسڵمانانیش) کە لە زانکۆکانی ئێمەدا دەخوێنن.

بابەتەکە چۆن وەها نابێ بەتایبەتی کاتێ هەڵوێستی توندڕەوانەی دیارترین زاناکانمان دەزانین.زانایەکی دیار کە خەڵاتی نۆبڵی لە بواری پزیشکییش وەرگرتووە، لەم ساڵانەی دواییدا لە کتێبێکیدا هەوڵیدا قەناعەتمان پێ بکات کە ماددەی زیندوو توانیویەتی خۆی خۆی بخولقێنێ و لەم ماددە زیندووە بەراییەوە بوونەوەری زیندوو ڕێکوپێك فۆرمەڵە بووبێت تا ئەوەی گەیشتۆتە سیستمی مرۆڤ، هەموو ئەوانەش لەژێر کاریگەریی بارودۆخێکی دەرەکی هەمەچەشن ڕوویداوە..

ئایا پێویست ناکات موعجیزە زانستییە هاوچەرخەکان لە گۆڕەپانی ژیاندا مرۆڤ بەرەو ئاکامێکی تەواو پێچەوانە ببەن..؟هەر کەسێك دیراسەی ئەو سیستم و ڕێکخستنەی پەیدابوون و پاراستنی ژیان کۆنترۆڵ دەکات بکات نابینێ چەند

ئاڵۆزە..؟بەڵکو هەرچەند زانیاریت لەبارەی وردەکاریی ئەم سیستەمە زیاد ببێت ئەوا سەرسامی و واقورمانت زیاتر دەبێ..هەبوونی زانیاری لەوبارەوە نابێتە هۆی ئەوەی باوەڕبوون بە دروستیی لایەنی ڕێکەوت لە بوونی ژیان کەمتر ببێتەوە.؟هەر چەند لە زانست و زانیاری هەڵکشاین بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە شتە زۆر بچکۆلەکان ئەوا بەڵگەکانی بوونی بەدیهێنەر زیاتر دەبن..بەڵام مرۆڤ لەبری ئەوەی لە بەرامبەر ئەم ڕاستییانە پڕ بێت لە خاکەڕایی و خۆبەکەمزانی، ترزل و لووتبڵند دەبێ. ئەو پێیوایە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە گاڵتە بە بیرۆکەی خودا بکات هەروەکو چۆن گاڵتە بە هەموو شتێك دەکات کە دێتە سەر ڕێی ئەگەر هاتوو ئەوە بووە هۆی کۆسپی سەر ڕێگای ئارەزووەکانی. ئەوە ئەو کۆمەڵگە ماددییەیە کە ئێستا لە ڕۆژئاوا لە تەواوی فراوانبوونییەتی.

کەواتە ئەو هێزە ڕۆحییانە کامانەن کە دەکرێ تاو بدرێن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پیسکردنی فیکر لەلایەن زۆرێك لە زانا هاوچەرخەکان؟

لە بەردەم ئەم شەپۆلە ماددیی و داگیرکارییەی ئیلحاد بۆ ڕۆژئاوا دەستەوسانی مەسیحییەت و یەهودییەت لە خۆڕاگرتن دەردەکەوێ. هەر یەکێکیان نقوومی سەرگەردانی بوونە. دەیە بۆ دەیە نابینین کە چۆن بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڕەوتەی هەڕەشەی ڕامالێنی هەمووان دەکات لە کەمبوونەوەیەکی ترسناک دایە.؟!ماددیگەرای بێباوەڕ مەسیحییەتی کلاسیکی تەنها وەك سیستمێك دەبینێ کە مرۆڤ ماوەی دوو هەزار ساڵێکە بنیاتی ناوە بۆ دامەزراندنی دەسەڵات بۆ کەمینەیەکی کەم بەسەر مرۆڤی هاوشێوەی خۆی..لە کتێبە پیرۆزەکانی مەسیحیش زمانێك نادۆزێتەوە کە بە زمانەکەی ئەو بچێت ئەگەر لە دوورەوەش

بێت. ئەم کتێبانە بابەتگەلێکی زۆریان تێدایە کە لەگەڵ پێدراوە زانستییە نوێیەکان تێك ناکاتەوە.

ئەگەر لەبارەی ئیسلامیشەوە قسەی بۆ بکەن بە لەخۆباییبوونەوە زەردەخەنەی دێتێ، ئەمەش بێئاگاییی ئەو لە بابەتەکە دەگەیەنێ.وەکو زۆربەی رۆشنبیرە رۆژئاواییەکان جا هەر بیروباوەڕێکی ئایینی هەبێ، لەبارەی ئیسلامەوە برێکی بێشومار بیری هەڵەی لە مێشکدایە.

لەم تێڕوانینەوە دەبێ هەندێ عوزری لێ قەبووڵ بکەین. یەکەم، جیا لەو هەڵوێستانەی بالاترین دەسەڵاتی کاسۆلیکی ماوەیەك لەمەوبەر گرتیەبەر ئەگینا ئیسلام لە وڵاتی ئێمەدا لەمێژە بابەتێك بووە لەوەی پێی دەوترێ ناوزڕاندنی ئەزەلی، واتە رۆژئاوایی خاوەنی زانیارییەکی قووڵە لە ئیسلام، بەوەڕا دەزانرێ تا چ رادەیەك مێژوو و عەقیدە و ئامانجەکانی ئیسلام شێوێنراوە. پاشان دەبێ حیساب بۆ ئەوەش بکەین کە ئەو بەڵگەنامانەی بە زمانە رۆژئاواییەکان لەم بارەوە بلاوکراونەتەوە جیا لەو توێژینەوانەی لە بواری پسپۆڕییدا نووسراون، ئەرکی گەڕان بۆ کەسێك بیەوێ فێربێت ئاسان ناکات.

لە واقیعدا زانینی ئەوەی بۆ پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) هاتوتەخوارەوە لەم تێڕوانینەوە مەسەلەیەکی بنەڕەتییە، بەڵام هەندێ بەشی قورئان بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە پێدراوەکانی زانستەوە هەیە بە شێوەیەکی خراپ تەرجەمە کراوە، یان وەها قسەی لەسەر کراوە بە جۆرێك مافی زانا بێت کە رەخنەیەك بگرێ کە لە واقیعدا شایستەی قورئان نەبێت. لێرەدا خاڵێك هەیە شیاوی ئاماژە پێدانە: ئەم هەڵانە کە بۆ تەرجەمە دەگەڕێنەوە یان ئەو کۆمێنتە چەوتانە(زۆر

جار هەردووکیان هەن) سەدەیەك یان دوو سەدە لەمەوبەر مایەی سەرسوڕمان نەبوون، بەڵام ئەمڕۆ پیاوی زانست تووشی شۆك دەکات: لە بەرانبەر ڕستەیەکی هەڵەی تەرجەمەیەك کە لە ڕووی زانستییەوە پەسندکراو نەبێ هەموو جیهان بە شێوەیەکی توند ڕەتی دەکاتەوە هەر تەماشای بکات، لەو بەشەی تایبەتە بە زاوزێی مرۆڤ نموونەیەك لەبارەی ئەم جۆرە هەڵەیەوە دەخەینەڕوو.

هۆکاری هەڵەکانی ئەو تەرجەمەیە چین؟ هۆکارەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە وەرگێڕە نوێیەکان زۆربەی کات و بێ ڕۆحی ڕەخنەگرانە سەرجەم تەفسیرەکانی ڕاڤەکارە کۆنەکان بەکاردێنن. ئەوانە لە سەردەمی خۆیاندا بۆ پێناسەکردنی ناوردی وشەیەك کە ڕەنگە فرەواتا بووبێت عوزریان هەبووە.نەیانتوانیوە لە واتای ڕاستەقینە وشەکە یان ڕستەکە بگەن، هەندێ واتا هەن تەنها لە سەردەمی ئێمەدا بە هۆی زانیارییە زانستییەکانمان دەرکەوتوون، بە واتایەکی تر: ئێمە بەم شێوەیە گرفتی زەرورەتی پێداچوونەوەی ئەو وەرگێڕان و لێدوانانەی نەیانتوانیوە بە شێوەیەکی گونجاو جێبەجێی بکەن دەخەینەڕوو، لە کاتێکدا ئێستا ئێمە ئەو توخمانەمان لەبەر دەستە کە دەتوانێ واتای ڕاستەقینە بە دەستەوە بدات. بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە دەقەکانی تەورات و ئینجیل ئەوا گرفتی تەرجەمەی لەم جۆرە نییە، ئەو حاڵەتەی لێرە باسی دەکەین تەنێ پەیوەستە بە قورئان.

لە سەرەتادا ئەم لایەنە زانستییانەی قورئان تووشی سەرسوڕمانی قووڵیان کردم. هەرگیز باوەڕم نەدەکرد لە تواناادا بێت ئەو ژمارە زۆرەی بابەتی هەمەچەشن و تەواو هاوڕێك لەگەڵ زانیاریی زانستی نوێ بدۆزرێتەوە، ئەوەش لە دەقێکدا کە زیاتر لە سێزدە سەدە لەمەوبەرەوە نووسراوە. سەرەتا هیچ باوەڕێکم بە ئیسلام نەبوو. توێژینەوەی ئەم دەقانەم بە ڕۆحێکی ئازاد لە هەموو بڕیارێکی

پێشوەخت و بە بابەتیبوونێکی تەواوەوە دەسپێکرد. ئەگەر لێرەدا کارتێکردنێک هەبووبێت ئەوا بە دڵنیاییەوە کاریگەریی ئەو ڕێنماییانە بوو کە لە لاوێتیمدا وەرمگرتبوو، کە زۆرینەی ئەم ڕێنماییانە لەبارەی موسڵمانانەوە نەبوو بەڵکو لەبارەی موحەممەدییەکانەوە بوو ئەوەش وەکو جەختکردنەوە لەو ئاماژەیەی کە مەبەست لێی ئایینێکە پیاوێک دایەزراندووە، بەم جۆرەش ئایینێکی تەواو بێبەهایە بەرامبەر خودا. وەك زۆرانێك لەباریدا هەبوو منیش لەسەر ئەو بیرە هەڵانە لەبارەی ئیسلامەوە بەردەوام بم، ئەو بیرانە ئەوەندە باو و بڵاو بوون بە جۆرێك ئەز تووشی سەرسوڕمان دەبم کاتێ لە دەرەوەی پسپۆڕان تووشی زانایانی بیرڕوناك دەبم، ئیتر دان دەنێم بەوەی کە بەر لەوەی لەبارەی ئیسلامەوە وێنەیەکی جیاواز لەوەی لە ڕۆژئاوامان وەرگرتووە پێ بدرێ، من نەزان بووم.

ئەگەر من گەیشتمە ئەوەی لە ناڕاستیی ئەو بڕیارانەی لەبارەی ئیسلامەوە لە ڕۆژئاوا دەرچوون تێ بگەم ئەوا لەوەدا من قەرزاری دۆخێکی ئاوارتەم، لە عەرەبستانی سعوودی ئاستی هەڵەی وڵاتانی خۆمم لەبارەی ئیسلامەوە بۆ سەلمێنرا.

هەمیشە و بێسنوور قەرزاری شا فەیسەڵم و پێزانینم بۆی هەیە و هەردەم یادی بەڕێزەوە زیندوو ڕادەگرم. ئەوەم لە یادەوەریدا نەخشبەستوو بووە کە شەرەفی ئەوەم پێدرا گوێی لێ بگرم کە لەبارەی ئیسلامەوە بدوێ و لە حزوریدا باس لە هەندێ گرفتی تەفسیری قورئان بکەم کە پەیوەست بوون بە زانستی نوێوە. ئەوەی کە زانیاریی بایەخدارم لە بەڕێزیان و دەستوپێوەندەکەی وەرگرت بۆ من بابەتێکی نایاب و تایبەت بوو.

کاتێ توانیم ئەو ماوەیە بپێوم کە واقیعی ئیسلام لەو وێنەیەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا بۆمان دروست کردووە هەستم بە پێداویستییەکی زۆر کرد بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی، ئەوەش تاوەکو بتوانم لەم ئایینە بکۆڵمەوە کە زۆرانێك هیچی لەبارەوە نازانن. ئامانجی یەکەم بریتی بوو لە خوێندنەوەی قورئان و لێکۆڵینەوەی ڕستە بە ڕستەی، لەوەشدا سوود لە هەموو نووسینانە وەرگرم کە لەبارەیەوە نوسراون و پێویستە بۆ لێکۆڵینەوە ڕەخنەکارییەکە: قورئانم خوێندەوە و بە شێوەیەکی تایبەت هۆشم دایە ئەو وەسفەی لەبارەی ژمارەیەکی زۆر لە دیاردەی سروشتی دەیکات.وردەکاریی تایبەت بە هەندێ لەم دیاردانە تووشی سەرسوڕمانی کردم، ناکرێ دەرکی ئەم وردەکارییانە بکرێ مەگەر لە دەقە ئەسڵییەکە نەبێ، هاوڕێکبوونی لەگەڵ ئەو تێگەیشتنانەی ئەمڕۆ لەبارەی ئەم دیاردانەوە هەمانە تووشی واقوڕمانی کردم، هیچ مرۆڤێکی سەردەمی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) لە توانایدا نەبوو کەمترین بیرۆکە لەم بارەیەوە هەبێ.دوای ئەوە دانراوێکی زۆرم خوێندەوە کە نووسەرانی موسڵمان تەرخانیان کردووە بۆ لایەنە زانستییەکانی دەقی قورئان: ئەو دانراوانە بابەتی گرینگی زۆریان تێدایە بەڵام لەم بابەتەدا لە ڕۆژئاوا هیچ توێژینەوەیەکی هەمەلایەن ئەنجام نەدراوە.

یەکەم شت کە لەم دەقەدا ڕۆحت تووشی سەرسوڕمان دەکات دەوڵەمەندیی ئەو بابەتانەیە کە باسی دەکات: بەدیهێنان، گەردوونناسی، باسکردنی هەندێ بابەتی تایبەت بە زەوی، جیهانی گیانلەبەر، جیهانی ڕووەك، زاوزێی مرۆڤ. لە کاتێکدا لە تەوراتدا هەڵەی زانستی زل دەبینین لە قورئاندا هیچ هەڵەیەك نادۆزینەوە. ئەوە پاڵی پێوەنام بۆ ئەوەی بپرسم: ئەگەر بنووسی قورئان مرۆڤ بووایە چۆن توانی لە سەدەی حەفتەمی زایینی شتێك بنووسێ کە ئەمڕۆ ڕوون

بۆتەوە لەگەڵ زانیارییە زانستییە نوێییەکان تێکدەکاتەوە؟ هیچ گومانی تێدا نییە ئەو دەقەی قورئان کە ئەمڕۆ لەبەر دەستماندایە هەمان دەقی یەکەمە. چ هۆکارێکی مرۆیی دەکرێ بەو تێبینییە بدەین؟ بە ڕای من لێرەدا هیچ پاساودان و ڕوونکردنەوەیەك نییە، چونکە هیچ هۆیەکی تایبەت نییە وا بکات باوەڕ بەوە بکەیت لە سەردەمێکدا کە فەڕەنسا ملکەچی شا داگوبیر بوو کەسێك لە نیوەدورگەی عەرەبەوە توانیویەتی ڕۆشنبیرییەکی زانستی وای هەبێت لە هەندێ بابەتی زانستیدا ١٠ سەدە بە پێش ڕۆشنبیریی زانستی ئێمە بداتەوە.

ئەوەی ساغ بۆتەوە ئەوەیە کە ماوەی هاتنەخوارەوەی قورئان کە زیاتر لە بیست ساڵێك بووە، پێش و دوای ساڵی کۆچکردن (٦٢٢ی زایینی)، لەو ماوەیەدا زانیارییە زانستییەکان چەندان سەدە بوو لە قۆناغی چەقبەستندا بوو، هەروەها سەردەمی چالاکی ژیاری ئیسلامی لەگەڵ ئەو گەشەسەندنە زانستییەی هاوشانی بوو دوای کۆتاییهاتنی هاتنەخوارەوەی قورئان دەستی پێکرد. تەنها نەزانینی ئەم پێدراوە ئایینی و دنیاییانەیە کە ڕێ دەدات بە پێشکەشکردنی پێشنیارێکی سەیر کە گوێم لێ بووە هەندێك دایدەڕێژن کە دەڵێ: ئەگەر لە قورئاندا هەندێ بانگەشەی سیفەت زانستییانە هەبێت کە مایەی سەرسوڕمان بێت ئەوا بە هۆی پێشکەوتنی زانایانی عەرەبە لە سەردەمی خۆیان و موحەممەدیش(درودی خوای لێ بێت) دواتر ئیلهامی لە توێژینەوەکانیان وەرگرتووە. هەر کەسێك کەمێك لە مێژووی ئیسلام بزانێ و بشزانێ کە چاخی گەشانەوەی کولتوری و زانستی لە جیهانی عەرەبییدا لە سەدەکانی ناوەڕاست دوای موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) بوو، ئەوا ڕێ بە خۆی نادات ئەم بانگەشە وەهمییانە بکات، هیچ شوێنێك بۆ ئەم جۆرە بیرۆکانە

نییە بە تایبەت کە زۆربەی بابەتە زانستییەکان کە لە قورئاندا بە شێوەیەکی ڕوون لە قورئان داڕێژراون تەنها لە چاخی نوێدا پشتیوانییان لێکرا.

لێرەوە تێدەگەین کە چۆن ڕاڤەکارانی قورئان (بە ڕاڤەکارانی سەردەمی ژیاری مەزنی ئیسلامیشەوە) بە درێژایی چەندان سەدە لە تەفسیرکردنی هەندێ ئایەت کە نەیانتوانیوە لە واتای وردی تێ بگەن، هەڵەیان کردووە. تەرجەمە و تەفسیرکردنی ئەم ئایەتانە بە شێوەیەکی دروست لە تواناادا نەبوو تا ئەم سەردەمەی ئێستا. ئەوە واتای ئەمەیە کە تەنها زانیاریی زۆری زمانەوانی بۆ تێگەیشتن لەم ئایەتانە بەس نییە. بەڵکو زێدەباری ئەوە دەبێ زانیاریی هەمەجۆری زانستی هەبێ. توێژینەوەیەکی لەم چەشنە لێکۆڵینەوەیەکی ئینسکلۆپیدیاییە دەکەوێتە ئەستۆی چەندان پسپۆڕی. هەر چەند پرسگەلی زیاتر بخەینەڕوو ئەوا هەمەچەشنیی زانیارییە زانستییە پێویستەکان بۆ تێگەیشتن لە هەندێ ئایەتی قورئان پێویست دەبێ.

لەگەڵ ئەوەشدا قورئان کتێبێك نییە ئامانجی خستنەڕووی هەندێ لەو یاسایانە بێت کە کۆنترۆڵی بوونەوەر دەکەن، ئەو ئامانجێکی ئایینی بنچینەیی هەیە. وەسفەکانی توانای خودایی، بۆنەی سەرەکییە لە بانگێشتکردنی خەڵك بۆ ڕامان لە کارەکانی بەدیهێنان. هاوڕێ لەپاڵ ئەو بانگێشتکردنانە ئاماژەگەلێك هەن بۆ هەندێ بابەت کە سەرنجی مرۆڤ دەتوانێ پەی پێ ببات، یان یاساگەلێك کە خودا لە گۆڕەپانی زانستە سروشتییەکان و ئەوەی پەیوەستە بە مرۆڤەوە، ناساندوویەتی — ئەو یاسایانەی بوونەوەری ڕێکخستووە—. بەشێك لەم وتانە تێگەیشتنی ئاسانە بەڵام بەشێکی تر هەیە ناتوانرێ لە دەلالەتەکەی بگەیت مەگەر کەسێك زانیاریی زانستی پێویستی بۆ ئەمە هەبێت. ئەوەش واتای ئەوەیە کە

مرۆڤی سەدەکانی ڕابردوو هەر ئەوەندەی لە توانا بووە کە لە واتای ڕووکەشی ئەم ئایەتانە تێبگات کە هەندێ جار وای لێ کردووە ئاکامی ناڕاستی لێ وەدەست بێنێ ئەوەش بە هۆی نەبوونی زانیاریی پێویست لەو سەردەمەدا.

لەوانەیە ئەو ئایەتە قورئانییانەی بۆ لێکۆڵینەوە لە لایەنە زانستییەکانی هەڵبژێردراون سنوردار و لە پێویست کەمتر بن بە تایبەتی لە ڕوانگەی ئەو موسڵمانانەی بەر لە من ئاگایان لەو جۆرە بابەتانە بووە. لە کۆی گشتیدا پێم وایە من کەمێك لەوان کەمتر ئایەتەکانم هەڵبژاردووە. بەڵام لە بەرانبەر ئەمەدا لام وایە هەندێ ئایەتم زەق کردۆتەوە کە پێشتر لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە بایەخی شیاوی پێ نەدراوە. ئەگەر لەم توێژینەوەیەمدا ئەو ئایەتانەم لەبەرچاو نەگرتبێ کە ئەوان هەڵیانبژاردووە ئەوا هیوادارم نەکەومە بەر تیری تووڕەییان. هەروەها منیش هەندێ کات و لە هەندێ کتێبدا تەفسیری زانستی ناڕاستم بینیوە. ئەز بۆ ئەم ئایەتانە تەفسیرێکی شەخسییانە بە ڕۆحێکی تەواو ئازاد و بە نیازێکی پاك پێشکەش دەکەم.

هەروەها لەوەشم کۆڵیوەتەوە ئاخۆ لە قورئاندا ئامازەگەلی وەها هەن کە ئاسانکاری بکات بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ تا لێیان تێ بگات ئەگەرچی هێشتا هیچ تەئکیدێکی لە زانستی نوێوە پێنەگەیشتووە. لەم ڕووەوە باوەڕم وایە کە قورئان هەندێ ئاماژەی تێدایە سەبارەت بە بوونی هەسارەگەلێکی ئەوتۆ لە بوونەوەر کە لە زەوی دەچن و پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین کە زۆرێك لە زانایان ئەم مەسەلەیە بە تەواو مەعقووڵ دەبینن بێ ئەوەی هیچ پێدراوێکی تازە هەبێ کە کەمترین دڵنیایی لەم بارەیەوە بدات. پێم وابوو ئەرکمە باسی ئەمە بکەم بەڵام بە هەموو پارێزییەکی پێویستەوە، ئەگەر ٣٠ ساڵ لەمەبەر ئەم توێژینەوەیەم بکردایە

شتێکی ترم بۆ زیاد دەکرد کە قورئان باسی دەکات ئەویش تایبەتە بە گەردووناسی و بریتییە لە داگیرکردنی بۆشاییی ئاسمان. لەو سەردەمەدا و دوای هەوڵە بەراییەکانی ڕۆکێتەکانی ئاسمان هەندێ کەس پێشبینیی ئەوەیان کرد کە ڕۆژێك دادێت مرۆڤ هۆکارگەلی ماددیی ئەوتۆی دەست دەکەوێ کە ڕێی پێی دەدات بەرگە هەوای زەوی ببەزێنێ و ئاسمان کەشف بکات. لەو کاتەدا ئەوە زانرا بوو کە ئایەتێکی قورئان هەیە پێشبینی ئەوە دەکات کە ڕۆژێك دادێت مرۆڤ ئەو سەرکەوتنە وەدی دێنێ. ئێستاش ئەمە سەلمێنراوە و تەئکید کراوەتەوە.

بەراوردکردن لەنێوان کتێبە پیرۆزەکان و زانستدا پشت بە زانیاریگەلێك دەبەستێ کە پەیوەستە بە حەقیقەتی زانستی، ئەوەش بە نیسبەت تەورات و ئینجیل و قورئان. بۆ ئەوەی ئەو بەراوردکردن و پێکگرتنە بەهای هەبێ دەبێ بەڵگە زانستییە پشت پێبەستراوەکە تەواو سەلمێنراو و چەسپاو بێت و جێی مشتومڕ نەبێت، ئەوانەی لە قەبوولکردنی دەخالەتی زانست لە هەڵسەنگاندنی کتێبە پیرۆزەکان بۆڵەبۆڵ و دەستی دەستی دەکەن نکووڵی لەوە دەکەن کە زانست بتوانێت لە بەراوردکردندا پێوەرێکی بایەخدار پێکبهێنێ(جا ئەو کتێبە تەورات یان ئینجیل بێت کە ئەم دووانە لە بەراوردکردندا بێ زیان دەرناچن — هۆکارەکانی ئەمەشمان بینی — یان قورئان کە لەوبارەوە هیچ ترسێکی لەسەر نییە): بە گومانی ئەوان بێت زانست لەگەڵ زەمەن دەگۆڕێت، ئەوەی دەکرێ ئەمڕۆ قەبووڵ بکرێت ڕەنگە سبەی ڕەت بکرێتەوە.

لێرەدا ڕایەك هەیە پێویستە بەم جۆرە ڕاست بکرێتەوە: پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان تیۆری زانستی و حەقیقەتی زانستی...ئامانجی تیۆر بریتییە لە ڕاڤەکردنی دیاردەیەك یان کۆمەڵێك دیاردە کە تێگەیشتنیان دژوارە. تیۆر لە زۆر

حاڵەت دەگۆڕێت: شیاوی دەسکاریکردن یان تیۆرێکی تر جێگەی بگرێتەوە کاتێ پێشکەوتنی زانستی ڕێ بەوە دەدات بابەتەکان باشتر شیتەڵ بکرێن. بەڵام حەقیقەتی زانستی پێچەوانەی ئەمەیە و شیاوی دەسکاریکردن نییە: دەکرێ سیفەت و نیشانەکانی باشتر پێناسە بکرێ بەڵام هەروەك پێشوو دەمێنێتەوە، سەلماندنی ئەوەی زەوی بە دەوری ڕۆژ و مانگیش بە دەوری زەوییدا دەسوڕێتەوە هەرگیز پاشەکشێی لێ ناکرێ، دەکرێ لە ئایندەدا خولگەکان بە شێوەیەکی باشتر دیاری بکرێن.

لەبەر ئەوەی دەزانم تیۆرەکان دەگۆڕێن ئەوەش وای لێ کردم بۆ نموونە ئایەتێکی قورئان بە لاوە بنێم کە یەکێك لە فیزیکزانە موسڵمانەکان پێی وابوو لەبارەی چەمکی ((دژەماددە))وەیە و ئەو تیۆرەش ئێستا مایەی مشتومڕە. پێچەوانەی ئەمە دەکرێ بایەخ بە ئایەتێکی قورئان بدرێت کە باس لەوە دەکات ئاو بنەڕەتی ژیانە، ئەو دیاردەیە ئەگەرچی هەرگیز ناتوانین لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەین بەڵام وێڕای ئەوەش ژمارەیەك بەڵگە هەن لە بەرژەوەندی ئەمدا شایەتی دەدەن.بەڵام ئەوەی پەیوەستە بەو بابەتانەی کە دەکرێ بخرێتە ژێر تێبینی و سەرنجەوە وەکو گەشەکردنی کۆرپەلەی مرۆڤ، دەکرێ بەتەواوی هەموو ئەو قۆناغانەی لە قورئان باس کراون لەگەڵ پێدراوەکانی کۆرپەلەزانیی نوێ بەراورد بکرێن بۆمان دەردەکەوێ ئایەتەکانی قورئان تەواو لەگەڵ زانستدا تەبا و ڕێکە.

ئەم پێکگرتنەی قورئان و زانست بە دوو بەراوردکردنی تر تەواو بووە: لە لایەك ڕووبەڕوو کردنەوەیەك هەیە لە نێوان زانیارییە نوێیەکان و پێدراوەکانی تەورات و ئینجیل لەبارەی هەمان بابەت، لە لایەکی ترەوە بەراوردێك هەیە لەنێوان هەمان

تێڕوانینی زانستی و پێدراوەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت).

خوێنەر لە کۆتاییی بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا ئاکامی بەراوردکردنی ریوایەتەکانی قورئان بە ریوایەتەکانی قورئان لەبارەی یەك رووداوەوە دەبینێت: هەموویان خراونەتە بەر رەخنەی زانستییانە. بۆ نموونە هەر دوو پرسی بەدیهێنان و لافاوەکە هەڵبژێردراون. بە نیسبەت هەردووکیانەوە ناتەبایی زانست لەگەڵ وتەکانی تەورات روون بۆتەوە، بەڵام رێککەوتنێکی تەواو لەنێوان وتەکانی قورئان پەیوەست بە هەمان پرس و زانستی نوێدا دەبینین. لەوەوە دەکرێ تێبینی ئەو جیاوازییانەی بکرێ کە بەوردی وا دەکات یەکێك لە دەقەکان لە رووی زانستییەوە پەسندکراو و ئەویتر ناپەسندکراو بێت.

ئەم تێبینییە روونە زۆر گرینگ و بایەخدارە، چونکە جوولەکە و مەسیحییەکان و بێباوەڕەکان لە وڵاتانی رۆژئاوا بێ هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەو گومانە کۆکن گوایە موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) قورئانی بە چاولێکەری تەورات نووسیوە، هەندێك وا گومان دەبەن کە هەندێ قسەی قورئان لە بواری مێژووی ئایینیدا هەمان قسەکانی تەورات و ئینجیل پاتەوپات دەکاتەوە. ئەم هەڵوێستە هیچی لەو سووکایەتی کردنە کەمتر نییە کە دەڵێ گوایە مەسیح ئیلهامی لە تەورات وەرگرتووە و شوێنکەوتووانی فریو داوە. هەروەکو بینیمان هەموو ئینجیلی متی پشت بەو بەردەوامبوونە لەگەڵ تەورات دەبەستێ. ئەوە چ راڤەکارێکە ئەو بیرۆکەیەی بۆ دەردەکەوێ کە لەبەر ئەم هۆکارە سیفەتی پێغەمبەرێتی لە مەسیح دابماڵێ..؟لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کات لە رۆژئاوا بەم شێوەیە حوکم بەسەر موحەممەددا دەدرێ: وا گومان دەکەن کە جگە لە گوێستنەوەی تەورات و ئینجیل

شتێکی تری نەکردووە.ئەم حوکمە بێ دادگاییکردنە هەرگیز ئەوە لەبەرچاو ناگرێ کە قورئان و تەورات و ئینجیل لەبارەی هەمان ڕووداو ڕیوایەتگەلی جیاواز دەخەنەڕوو. بەلام ئەوان دێن لە بەرانبەر جیاوازیی ڕیوایەتەکان بێدەنگی هەلدەبژێرن پاشان ڕایدەگەیەنن گوایە کتێبەکان وەکیەکن و دواتر خۆ لە دەخالەتی زانیارییە زانستییەکان بەدوور دەگرن.ئەم پرسانە لە بابەتی بەدیهێنان و لافاوەکە بەدرێژی باس دەکەین.

هەروەکو دەلێ: فەرموودەکان بە نیسبەت موحەممەدەوە(درودی خوای لێ بێت) وەکو ئینجیلەکانە بە نیسبەت مەسیحەوە. فەرموودە کردەوە و قسەکانی پێغەمبەرە(درودی خوای لێ بێت) و نووسەرانیشی شایەت عەیان نین، بە لای کەمەوە بۆ ئەو فەرموودانەی بە ڕاست و دروست بەناوبانگن و بە شێوەیەکی ڕوون دوای سەردەمی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) دێن. ئەم فەرموودانە بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان کتێبێك نین لەلایەن خوداوە دابەزیبێت. فەرموودەکان قسەی خودا نین بەلام قسەی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە. لەم کتێبە زۆر بلاوانە بانگەشەگەلێك هەن لە ڕوانگەی زانستییەوە هەلەی تێدایە بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە ڕەچەتەی پزیشکییەوە. بەلام کێ هەیە دلنیایی بدات بە دروستیی ئەو وتانەی دەدرێنە پال پێغەمبەرەوە(درودی خوای لێ بێت). چەند فەرموودەیەك هەن گومان لە ڕاست و دروستییان هەیە و زانا موسلمانەکان خۆیان گفتوگۆی لەبارەوە دەکەن. ئەگەر لایەنی زانستی هەندێ لەم فەرموودانە لەم کتێبەدا باس کرا بێت ئەوە بۆ ئەوەیە تا لەم ڕوانگەیەوە لە قورئان جیا بکرێتەوە، واتە قورئان هیچ بانگەشەیەکی زانستی پەسندنەکراوی تێدا نییە.

هەروەکو دەبینین بە ڕاستی جیاوازییەکە زۆر سەرسوڕهێنەرە.

ئەم تێبینییەی دوایی گریمانەی ئەوانەی پێیان وایە موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) دانەری قورئانە بەرپەرچ دەداتەوە. چۆن مرۆڤێك دەتوانێ — کە لە سەرەتاوە نەخوێندەوار بووە — پاشان وێرای ئەمەش ببێتە گەورەی ڕەهای ئەدەبی عەرەبی و حەقیقەتگەلێکی زانستی بدرکێنێ کە لە توانای هیچ مرۆڤێکی ئەو سەردەمەدا نەبووە پێکی بێنێ، ئەوەش بێ ئەوەی ئەم قسەکردنەی کەمترین هەڵەی لەم ڕووەوە تێدا بێت.

ئەو بابەتانەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە بەدرێژی باسی دەکەین ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە بڕیار بدەین: ناچێتە عەقڵەوە مرۆڤێك لە سەدەی حەوتەمی مەسیحی ژیا بێت توانیویەتی لە ڕێی قورئانەوە و لەبارەی هەندێ بابەتەوە هزرگەلێك بخاتە ڕوو کە بیری سەردەمی خۆی نەبن و دوای ئەو بە چەند سەدەیەك لەگەڵ بابەتە سەلمێنراوەکان تێك بکاتەوە. بە ڕای من لێرەدا هیچ تەفسیرێکی دونیایی بۆ قورئان نییە.

## ڕاست و دروستیی قورئان، مێژووی نووسینەوەی...

ڕاستودروستیی قورئان کە هیچ مشتومڕێك هەڵناگرێ لەنێو کتێبە ئاسمانییەکاندا پایەیەکی تایبەت بە دەقەکە دەدات، لەم ڕاستودروستییەدا نە تەورات و نە ئینجیل لەگەڵ قورئاندا هاوبەش نین. لە دوو بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان لەو دەسکاریکردنانە کرد کە لە تەورات و ئینجیلەکاندا کراون بەر لەوەی بەو دۆخەی ئێستایان بگەنە دەستی ئێمە. بە نیسبەت قورئانەوە مەسەلەکە وەها نییە ئەوەش لەبەر هۆکارێکی سادە کە ئەوەیە: قورئان لە سەردەمی پەیامبەر (درودی خوای لێ بێت) جێگیر کراوە و دواتر دەبینین ئەم پرۆسەی جێگیرکردنە ئەنجام دراوە.

لەبارەی ئەم بابەتەوە، ئەو جیاوازییانەی قورئان لە کتێبە پیرۆزەکانی تر جیا دەکاتەوە لە بنەڕەتدا ناگەڕێتەوە بۆ پرسەکانی تایبەت بە مێژوو، ئەوەی هەندێ کەس هەمیشە دەیهێننەوە بێ ئەوەی بایەخ بەو بارودۆخە بدەن کە تێیدا دەقەکانی یەهودی مەسیحی هاتەبوون، بێ ئەوەی گرینگی بە بارودۆخی هاتنەخوارەوەی قورئان بۆ پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) بدەن، هەندێك وا گومان دەبەن کە ئەو دەقەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەفتەمی زایینی زیاتر چانسی ئەوەی هەیە بە بێ دەسکاری بگاتە دەستمان لە دەقگەلێکی تر کە کۆنییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پازدە سەدەی ئیزافی. ئەگەر تێبینییەکە دروست بێت بەڵام تەواو ڕوون نەکراوەتەوە، ئامانج لێی زیاتر دۆزینەوەی بیانووە بۆ ئەو دەسکارییانەی بە درێژایی ساڵان بە سەر دەقە یەهودی مەسیحییەکاندا هاتووە نەك ئامانجی دڵنیابوون بێت، دەقی قورئان لەو ڕۆژەوەی بۆ پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) دابەزیوە تا ئەمڕۆ هیچ دەسکارییەك نەکراوە.

سەبارەت بە تەورات ئەوا فرە نووسەری هەمان ریوایەت وێرای فرەیی پێداچوونەوەی هەندێ کتێب لە چەند کاتێکدا بەر لە سەردەمی مەسیحی لە هۆکارەکانی هەڵە و ناسازین. سەبارەت بە ئینجیلەکانیش هیچ کەس ناتوانێ دڵنیایی بدات کە هەمیشە ریوایەتێکی دەسپاکانەی پەیامی مەسیح یان ریوایەتێکی لە خۆگرتووە کە کارەکانی مەسیحی بە تەبابییەکی ورد لەگەڵ واقیع تێدایە.

هەروەکو بینیمان پرۆسە یەك لە دوای یەکەکانی نووسینەوە روونی دەکاتەوە ئەم دەقانە لە رووی راستودروستییەوە هەژارن. زێدەباری ئەوەش نووسەرانی ئەم دەقانە شایەت عەیان (شهود عیان) نین.

لە بەرامبەردا، پێویستە ئاماژە بۆ ئەو جیاوازیکردنە پێویستە بکەین لە نێوان قورئان کتێبی نازڵبووی نووسراو و فەرموودەکان کە کۆمەڵە ریوایەتێکن لەبارەی کردار و گوفتاری موحەممەد(درودی خوای لێ بێت)، هەر کە پەیامبەر (درودی خوای لێ بێت) کۆچی دوایی کرد هەندێ لە هاوەڵان دەستیان کرد بە نووسینەوەی: بە تێروانین لە ئەگەری دزەکردنی هەڵەی مرۆیی بۆی، دوای ئەوە پێداچوونەوەی بۆ کرا، متمانەپێکراوترین دەقەکانی ئێستا بۆ سەردەمێکی زۆر دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دەگەڕێتەوە. ئاست و پلەی راستودروستیی فەرموودەکان وەکو ئینجیلەکان هەمەجۆرە. هەروەکو هیچ ئینجیلێك لە سەردەمی مەسیحدا نەسەلماوە و ساغ نەبۆتەوە(هەموویان دوای کۆتاییهاتنی پەیامی مەسیح نوسراونەتەوە) ئەوا هیچ کۆمەڵە فەرموودەیەکیش نین کە دەقەکانی لە سەردەمی پێغەمبەردا(درودی خوای لێ بێت) جێگیر و ساغ بووبنەوە.

ئــەو پرســە بــە نیســبەت قورئانــەوە جیــاوازە، دەمودەســت لــە دەمــی هاتنەخوارەوەی، ئایەت بە ئایەت،پێغەمبەر(درودی خـوای لێ بێـت) و ئیمانـدارانی دەوروپشــتی لەبــەر دەیانخوێنــدەوە و هاوەڵــە نووسەرەکانیشــی تۆماریــان دەکرد.کەواتە هەر لە سەرەتاوە قورئان هەر دوو ڕەگەزی ڕاستودروستیی هـەبووە کە ئینجیلەکان نەیانبوو. ئەمە بەو شێوەیە بـەردەوام تـا مردنـی پەیامبـەر(درودی خـوای لێ بێـت). لـە سـەردەمێکدا کـە هـەموو نەیانـدەتوانی بنووسـن ئەگەرچـی دەیانتوانی شت لەبەر بکەن، ئەوا خوێندنـەوە دەبێتـە شـتێکی زۆر سـوودبەخش، ئەوەش بۆ جێگیرکردنی کۆتاییی دەقە.

قورئان بۆ سەر موحەممەد(درودی خـوای لێ بێـت) هاتۆتـە خـوارەوە. یەکـەم جار بە ئایەتە بەراییەکانی سوڕەتی (العلق) دەستی پێکرد،لـەوێ بـۆ مـاوەی سـێ ساڵ دەپچڕێ دوای ئەوە دەست پێ دەکاتەوە و بۆ ماوەی بیست ساڵ تـا کۆچـی دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)لە ساڵی ٦٣٢ ی زایینی واتـە ١٠ سـاڵ بـەر لە هیجرەت ٦٢٢ی زایینی و ١٠ ساڵی تری دوای هیجرەت بەردەوام دەبێت.

ئایەتـە بەراییـەکانی یەکـەم کـە بـۆی هاتنـەخوارەوە پێـنج ئایـەتی سـەرەتای سوڕەتی (العلق) بوو﴿(اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي(١)خَلَقَ خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ(٢)اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ(٣)الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ(٤)عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ(٥)﴾..

مامۆسـتا (حمیـدالله) لـە پێشـەکیی وەرگێڕانەکـەی بـۆ قورئـان هێمـا بـۆ ئـەوە دەکات کە یەکێك لە بابەتەکانی ئایەتە بەراییەکان کە بۆ موحەممەد(درودی خـوای لێ بێت) هاتـەخوارێ بریتییـە لـە((ستایشـکردنی پێنـووس بـەو پێیـەی هۆکـارێکی

مرۆییـە بـۆ زانیـاری)) لێـرەوە((بایەخـدانی پێغەمبـەر(درودی خـوای لێ بێـت)بـە پاراستنی قورئان بە نووسراوەیی)) تێ دەگەین.

لێرەدا دەقگەلێك هـەن بـە ڕاشـكاوی دەیسـەلمێنن كـە ئەوەنـدە قورئانـەی بـۆ موحەممـەد(درودی خـوای لێ بێـت) لـە مەككـە بـەر لـە كۆچـكردنی بـۆ مەدینـە هاتۆتەخوارێ بە نووسراوەیی چەسپێنرابوو. دواتر دەبینین كە چۆن خودی قورئان دان بەمەدا دەنێ. ئەوە ئاشكرایە كە موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) و هاوەڵانی دەوروبەری دەقیان بە خوێندنەوەی قورئانەوە گرتبوو.

كەواتە مەعقوول نییە قورئان ئاماژە بۆ شتگەلێك بكات كە لەگەڵ واقیـع تێـك نەكاتەوە، لە كاتێكدا دەكرێ لێكۆڵینەوە بكرێ لە هاوەڵانی دەقنووس كە لەگەڵ پێغەمبەردا(درودی خوای لێ بێت) بوون و لێـرەدا چـوار سـوڕەت هـەن كـە ئامـاژە بەوە دەكەن بەر لە كۆچی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێـت) بـۆ مەدینـە لـە سـاڵی ٦٢٢ قورئان تۆمار كـراوە..سـوڕەتی (عـبس):﴿ كَلَّـا إِنَّهَـا تَـذْكِرَةٌ (١١) فَمَـنْ شَـاءَ ذَكَرَهُ (١٢) فِي صُحُفٍ مُكَرَّمَـةٍ (١٣) مَرْفُوعَـةٍ مُطَهَّـرَةٍ (١٤) بِأَيْـدِي سَـفَرَةٍ (١٥) كِـرَامٍ بَرَرَةٍ (١٦)﴾..

(یوسف علی) لەو كۆمێنتانەی لەسەر وەرگێڕانەكەی بۆ قورئان لە ساڵی ١٩٣٤ نووسیویەتی دەڵێ: لە كاتی دابەزینی ئەم سوڕەتە ٤٢ یان ٤٥ سوڕەتی تـر لەبـەر دەستی موسڵمانانی مەككەدا بوو(لە كۆی گشتی ١١٤ سوڕەت)..

سوڕەتی (البروج): ﴿ بل هو قرآنٌ مجید (٢١) في لوحٍ محفوظ(٢٢) ﴾..

سوڕەتی (القارعة): ﴿ إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ (٧٧) فِـي كِتَـابٍ مَكْنُـونٍ (٧٨) لا يَمَسُّهُ إِلاَّ الْمُطَهَّرُونَ (٧٩) تَنزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٨٠)﴾....

سورەتی (الفرقان) ئایەتی ٥ : ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾.

مەبەست لێرە ئاماژە کردنە بۆ ئەو تۆمەتانەی دوژمنانی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) بە درۆ و بانگەشە ئاراستەیان دەکرد. وایان بڵاودەکردەوە گوایە ئەفسانەی پێشینانە و بەسەریدا دەخوێنرێتەوەو ئەویش دەیاننووسێتەوە. بابەتەکە هەرچییەك بێت ئایەتەکە ئاماژە بۆ تۆمارکردنی بە نووسین دەکات کە تەنانەت نەیارانی موحەممەدیش(درودی خوای لێ بێت) هێمایان بۆ کردووە.

هەروەها سورەتێك هەیە دوای هیجرەت هاتۆتەخوارێ دوا جار ئاماژە بۆ ئەو رووپەڕانە دەکات کە ئامۆژگاریی خودایی تێدا نووسراوەتەوە.

سورەتی (البینة): ﴿رَسُولٌ مِنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفًا مُطَهَّرَةً (٢)فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ (٣)﴾..

بەم جۆرە خودی قورئان هەواڵی تۆمارکردنیمان لە سەردەمی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) پێ دەدات. زانراویشە کە لە دەوروبەری موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) ژمارەیەك نووسەر هەبوون، لەوان (زید کوڕی ثابت)...

مامۆستا حمیدالله لە پێشەکیی تەرجەمەکەی بۆ قورئان (١٩٧١) بە جوانی وەسفی ئەو دۆخە دەکات کە تێیدا دەقی قورئانی تا کۆچی دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) تۆمارکراوەو دەڵێ:

((سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) کاتێ قورئانی بۆ دەهاتە خوارەوە یەکێك لە هاوەڵە بنووسەکانی بانگ دەکرد تا بۆی بخوێنێتەوە و لە هەمان کاتیش شوێنی ئەم بەشە نوێیە لە قورئان دیاری

بکات..ڕیوایەتەکان ئەوە دیاری دەکەن کە پێغەمبەر(درودی خوای لیّ بێت) دوای خوێندنەوەی ئایەتەکان بۆ بنووسەکە داوای لیّ دەکرد ئەوەی نووسیویەتی بۆی بخوێنێتەوە تاوەکو ئەوەی بۆ ڕاست بکاتەوە ئەگەر کەموکورتییەك هەبوو.ڕیوایەتێکی تری بەناوبانگ هەیە دەڵێ: پێغەمبەر(درودی خوای لیّ بێت) لە ڕەمەزاندا هەموو قورئانی لە لای جیبریل دەخوێندەوەو جیبریل ڕەمەزانی پێش کۆچی دواییکردنی هەموو قورئانی دوو جار پێ خوێندۆتەوە. هەروەها زانراویشە کە موسڵمانان لە نوێژی تەراویحی ڕەمەزانان گوێبیستی هەموو قورئان دەبوون.چەندان سەرچاوە دەڵێن کە (زید کوڕی ثابت) نووسەری پێغەمبەر(درودی خوای لیّ بێت) لە کاتی دوا کۆکردنەوەی دەقی قورئان ئامادە بووە و هەندێ سەرچاوەی تریش باس لە چەندان نووسەری تر دەکەن)).

بۆ تەواوکردنی یەکەم نووسینەوەی قورئان شتگەلێکی جۆراوجۆر بەکارهاتووە وەکو: پێستە و شەپکەدار و ئێسکی وشتر و تاتەبەرد.

لە هەمان کات موحەممەد(درودی خوای لیّ بێت) باوەڕدارانی ڕادەسپارد قورئان لەبەر بکەن، ئەوانیش هەروایان دەکرد. بەم چەندان قورئانلەبەر دەرکەوتن کە هەموو قورئانیان لەبەربوو و بڵاویشیان دەکردەوە. بەهای بەنرخی ئەم ڕێبازە دووانەییە لە پاراستنی دەق بە نووسین و یادەوەری ڕوون بۆوە.

دوای مردنی پەیامبەر(درودی خوای لیّ بێت) لە ساڵی ٦٣٢ی زایینی بە ماوەیەکی کەم، ئەبوبەکری جێنشینی و یەکەم جێنشینی موسڵمانان داوای لە زیدی کوڕی سابیت نووسەری پێغەمبەر(درودی خوای لیّ بێت) کرد دانەیەکی قورئان ئامادە بکات ئەویش کردی. پاشان زەید بە پەیڕەوکردن لە ئامۆژگاریی

عومەری کوڕی خەتتاب(هێشتا نەبووە خەلیفە) دەستی بە ڕاوێژکردن و کۆکردنەوەی بەڵگەنامەکان لە شاری مەدینە: هەر لە شایەتیی قورئانلەبەران تاوەکو نوسخەی بنووسەکانی قورئان، هەموو ئەمانە بۆ ئەوەی هیچ هەڵەیەك لە تۆمارکردن بەسەریدا تێنەپەڕێ. بەم جۆرە نوسخەیەکی خاوێن و تەواوی قورئان هاتەبوون.

سەرچاوەکان دەڵێن: عومەر کە لە دوای ئەبوبەکر ساڵی ٦٣٤ خەلافەتی وەرگرت قورئانی کردە یەك بەرگ و هەڵیگرت و پاراستی و لە کاتی مردنیشی دایە حەفسەی کچی و هاوسەری پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت).

پاشان عوسمان سێیەم خەلیفەی ڕاشیدین کە لە ساڵی ٦٤٤ تاوەکو ٦٥٥ خەلیفایەتی کرد لیژنەیەکی لە شارەزایان ڕاسپارد تاوەکو پێکگرتنێکی گەورە بکەن کە بە ناوی ئەمەوە ناونراوە. ئەم پێکگرتنە ڕاستودروستیی ئەو بەڵگەنامەیەی لەبەرچاو گرت کە لە سەردەمی ئەبوبەکر هاتەبوون و دواتر کەوتە کن حەفسە. لیژنەکە ڕاوێژی بەو موسڵمانانە کرد کە دەقەکەیان لەبەر بوو. پرۆسەی لێکۆڵینەوەی ڕاستودروستیی بەوپەڕی وردەکارییەوە ئەنجام درا. بە پێویست دیترا کە بۆ زەبتکردنی هەر ئایەتێك کە کەمترین مشتومڕی لەبارەوە هەبووبێت شایەتییەکان بەرامبەر یەکبکرێن: هەندێ ئایەت هەن ئایەتی تر نەسخ دەکەنەوە، ئەوەش بابەتێکی ئاسایی و شیاوی تێگەیشتنە ئەگەر ئەوەمان لەبیربێت کە پەیامی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) نزیکەی بیست ساڵی خایاند. کەواتە دەقەکە بەم شێوەیەی لێهات کە سوڕەتەکان یەك بە دوای یەکدا بێن، هەمان ئەو سیستەمەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە کاتی خوێندنەوەی تەواوی لە ڕەمەزاندا پیادەی دەکرد.

لەوانەیە کەسێك لەو هۆکارانە بپرسێ کە وای لە هەر سێ خەلیفەکە کرد ئەو کۆکردنەوە و پێکگرتنانە ئەنجام بدەن. هۆکارەکان سادەن: لە دەیەکانی یەکەمی دوای کۆچی دوایی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) ئیسلام زۆر بەخێرایی بڵاو بۆوە. ئەم بڵاوبوونەوەیەش لەنێو گەلانێك بوو کە بە زمانی غەیری عەرەبی دەدوان. دەبووایە بۆ گرەنتی بڵاوبوونەوەی قورئان بە پاکوخاوێنییە ڕەسەنەکەی هەندێ خۆپارێزی پێویست بگیردرێتەبەر. ئەوەش ئامانجی ئەو لێکۆڵینەوەیە بوو کە عوسمان ئەنجامی دا.

عوسمان چەند دانەیەکی لەو نوسخە دروستە نارد بۆ مەڵبەندەکانی ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامی، بەم شێوەیە هەروەکو ئوستاد حمیداللە دەڵێ: لە تاشکەند و ئیستەمبۆڵ نوسخەی عوسمان هەیە. ئەگەر ئەوەمان بەلاوەنا کە ڕەنگە هەڵە لە نوسخەکاندا هەبێت، ئەوا کۆنترین بەڵگەنامە ناسراوەکان لەمڕۆدا کە لە هەموو جیهانی ئیسلامی دۆزراوەتەوە هەموویان بەتەواوی وەکو یەکن.هەروەها ئەو دەسنووسانەی لە ئەوروپاش لەبەر دەستمانن هەر وەهان(لە کتێبخانەی نیشتیمانی لە پاریس پارچەگەلێك هەن بە پێی خەمڵاندنی شارەزایان مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشت و نۆی زایینی، واتە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچی).

ئەم هەموو دەقە دێرینە ناسراوە گشتیان وەکیەك و هاوڕێکن چەند خاڵێکی زۆر کەم نەبێ کە لە واتای گشتیی دەقەکە هیچ ناگۆڕێ، وێڕای ئەوەی سیاقەکە هەندێ جار ئەگەری زیاتر لە خوێندنەوەیەك هەڵدەگرێ، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نووسینی کۆن لە نووسینی ئێستا سادەتر بوو.

سورەتەکان کە ١١٤ سورەتن بە پێی کورت و درێژییان ڕێکخراون بێجگە لە هەندێ حاڵەتی هەڵاواردە، ڕیزبەندی مێژوویی هاتنەخوارەوە ڕەچاو نەکراوە ئەگەرچی لە زۆربەی حاڵەتەکان زانراوە، پاشان ژمارەیەکی زۆر ڕیوایەتی باسکراو لە چەند شوێنێکی دەقەکە هەن، ئەوەش هەندێ دووبارەبوونەوە دێنێتە ئاراوە بەڵام زۆربەی کات ئەم دووبارەکردنەوەیە وردەکاریی بۆ ڕیوایەتێکی تر زیاد دەکات کە ئەو وردەکارییە لەوێدا نەبووە. هەموو ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان بە زانستی نوێوە هەیە وەکو زۆرێك لە بابەتەکانی تر لەنێو قورئاندا پەرش و بڵاون و ڕیزبەندییەکی ڕوونیان نییە.

# بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی

## خاڵەکانی جیاوازی و چونیەکی لەگەڵ ڕیوایەتی تەورات

جیاوازیی قورئان لە تەورات لەوەدا کە ئەو ڕیوایەتێکی تەواو لەبارەی بەدیهێنانەوە(الخلق) پێشکەش ناکات. لەجیاتی یەك ڕیوایەتی بەردەوام، لە چەند شوێنێکی قورئان برگەگەلێك دەبینین کە باس لە هەندێ لایەنی ڕیوایەتی بەدیهێنان دەکات کە کەمێك یان زۆرێك لە وردەکاری لەبارەی ڕووداوەکانی بەدیهێنانەوە تێدایە. بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی ڕوونمان لەبارەی ئەو ڕێگایەی کە ئەم ڕووداوانەی پێدا ڕۆیشتووە هەبێ دەبێت برگە پەرشوبڵاوەکانی نێو ژمارەیەك سورەتی گرینگ کۆبکەینەوە.

تەنێ هەر ڕیوایەتەکانی بەدیهێنان نییە کە لە قورئاندا پەرشوبڵاو بن، قورئان بەم شێوازە زۆرێك لە بابەتە گرینگەکان باس دەکات، جا مەبەست دیاردە دنیایی یان ئاسمانییەکان یاخود پرسگەلی تایبەت بە مرۆڤ بێت کە خەمی پیاوی زانستە. لە لاپەڕەکانی دادێ خوێنەر بۆ هەر بابەتێك لەم بابەتانە کۆمەڵێك ئایەتی تایبەت دەبینێ. زۆرێك لە دانەرە ئەورووپاییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە ڕیوایەتی قورئان لەبارەی قورئانەوە تا ڕادەیەکی زۆر نزیکە لە ڕیوایەتی تەورات و دڵخۆش دەبن بەوەی هەردوو ڕیوایەت بە تەریبی بخەنەڕوو. ئەز پێم وایە ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە، جیاوازیگەلێکی ڕوون هەیە، سەبارەت بە پرسگەلێك کە لە ڕوانگەی زانستییەوە هەرگیز لاوەکی نییە باسوخواسێك لە قورئان دەبینینەوە کە

هاوشێوەی لە تەوراتدا نییە، هەروەها لە لایەکی ترەوە تەوراتیش هەندێ وردەکاری تێدایە کە لە قورئاندا هاوشێوەی نییە.

وێکچوونە ڕواڵەتییەکانی نێوان هەردوو دەقەکە زۆر ناسراوە، لەنێو ئەم وێکچوونانەدا یەکەم جار دەبینین کە ژماراندن(ترقیم)ی قۆناغە یەك لە دوای یەکەکانی بەدیهێنان لە هەر دوو دەقەکەدا یەك شتن: شەش ڕۆژەکەی بەدیهێنان لە تەورات هەمان شێوەی شەش ڕۆژەکەیە لە قورئان. بەڵام لە واقیعدا گرفتەکە زۆر ئاڵۆزتر و تێکچڕژاوترە و پێویستی بە لەسەر وەستانە.

## شەش قۆناغەکەی بەدیهێنان

ڕیوایەتەکەی تەورات بێ هیچ لێڵییەك تەواوی بەدیهێنان لە شەش ڕۆژدا باس دەکات کە ڕۆژێکی حەسانەوەی بەدوادا دێت ئەویش ڕۆژی شەممەیە، ئەوەش بە هاوڕێکی لەگەڵ ڕۆژەکانی هەفتە. بینیمان کە ئەم ڕێبازە لە گێڕانەوە کە کاهینانی سەدەی شەشەمی پێش زایین بەکاریانهێناوە بۆ هاندانی ئەوەیە تا ڕۆژی شەممە بکرێتە ڕۆژی پشوو و حەسانەوە: لەسەر هەموو جوولەکەیەك پێویستە کە ڕۆژی شەممە پشوو بدات هەروەك خودا دوای شەش ڕۆژ کارکردن کردوویەتی.

وشەی (ڕۆژ — یوم) بەو شێوەیەی کە لە تەورات لێی دەفامرێ ئەو ماوە زەمەنییەیەی نێوان دوو هەڵاتنی دوا بە دوای یەکی خۆر یان ئاوابوونی خۆرە، ئەوەش بە نیسبەت دانیشتوانی زەوییەوە. ڕۆژ کە بەم واتایە دیاریکرا لە ڕووی وەزیفییەوە پەیوەستە بە سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیەوە. تەواو ڕوونە کە لە ڕووی لۆژیکەوە ئەستەمە لەبارەی((ڕۆژەکان — الایام))بدوێین. بەم واتایەی

دیـاریکرا، بـوونی زەوی و سـوڕانەوەی بـە دەوری خـۆردا لـە کـاتی قۆناغـە سەرەتاییەکانی بەدیهێنان بە پێی ڕیوایەتی تەورات هێشتا دروست نەکرابوو. لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان لەو ئەستەمبوونە کرد.

بەڵام ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ دەقـەکانی زۆربـەی تەرجەمـەکانی قورئـان — بـە چوونیەکی لەوەی تەورات پێمان دەڵێ — ئەوە دەخوێنینـەوە کـە قورئـانیش هـەر ئەوە دەڵێ کە پرۆسەی بەدیهێنان شـەش ڕۆژ درێـژەی کێشـاوە. بێگومـان نـاکرێ گلەیی ئەوە لە وەرگێڕەکان بکەین کە وشەی (یوم)یان هاوشێوەی واتـا باوەکـانی زمانی عەرەبی بەکارهێناوە. تەرجەمەکان بەم جۆرە گوزراشت لە وشـەکە دەکـەن هەروەك لە سـوڕەتی (الاعـراف)دا هـاتووە: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ (الاعراف ئایەتی ٥٤)..

بە ڕاستی ئەو تەفسیرانەی قورئان یان کۆمێنتانـە کـەمن کـە لـەوە بـەئاگابوون وشەی (أیـام) لـە واقیعـدا پێویسـتە وەکـو (قۆناغـەکان) بفـامرێ. بـەڵکو هەنـدێك بانگەشەی ئەوە دەکـەن کـە ئەگـەر دەقـەکانی قورئـان تایبـەت بـە بـەدیهێنان بـۆ شەش قۆناغی بەدیهێنان لە (أیام)دا دابەش کردووە ئـەوا ئـەوە لەبەرئـەوە بـووە چونکە لە سەرەتای ئیسلامەوە هەموان بە مەسیحی و جوولەکەشـەوە باوەڕیـان وەهابووە و ئەوەش تـاوەکو خـۆ لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی بـاوەڕێکی بـڵاو بـەدوور بگرێ.

بە ڕاسـتی و بـێ ڕەتکردنـەوەی ڕەهـای ئـەم شـێوازەی تێڕوانین، ئایـا نـاکرێ گرفتەکە لـە نـزیکترەوە ببیـنین و بـەدوای واتـا گونجاوەکـان لـە قورئـان و زمـانی سەردەم بۆ ئەو وشەیە بگەڕێین کە هێشتا هەندێ لە نووسەران بە (یوم) و (أیـام) تەفسیری دەکەن؟!

تاكی ئەم وشەیە(یوم) زیاتر دەلالەت لە ڕۆژ(النهار) دەكات وەك دەلالەتكردن لە ماوەیەكی زەمەنی نێوان خۆرئاوابوونی خۆر و خۆرئاوابوونی لە ڕۆژی دواتر، بەڵام ئەگەر كردت بە كۆ(أيام) تەنها واتای ڕۆژەكان ناگەیەنێ واتە چەند یەكەیەك كە هەر یەكەیان لە ٢٤ كاتژمێر پێكهاتووە، بەڵكو واتای سەردەمێكی درێژ یان ماوەیەكی بێسنووری هەر چەند درێژ بێت دەگەیەنێ. لە لایەكی ترەوە واتای (ماوەیەكی زەمەنی) كە بكرێ وشەكە دەلالەتی بۆ بكات لە قورئاندا هەیە. لە ئایەتی ٥ی سورەتی (السجدە)دا ئەمە دەخوێنینەوە:

﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ (٥)﴾

ئەوەی شیاوی سەرنجە ئەوەیە كە ئایەتی پێش ئەم ئایەتی پێنجە بە دیاریكراوی باس لە بەدیهێنان لە ماوەی شەش ڕۆژدا دەكات.

ئایەتی ٤ ی سورەتی (المعارج):

﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ(٤)﴾

هەندێ لێكدەرەوەی قورئان هەن ئەم تەفسیرەیان وەرگرتووە، (یوسف علی) ١٩٣٤ لە تەفسیرەكەیدا بۆ هەر ئایەتێك كە باس لە قۆناغەكانی بەدیهێنان دەكات پێدادەگرێ لەسەر زەرورەتی ئەوەی كە هەر وشەیەك بە واتای (أيام) تەفسیر كرا بێت دەبێ بە واتای (ماوەی درێژ) یان (چاخ) لێكبدرێتەوە.

كەواتە مافی خۆمانە قەبووڵ بكەین، ئەوەی پەیوەستە بە بەدیهێنانی جیهان قورئان ئەوە دەڵێ كە لە ماوەیەكی زەمەنی درێژ كە كە ژمارەكەی شەشە. بێگومان زانستی نوێ ڕێی بە خەڵك نەداوە كە بڕیاری ئەوە بدەن كە ژمارەی قۆناغە جیاوازەكانی پرۆسە ئاڵۆزەكان كە بۆتە هۆی پێكهاتنی جیهان بریتییە لە

شەش قۆناغ بەڵام بە شێوەیەکی بنەبڕ سەلماندوویەتی کە ماوەگەلێکی زەمەنی زۆر درێژە کە لە بەرانبەریدا ڕۆژەکان بە پێی تێگەیشتنی ئێمە زۆر بچووك و کەم دەبێتەوە و دەبێتە شتێکی بێنرخ.

یەکێك لە درێژترین برگەکانی قورئان کە باس لە بەدیهێنان دەکات ئاماژە بەوە دەکات، بە تەنیشت ئەوەوە لە ڕیوایەتێکی تایبەتدا باس لە ڕووداوگەلێکی دونیایی و یەکێکی تری ئاسمانی دەکات. لە ئایەتی ۹ تاوەکو ۱۲ لە سورەتی (فصلت):

﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠)ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (١٢)﴾..

ئەم چوار ئایەتەی سورەتی (فصلت) چەند لایەنێك دەخاتە ڕوو کە دواتر بۆی دەگەڕێینەوە: مەبەستمان دۆخی بەرایی غازیی ماددەی ئاسمانی و ناساندنی ڕەمزییانەی ئاسمانەکان بە ژمارە ۷ و دواتر واتای ئەم ژمارەیە دەبینین. هەروەها گفتوگۆی ڕەمزییانەی نێوان خودا لە لایەك و ئاسمان و زەویی سەرەتایی لە لایەکی ترەوە، مەبەست لێرە گوزارشتکردنە لە ملکەچی ئاسمانەکان و زەوی دوای دروستکردنیان بۆ فەرمانە خواییەکان.

هەندێ ڕەخنەگر لەم برگەیەدا ناسازییەك لەگەڵ ئەو قسەیەی دەڵێ ماوەی بەدیهێنان شەش ڕۆژ بووە دەبینن. ئەوەش ئەگەر هەر دوو ماوەی پێکهێنانی

زەوی و هەر چوار ماوەی تایبەت بە دابەشکردنی ڕۆزی بۆ دانیشتوانەکەی و هەر دوو ماوەی دروستکردنی ئاسمانەکان کۆبکەینەوە دەکاتە هەشت ماوە، ئەمەش ناسازە لەگەڵ ئەو شەش ماوەیەی ناسراوە و پێشتر باسکرا.

لە ڕاستیدا ئەم دەقە داوا لە مرۆڤ دەکات لە توانای خودایی ڕابمێنێ، هەر لە زەوییەوە تاوەکو ڕامانە تایبەتەکەی لە ئاسمانەکان تەواو دەکات دوو بەشی بەستراو بە وشەی (ثم) پێشکەش دەکات، ئەم وشەیە بە واتای(زێدەباری ئەوە) (لە دوای) (دواتر) (وێڕای ئەوە) دێت.کەواتە وشەکە واتای ڕیزبەندی زنجیرەیەك ڕووداوی یەك بە دوای یەك دێت یان ڕیزبەندییەك لە ڕامانی مرۆڤ لەو ڕووداوانەی ئاماژەی بۆ کراوە. یان لەوانەیە مەبەست لێی تەنها ئاماژەکردن بێت بۆ ڕووداوگەلێکی ڕیزکراو بێ ئەوەی مەبەست لێی یەك بە دوای یەکداهاتنی ئەم ڕووداوانە بێت. مەسەلەکە هەر چییەك بێت دەکرێ ماوەکانی بەدیهێنانی ئاسمان تەواو هاوشانی هەردوو ماوەی بەدیهێنانی ئاسمان بێت. دواتر باس لەوە دەکۆڵینەوە کە قورئان چۆن باس لە پرۆسەی سەرەتایی پێکهاتنی بوونەوەر دەکات، دەبینین چۆن ئەم پرۆسەیە پێکەوە لەگەڵ ئاسمانەکان و زەوی هاوڕێکە لەگەڵ چەمکە نوێیەکان. ئەو کات دەکرێ ئیدراکی شەرعییەتی تەواوی ئەم ڕێبازە لە وێناندنی پێکەوەیی ڕووداوە باسکراوەکانی ئێرەدا بکەین.

وا پێناچێ دژایەتییەك هەبێ لە نێوان برگە باسکراوەکەی ئێرە و ئەو تێگەیشتنەی کە هەڵقوڵاوی دەقەکانی تری قورئانە و تایبەتە بە پێکهاتنی بوونەوەر لە شەش قۆناغ یان ماوە.

# لە بابەتی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەویدا،
# قورئان هیچ ڕیزبەندییەك دیاری ناکات

لە دوو برگەی قورئاندا ئایەتێك ئاماژە بە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی دەکات(سورەتی الاعراف ئایەتی ٥٤) لە ئایەتێکی تریشدا ئاماژە بە بەدیهێنانی زەوی و ئاسمانەکان دەکات(سورەتی فصلت ئایەتی ٩ بۆ ١٢). کەواتە وا دەردەکەوێ قورئان ڕیزبەندییەك بۆ بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی دیاری ناکات.

ژمارەیەکی کەم لەو ئایەتانە هەن کە یەکەم جار ئاماژە بۆ زەوی دەکەن، ئایەتی ٢٩ی سورەتی(البقرة) و ئایەتی ٤ی سورەتی(طه): (ممن خلق الارض و السموات)، بە پێچەوانەوەی ئەمەوە ژمارەیەکی زیاتر لەو ئایەتانە هەن کە بەر لە زەوی ئاماژە بۆ ئاسمانەکان دەکات(سورەتی الاعراف ئایەتی ٥٤، سورەتی یونس ئایەتی ٣، سورەتی هود ئایەتی ٧، سورەتی الفرقان ئایەتی ٥٩، سورەتی السجده ئایەتی ٤، سورەتی ق ئایەتی ٣٨، سورەتی الحدید ئایەتی ٤، سورەتی النازعات ئایەتی ٢٧ تاوەکو ٣٣، سورەتی الشمس ئایەتی ٥ تاوەکو ١٠)..

لە حەقیقەتدا بێجگە لە سورەتی النازعات، لە قورئاندا هیچ برگەیەك نییە کە بە شێوەیەکی بنەبڕ ڕیزبەندییەك دیاری بکات: پیتی (و)ی عطف کە هەردوو لای ڕستە پێکەوە دەبەستێ، یان وشەی (ثم) کە لەو برگەیەی سەرەوە بینیمان و ئاماژەیە بۆ یەك بە دوای یەکداهاتن یان تەنها دانانی ڕەگەزێك بە تەنیشت یەکێکی ترەوە.

بۆم دەرکەوتووە کە یەك برگە هەیە لە قورئان کە بە شێوەیەکی ڕوون بوونی ڕیزبەندییەك لە ڕووداوەکانی بەدیهێنان دیاری دەکات ئەویش ئایەتەکانی ٢٧ بۆ ٣٣ی سورەتی (النازعات)ن:

أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا (٢٧) رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا(٢٨) وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا (٢٩) وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا (٣٠) أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا (٣١) وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا (٣٢) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٣)

قورئان بە زمانێك وەسفی نیعمەتە دونیاییەکانی بەسەر خەڵکەوە کردووە کە لەگەڵ هۆشی جووتیارێك یان دەشتەکییەك گونجاو بێت، بەر لەوە داوای کردووە مرۆڤ لە بەدیهێنانی ئاسمان ڕابمێنێ و ورد ببێتەوە. بەڵام ئەو قۆناغەی تێیدا خودا زەوی تەختانی کردووە و پیت و فڕی تێخستووە لە ڕووی زەمەنییەوە بە دیاریکراوی دوای کردەی یەك بە دوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژەوە بووە. کەواتە ئەوەی لێرە باسکراوە دوو کۆمەڵە دیاردەیە: بەشێکیان زەوینی و ئەویتر ئاسمانییە. هەردووکیان بە پەیوەستبوون بەویترەوە ڕووی داوە. ئیتر باسکردنی ئەم دوو کۆمەڵە دیاردەیە واتە زەوی بەر لەوەی تەختانی بکرێت هەبووە، بەم پێیە بەر لەوەی خودا ئاسمانەکان دروست بکات هەبووە. لەمەوە بیرۆکەی هاوڕێیەتیی زەمەنیی گەشەکردنی هەر یەك لە ئاسمانەکان و زەوی دێتەکایەوە بە شێوەیەك کە هەردوو دیاردەکە تێکدەئاڵێن. بەم پێیە پێویست ناکات هیچ دەلالەتێکی تایبەتی لە ئاماژەدانی قورئان بە بەدیهێنانی زەوی بەر لە ئاسمانەکان یان بەدیهێنانی ئاسمانەکان بەر لە زەوی ببینین: شوێنی وشەکان بوونی هیچ ڕیزبەندییەك کە لە چوارچێوەیدا بەدیهێنان ڕوویدابێت ڕوون ناکاتەوە مەگەر وردەکاریی تر هەبێت.

## پرۆسەی بنەڕەتیی پێکهاتنی بوونەوەر و سەرکێشانی بۆ پێکهاتنی جیهانەکان

قورئان لە دوو ئایەتدا پوختەیەکی ئاوێتە و کورتی ئەو دیاردانەی پێشکەش کردووە کە پرۆسەی بنەڕەتیی پێکهاتنی بوونەوەریان دروست کردووە.

ئایەتی ٣٠ی سورەتی (الانبیاء):

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (٣٠)﴾

ئایەتی ١١ی سورەتی (فصلت) تێیدا خودا داوای ڕامان لە بەدیهێنانی زەوی دەکات و فەرمان بە پێغەمبەر دەکات کەبڵێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ﴾...

دوای ئەوە ئاماژگاریی گوێڕایەڵیکردن دێن کە لە پێشەوە باسکرا.

دواتر دەگەڕێینەوە بۆ بنەڕەتی ئاوییانەی ژیان و ئەوەش لەگەڵ چەندگرفتێکی بایۆلۆژیی تر کە لە قورئاندا باسکراوە باس دەکەین. بەڵام ئێستا پێویستە سەرنج بدەینە ئەمانەی دادێ:

١- بوونی بارستەیەکی گازاویی گەردیلەدار، پێویستە ئەوهاش تەفسیری وشەی (دخان - دوکەڵ) بکەین. بە گشتی دوکەڵ لە چڕییەکی گازاوی پێکدێت کە گەردیلەگەلێکی ورد پێوەی لکاون.

٢- ئامـاژەدان بـۆ پرۆسـەی (الفتـق)ی تاکـە بارسـتەی یەکـەم کـە سـەرەتا توخمەکانی پێکەوەلکاو بوونە(قورئان دەڵێ: الرتق). با بەباشی دیاری بکەین کە

(فتـق) کـردەی بـڕین یـان لێکهەڵوەشـاندنەوە و جیاکردنـەوەی پێکـەوەلکاوە، (رتق)یش کردەی پێکەوەلکان و بەیەکگەیاندنی توخمەکانە بە ئامانجی پێکهێنانی گشت.

ئەم چەمکە لە وردکردنەوەی گشت بۆ بەشەکان، بە شێوەیەکی ورد لە برگـەی دیکـەی قورئـان دیـاری دەکـرێ، ئـەوەش بـە باسـکردنی چـەندان جیهـان. یەکـەم ئایەتی یەکەم سوڕەتی قورئان دوای (بسم الله الرحمان الرحيم) بریتییە لە (الحمد لله رب العالمين).

گوزارشتی (العـالمين) دەیـان جـار لـە قورئـان پاتـەوپات دەبێتـەوە. هـەروەها ئاسمانەکانیش بە چەندان دووبـارە دەبێتـەوە ئـەوەش نـەك هـەر بـە شـێوەی کۆ بەڵکو بە ژمارەی ڕەمزییش وەکو ژمارە ٧.

ژمارە (٧) بۆ چەند ژماردنێکی جیاواز ٢٤ جار لە قورئان دووپات بۆتـەوە، زۆر جار بە واتای ژمارە و فرەیی دێت بێ ئەوەی بە شێوەیەکی دیاریکراو هۆکاری ئەو بەکارهێنانـە بـەم واتایـە بـزانین. وا دەردەکـەوێ ژمـارە (٧) لـە کـن یۆنـانی و ڕۆمانییەکانیش هەمان واتای ژماردنی نادیاریکراوی هـەبێ. لـە قورئـان ژمـارە (٧) حـەوت جـار بـە واتـای پـەتی بـۆ ئاسمانـەکان بـەکارهاتووە. هـەروەها ژمارەکـە جـارێکیش بـە شـێوەیەکی (ضـمني) ئامـاژە بـۆ ئاسمانـەکان دەکـات. هـەروەکو جارێکیش ئاماژە بۆ حەوت ڕێگاکەی ئاسمان دەکات.

ئایەتی ٢٩ی سوڕەتی (البقرة):

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٢٩)﴾

ئایەتی ١٧ی سورەتی (المؤمنون):

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ (١٧)﴾

ئایەتی ٣ی سورەتی (الملك):

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ﴾

ئایەتی ١٥و١٦ی سورەتی (نوح):

﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا (١٥) وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا(١٦)﴾

ئایەتی ١٢و١٣ی سورەتی (النبأ):

﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا (١٢)وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا (١٣)﴾

مەبەست لە (سراجا وهاجا) لێرە خۆرە.

بە نیسبەت هەموو ئەم ئایەتانەوە لێکدەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە کۆکن کە ژمارە (٧) ئاماژەیە بۆ فرەیی بێ دیاریکردنی هیچ شتێکی تر.

کەواتە ئاسمانەکان و هەسارە هاوشێوەکانی زەوی فرەن. ئەوەی مایەی وروژاندنی سەرسامیی خوێنەری قورئانە لە سەردەمی ئێستادا ئەوەیە کە لەم سەردەمەدا دەقێك ببینێ ئاشکرای بکات کە بوونی هەسارەی تری هاوشێوەی زەوی لە بوونەوەردا ئەگەری هەیە، ئەمەش هێشتا خەڵکی سەردەمەکەمان لێی دڵنیا نەبوونە.

ئایەتی ١٢ی سورەتی (الطلاق) دەڵێ:

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا (١٢)﴾

لەبەرئەوەی ژمارە (٧) ئاماژە بۆ فرەییەکی بێسنوور دەکات بۆیە دەکرێ ئەوە هەڵێنجین کە ئەم دەقەی قورئان بە ڕوونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تەنها زەوی هەیە، زەویی مرۆڤ، بەڵکو لە بوونەوەردا هەسارەگەلێك هەن لە زەوی دەچن.

هۆکارێکی تری وروژاندنی سەرسامیی خوێنەری قورئان لە سەدەی بیستەم: ئەو ئایەتانەیە کە ئاماژە بۆ سێ کۆمەڵە بەدیهێنراو(مخلوقات) دەکات کە بریتین لە:

- ئەوەی لە ئاسماندا هەیە.
- ئەوەی لەسەر زەویدا هەیە.
- ئەوەی لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدا هەیە.

ئێوە و چەند ئایەتێك لەم بارەیەوە:

ئایەتی ٦ی سورەتی (طه):

﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَى (٦)﴾

ئایەتی ٥٩ی سورەتی (الفرقان):

﴿الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾

ئایەتی ٣٨ی سورەتی (ق):

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ (٣٨)﴾

ئاماژەدان بۆ (ئەوەی لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدا هەیە) لە قورئاندا لەم ئایەتانەدا هەیە: ئایەتی ١٦ی سورەتی (الانبیاء)، ئایەتەکانی ٧و٣٨ی سورەتی

(الدخان)، ئایەتی ٣٧ی سورەتی (النبأ)، ئایەتی ٨٥ی سورەتی (الحجر)، ئایەتی ٣ی سورەتی (الاحقاف)، ئایەتی ٨٥ی سورەتی (الزخرف).

بەڵگەنەویستە کە وا دەردەکەوێ ئەم بەدیهێنانە لە دەرەوەی ئاسمانەکان و دەرەوەی زەوییە کە چەند جارێك ئاماژەی بۆ کراوە، وا دەردەکەوێ کەم وێناندن بێت. بەڵام بۆ ئەوەی لە واتای ئەم ئایەتانە بگەیت پێویست دەکات سوود وەربگرین لە نوێترین سەرنجە مرۆییەکان لەبارەی بوونی ماددەیەکی بوونەوەریی (دەرەوەی کاکێشانەکان)، هەروەکو لەبەر هەمان هۆکار پێویستە سەر لە نوێ باسی ئەو زانیارییانە بکەین کە زانستی هاوچەرخ لەبارەی پێکهاتنی بوونەوەر سەلماندوویەتی — لەوەشدا لە سادەترینەوە بۆ ئاڵۆزترین دەچین — ئەمەش دەبێتە بابەتی بڕگەی داهاتوو:

بەڵام بەر لەوەی بۆ ئەم تێڕامانە زانستییە پەتییانە بگوازینەوە وا باشە ئەو خاڵە بنەڕەتییانە کورت بکەینەوە کە قورئان لەبارەی بوونەوەرەوە فێرمان دەکات. بە پشتبەستن بەوانەی پێشوو ئەم خاڵانە بریتین لە:

١- بە گشتی بوونی شەش قۆناغی بەدیهێنان.

٢- بەناویەکداچوونی قۆناغەکانی بەدیهێنانی ئاسمانەکان لەگەڵ قۆناغەکانی بەدیهێنانی زەوی.

٣- بەدیهێنانی بوونەوەر سەرەتا لە تۆپەڵێکی بەرایی تاقانە کە بارستەیەکی یەکگرتوو بوو دواتر لێکهەڵوەشا.

٤- فرەیی ئاسمانەکان و فرەیی هەسارەکان کە بە زەوی دەچن.

٥- بوونی بەدیهێنراوێکی ناوەندکار (لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدا).

# هەندێ پێدراوی زانستی نوێ لەبارەی پێکهاتنی بوونەوەر

## سیستمی خۆر

زەوی و ئەو هەسارانەی بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە جیهانێکی ڕێکوپێکیان پێکهێناوە کە بە نیسبەت پێوەری مرۆییانەی ئێمە دوورابیەکانی زۆر گەورە دەردەکەوێ. بۆ نموونە، زەوی بە ئەندازەی ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە. بە نیسبەت مرۆڤەوە ئەو ماوەیە زۆر بەرین و پانوپۆڕە، بەڵام ئەگەر بەراورد بکرێ بە هەسارەی پلۆتۆن کە دوورترین هەسارەی کۆمەڵەی خۆرە لە خۆرەوە ئەوا زۆر کەمە، ئەو ماوەیە چل ئەوەندەی ماوەی نێوان زەوی و خۆرە، واتە شەش ملیار کیلۆمەتر بە نزیکەیی. دوو ئەوەندەی ئەو ماوەیە واتە نزیکەی ١٢ ملیار کیلۆمەتر گەورەترین ماوەیە لە سیستمی خۆردا. تیشکی خۆر پێویستی بە شەش کاتژمێر هەیە بۆ ئەوەی بگات بە هەسارەی پلۆتۆن ئەوەش بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر کە دەگاتە ٣٠٠ هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا. بەڵام ئەستێرەکانی تر کە دەکەونە سنوری جیهانی ئاسمانیی ناسراو پێویستییان بە ملیارەها ساڵی تیشکی هەیە تاوەکو تیشکەکانیان بگات بە ئێمە.

## کاکێشانەکان

خۆر کە زەوی وەکو هەسارەکانی تری دەوروپشتی یەکێك لە هەسارەکانیەتی، جگە لە تۆخمێکی بچووکی نێو سەت ملیار ئەستێرە کە بە هەموویان پێی دەگوترێ کاکێشان شتێکی تر نییە. لە ئێوارەیەك لە ئێوارە جوانەکانی هاوین

دەتوانین ئاسمان بە نەخشێنراو بەم ئەستێرانە ببینین کە بە (مجره اللبن) ناودەبرێ. تیشك لە چەند سەعاتێکی نزیك لە یەکتر هەموو کۆمەڵەی خۆر دەبڕێ لە کاتێکدا ٩٠ هەزار ساڵی دەوێ تا لەم سەری کاکێشانەکەمان تا دەگاتە ئەو سەر.

ئەم کاکێشانە وێڕای بەرفراوانییە سەیرەکەی کەچی جگە لە توخمێکی بچووکی ئاسمان شتێکی تر نییە. لە دەرەوەی کاکێشانەکەمان بارستەگەلی زەبەلاحی ئەستێرەی هاوشێوەی (مجره اللبن) هەن. ئەم بارستەگەلانە زیاتر لە ٥٠ ساڵێك لەمەوبەر دۆزراونەتەوە، واتە کاتێ دۆزینەوەگەرایی گەردوونیی توانی سوود لە ئامێری بینینی ئەوتۆ وەربگرێ کە لە تەواوییدا هاوشێوەی ئەوە بوو کە ڕێی دا بە جێبەجێکردنی تەلسکۆبی چیای ویلسۆن لە ئەمریکا. بەم ڕێگایە توانرا بە شێوەیەکی سەیر ژمارەیەکی زۆری بارستەگەلی کاکێشان بناسرێتەوە، هەروەها چەندان کاکێشانی تری لەیەکتر دابڕاو ناسرانەوە کە دوورییەکانیان ئەوەندە زۆر بوو بە جۆرێك بە پێویست زانرا یەکەیەکی تایبەت کە لە ساڵانی تیشکی پێکهاتبوو دروست بکرێ، ئەم یەکەیەش ناوی لێنرا(فەرسەخی ئەستێرەیی – parsec) کە پێکدێ لەو ماوەیەی تیشك لە ٣,٢٦ ساڵ بە خێرایی ٣٠٠ هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەیبڕێ.

## دروستبوون و گەشەسەندنی کاکێشان و ئەستێرە و سیستەمە هەسارەییەکان:

لەم بۆشاییەی بەرفراوانەی ئێستا کاکێشانەکان داگیریان کردووە چی هەبووە؟ زانستی نوێ ناتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە مەگەر لە سەرەتای ماوەی گەشەکردنی بوونەوەر و ناشتوانێ ئەو ماوەیەی لێیمان جیا دەکاتەوە حیساب بکات.

سەبارەت بە زەمەنە دوورەکان کە زانست دەتوانی ' ڕای خۆی لەبارەوە بڵێ، ئەوا هەموو هۆیەکی هەیە کە پاڵی پێوە دەنێ بۆ ئەوەی کە وا دابنێ بوونەوەر لە بارستەیەکی گازیی دروست بووە کە بە پلەی سەرەکی لە گازی هایدرۆجین و بە پلەی دووەم لە گازی هیلیۆم پێکهاتووە. دوای ئەوە ئەو تەمومژە(السديم) دابەش بوو بۆ بەشگەلی جۆراوجۆری خاوەن دوورایی و بارستەگەلی ئەوەندە زەبەلاح کە زانایان وەها دەیخەمڵێنن کە لە ملیارێك تا سەت ملیار جار لە بارستەی ئێستای خۆر گەورەتر بووە.(ئەم بارستەیەی ئێستای زەوی بە ٣٠٠ هەزار جار گەورەتر لە زەوی دەخەمڵێنرێ). ئەم ژمارانە وێنەیەك لە زەبەلاحیی بەشەکانی ئەم بارستە گازییە سەرەتاییە کە کاکێشانەکانی لێ هاتۆتە بوون بە دەستەوە دەدات.

دوای ئەوە وردبوونێکی تر دێت کە ئەستێرەکان دەبن. ئەو کاتە پرۆسەی چڕبوونەوە دەردەکەوێت کە کاریگەرییەکانی هەر یەك لە هێزەکانی ڕاکێشان و پەستان و کێڵگەی موگناتیسی و تیشکدانەوەکان دێنەناوەوە.

ئەستێرەکان بە چوونەوەناویەك گەشاوە دەبێت و گۆڕانی هێزەکانی ڕاکێشانی ناوی دەبێتە گەرمەوزە. دوای ئەوە کاردانەوەی گەرمی — ئەتۆمی دەخالەت

دەکات و بە تێکەڵاوبوون لە ئەتۆمی سووکەوە ئەتۆمی قورس دروست دەکات، بەم شێوەیە هایدرۆجین دەگۆڕێت بۆ هیلیۆم پاشان بۆ کاربۆن پاشان بۆ ئۆکسجین پاشان لە کۆتاییدا بۆ کانزا و ناکانزاکان. ژیانی ئەستێرەکان بەم جۆرەیە، گەردووناسیی نوێ ئەستێرەکان بەپێی قۆناغی پەرەسەندن پۆلێن دەکات. هەروەها ئەستێرەکان دەشمرن: تێبینی کراوە لە دوا قۆناغی پەرەسەندنی هەندێ ئەستێرە تەقینەوەیەك بۆ ناوەوە ڕوویداوە کە دوا ئەمە ئەستێرەکانی کردۆتە(تەرم).

هەسارەکان و زەویش بەتایبەت، لە پرۆسەی لێکجیابوونەوەیەك لە ئاوێتەی یەکەم واتە (تەم — سەدیم)ی یەکەم هاتووە، چارەکە سەدەیەکە مشتومڕ لەبارەی ئەم پێدراوەوە پووچ بۆتەوە کە دەڵێ: خۆر لە ناخی سەدیمی تاقانە چڕبۆتەوە و، هەسارەکان هەمان شتیان لەناو لوولەکی سەدیمییدا کردووە. بە نیسبەت بابەتی توێژینەوەکەی ئێرەمان تێبینییەکی گرینگی سەرەکی هەیە: مەبەستمان ئەوەیە کە دروستبوونی توخمە ئاسمانییەکانی وەك خۆر و دروستبوونی توخمی زەوی یەك بە دوای یەکدا نەبوون. کەواتە لێرەدا هاوتەرییبییەك لە پەرەسەندن لەگەڵ یەکێتی لە ئەسڵدا هەبووە.

لێرەدا زانست زانیاریگەلێکمان دەداتێ لەبارەی ئەو سەردەمەی ئەو ڕووداوانەی تێیدا ڕوویداوە کە باسمان کرد.

ئەگەر کۆنیی کاکێشانەکەمان بە نزیکەی ١٠ ملیار ساڵ بخەملێنین ئەوا بەم گریمانەیە دروستبوونی سیستمی خۆر دوای ئەمە بە کەمێك زیاتر لە ٥ ملیار ساڵ

ڕوویداوه. بەپێی لێکۆڵینەوەی خودەتیشکدانەوەی سروشتی مێژووی تەمەنی زەوی و دروستبوونی خۆر ٤,٥ ملیار ساڵە.

بەم جۆرە گەردووناسان لەبارەی پەرەسەندنی گشتیی دروستبوونی سیستمی خۆرەوە گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرز لە زانیاری کە دەکرێ بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە: چڕبوونەوە و چوونەوەناویەکی ماددەیەکی گازی لە دۆخی خولانەوەدا، جیابوونەوە بۆ چەند بەشێك و دانانی خۆر و هەسارەکان بە زەویشەوە لە شوێنەکانیان. پێدراوەکانی زانست لەبارەی سەدیمی یەکەمەوە و شێوازی دابەشبوونی بۆ بڕێکی بێشومار لە ئەستێرە کە لە کاکێشانەکان کۆبوونەتەوە هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە بۆ شەرعییەتی ئەو چەمکەی باس لە فرەیی جیهانەکان دەکات. بەڵام ئەم زانیارییانە بە هیچ جۆرێك ئەو یەقینە نابەخشێ سەبارەت بە بوونی شتێك لە بوونەوەردا کە لە دوور یان نزیك لە زەوی بچێت.

## چەمکی فرەیی جیهانەکان

لەگەڵ ئەوەشدا گەردووناسان پێیان وایە کە بوونی هەسارەگەلێك کە لە زەوی بچێت ئەگەرێکی بەهێزە. ئەوەش وێڕای ئەوەی کە ئێستا هیچکەسێك بە شێوەیەکی مەعقوڵ بیر لە ئیمکانییەتی بوونی دۆخێکی گشتی هاوشێوەی دۆخی زەوی لە هەسارەیەکی تر لە چوارچێوەی کۆمەڵەی خۆردا ناکاتەوە. ئەگەر لەسەرمان بێت لەو دۆخانە بگەڕێین پێویستە لە دەرەوەی سیستمی خۆر بەدوایدا بگەڕێین. لێرەدا کەسانێك هەن بوونی ئەم دۆخانە لە دەرەوەی ئەم سیستمە مومکینە لەبەر ئەم هۆکارانە:

هەندێك ڕایان وایە پەنجا ملیار ئەستێرەی کاکێشانەکەمان دەبێ وەکو خۆر سیستمی هەسارەیی هەبێ. لە ڕاستیدا ئەو پەنجا ملیار ئەستێرەیە وەکو خۆر خولانەوەیەکی سستیان هەیە، ئەو خاسییەتەش ئەو باوەڕە دەخاتە مێشکەوە کە هەسارەی تر هەبێ کە سەر بە خولگەکەیەتی. دووری لەم ئەستێرانە ئەوەندە گەورەیە بە جۆرێك ناکرێ تێبینی ئەم هەسارە شوێنەکەوتووانە کە وا گریمانە دەکرێ هەبێ بکرێ ئەگەرچی ئەگەر بوونی زۆر بەهێزە ئەوەش بە تێڕوانین لە هەندێ لە سیفەتەکانی ئەو خولگەیەی هەر ئەستێرەیەك پێی دەناسرێتەوە: ئەو شەپۆلدارییە سووکەی لە هێڵی خولگەی ئەستێرەدا هەیە بەڵگەی ئەوەیە شوێنکەوتەیەکی هەسارەیی هاوڕێ هەیە. لەبەر ئەم هۆیە وا باوەڕ دەکرێ کە ئەستێرەی بارنار یەك هاوڕێی هەسارەیی هەیە، بە لای کەمەوە بارستەکەی لە سەرووی بارستەی موشتەرییەوەیە، بەڵکو لەوانەیە دوو شوێنکەوتەی هەبێ. (پ.گیران) دەڵێ: هەروەکو ڕوونە سیستمە هەسارەییەکان بە زۆرییەکی زۆرەوە لە بوونەوەردا بڵاوە. سیستمی خۆر و زەوی تاقانە نین..)).درێژەی دەداتێ و دەبێژێ (ژیان وەکو ئەو هەسارانەی لەخۆیان گرتووە، لە هەموو بوونەوەردا بڵاوە، لە هەموو شوێنێکدا دۆخی فیزیکی – کیمیایی پێویست بۆ پشکووتن و پەرەسەندنی هەبووبێت.).

## ماددەی گەردوونیی بڵاوبۆوە لەنێوان ئەستێرەکاندا

## پێکگرتنێك لەگەڵ پێدراوە قورئانییەکان لەبارەی بەدیهێنانەوە

پرۆسەی دروستبوونی بنەڕەتیی گەردوون لە چڕبوونەوەی سەدیمی یەکەم پاشان لە جیابوونەوەی بۆ بەشەکان، لە بنچینەدا چەند بارستەیەکی کاکێشانی دروست کردووە. ئەمەی دوایش بۆ چەند ئەستێرەیەك دابەش بووە و بەرهەمگەلێکی لاوەکی دروستکردووە کە هەسارەکانن. ئەم جیابوونەوە یەك بە دوای یەکانە لەنێوان کۆمەڵە توخمە سەرەکییەکاندا شتێکیان بەجێهێشتووە کە دەکرێ ناوی بنێین پاشماوەکان(البواقی). ئەم پاشماوانە لە ڕووی زانستییەوە پێی دەگوترێ: ئەو ماددە گەردوونییانەی لەنێوان ئەستێرەکاندا بڵاوبوونەتەوە. ئەم ماددەیە بە چەند شێوەیەکی جیاواز وەسف کراوە: جارێك وەسف دەکرێ بەوەی سەدیمگەلێکی پڕشنگدارن تیشکێك بڵاو دەکەنەوە کە لە ئەستێرەی تریان وەرگرتووەو بە پێی گوزارشتی گەردووناسان لە (تۆز) یان (دوکەڵ) پێکهاتوون، جارێکی تریش بەوە وەسف دەکرێن کە سەدیمگەلێکی تاریکی چڕی زۆر لاوازن، یان ماددەیەکی گەردوونیین لەنێوان ئەستێرەکاندا بڵاوبوونەتەوە بەوە دەناسرێنەوە کە زۆر خۆشێرەوە و پەنامەکن و خۆ پێوەرە فۆتۆمەترییەکانی گەردووناسیش دەشێرنەوە. بوونی پردگەلێك لەو ماددەیە لەنێوان کاکێشانەکان هیچ گومانێکی تێدا نییە. وێڕای دەگمەنیی ئەم گازانە و بە هۆی ئەو بۆشاییە گەورەیەی داگیری دەکات ئەوا دەتوانێ هاوتای بارستەیەك بێت کە زیاتر لە کۆی هەموو بارستەی کاکێشانەکان تەنانەت ئەگەر ئەم گازانە چڕییشیان کەم بێت—

چونکە بۆشاییی ئاسمان کە کاکێشانەکان لە یەکتر جیا دەکاتەوە لەوپەڕی دوورییدایە — . (ئەی.بواشر) بوونی ئەم کوتلە بڵاوانەی نێوان کاکێشانەکان بە گرینگ دەبینێ کە لەباریدا هەیە (تا ڕادەیەکی زۆر بیروبۆچوونەکانی تایبەت بە پەرەسەندنی بوونەوەر بگۆڕێ).

لەبەر ڕۆشناییی ئەم پێدراوە زانستییە نوێیانە پێویستە ئێستا بگەڕێینەوە بۆ لای ئەو بیرۆکە بنەڕەتییە دەرهێنراوانە لە قورئان و تایبەت بە بەدیهێنانی بوونەوەر.

## پێکگرتنێك لەگەڵ پێدراوەکانی قورئان لەبارەی بەدیهێنانەوە

ئێستا با ئەو پێنج خاڵە بنەڕەتییە بپشکنین کە قورئان زانیاری وردی تایبەت بە بەدیهێنانی لەسەر دیاری دەکات:

١— بە پێی وتەی قورئان، شەش قۆناغەکەی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردنی تەنە ئاسمانییەکان و دروستکردنی زەوی و ئەو پەرەسەندنەی بەسەر ئەمەی دواییدا هاتووە لە شیاندنی بۆ ژیان، دەگرێتەوە. لە ڕیوایەتی قورئان ڕووداوەکانی تایبەت بە زەوی لە چوار قۆناغدا ڕوویانداوە. ئایا دەبێ ئەم قۆناغانە هاوشانی ئەو چاخە جیۆلۆجییانە بێت کە زانستی نوێ پۆلێنی دەکات کە هەروەکو دەزانین مرۆڤ لە چارەکیدا دەرکەوتووە..؟ ئەمە جگە لە گریمانە شتێکی تر نییە..خودا باشتر دەزانێ.

بەڵام پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە دروستبوونی تەنە ئاسمانییەکان و زەوی دوو قۆناغ دەخوازێ هەروەکو ئایەتەکانی ٩ بۆ ١٢ی سورەتی فصلت ڕوونی

دەکاتەوە(تەماشای بابەتەکانی پێشوو بکە)، زانست پێمان دەڵێ کە ئەگەر دروستبوونی خۆر و بەرهەمە لاوەکییەکەیمان واتە زەوی وەکو نموونە وەرگرت دەبینین کە پرۆسەکە لە میانەی چڕبوونەوەی سەدیمی یەکەم و لێکجیابوونەوەی ڕوویداوە، ئەوەش بە دیاریکراوی ئەوەیە کە قورئان بە شێوەیەکی ئاشکرا و ڕوون گوزارشتی لێ دەکات کاتێ ئاماژە بۆ ئەو پرۆسەیە دەکات کە سەرەتا لە (دخان – دوکەڵ)ی ئاسمانییەوە پەیدابوو(پێکەوەلکاو پاشان لێکجیابوونەوە).ئێمە لێرەدا هاوشێوەبوونی تەواو لەنێوان پێدراوی قورئانی و پێدراوی زانستی تۆمار دەکەین.

٢– زانست بەناویەکداچوونی دوو ڕووداوی دروستبوونی ئەستێرەیەك(وەکو خۆر) و شوێنکەوتەکەی یان یەکێك لە شوێنکەوتەکانی (وەکو زەوی)ڕوون کردۆتەوە. ئەم بەناویەکداچوونە لە دەقی قورئان ڕوون نابێتەوە هەروەك بینیمان؟

٣– وەکیەکی و هاوشێوەیەیی ڕوونە لەنێوان چەمکی سەدیمی یەکەم لە زانستی نوێ و دووکەڵ بەپێی قورئان بۆ دەلالەتکردن لەسەر ئەو حاڵەتە گازییە زاڵەی ئەو ماددەیەی لە قۆناغی یەکەم بوونەوەری پێکهێناوە.

فرەیی ئاسمانەکان کە قورئان بە ژمارە(٧)ی ڕەمزی گوزارشتی لێ کردووە، بینیمان دەلالەتەکەی لەلایەن زانستی نوێ تەئکیدی لێ دەکرێتەوە، ئەوەش بە فەزڵی تێبینییەکانی گەردووناسان لەبارەی سیستەمەکانی کاکێشانەکان و ژمارە زۆرەکانییەوە. بە پێچەوانەوە فرەیی ئەو هەسارانەی لە زەوییەکەمان دەچن – بە لای کەمییەوە لە هەندێ ڕووەوە – چەمکێکە لە دەقی قورئان وەرگیراوە بەڵام

تا هەنووکە زانست بوونی نەسەلماندووە لەگەڵ ئەوەشدا پسپۆڕان پێیان وایە ئەم تێگەیشتنە تەواو مەعقووڵە.

٥- دەکرێ نزیکخستنەوە هەبێ لەنێوان بوونی ئەو خەلقە ناوەندەی نێوان (ئاسمانەکان) و (زەوی) کە لە قورئاندا گوزارشتی لێ کراوە لەگەڵ دۆزینەوەی ئەو پردانەی ماددە کە لە دەرەوەی سیستمی ڕێکخراوی گەردونیین.

بینا لەسەر ئەوە: ئەگەر ئەو پرسانەی ڕیوایەتی قورئان دەیانخاتە ڕوو تا ئەمڕۆ لە ڕووی زانستییەوە تەئکیدی لێ نەکرابێتەوە ئەوا لە هەر بارێکدا بێت کەمترین ناسازی و ناکۆکی لەنێوان پێدراوە قورئانییەکانی تایبەت بە بەدیهێنان و زانیارییە نوێیەکان لەبارەی دروستبوونی بوونەوەرەوە نییە. ئەمە بابەتێکە ئەوەی پەیوەستە بە قورئان دەبێ ئاوڕی لێ بدرێتەوە لە کاتێکدا بەڕوونی دەرکەوت کە دەقی تەورات کە ئەمڕۆ لەبەردەستمانە لەبارەی ئەم ڕووداوانەوە زانیاریگەلی قەبووڵنەکراوی لە ڕووی زانستییەوە داوە. چۆن بەمە سەرسوڕماو نابین بەتایبەت ئەگەر بزانین کە ئەو دەقەی تەورات کە زۆر بەورد و درێژی لەبارەی ڕیوایەتی بەدیهێنانەوە هەیە بە پێنووسی کاهینەکانی سەردەمی دوورخستنەوە بۆ بابل نووسراوە. ئەم کاهینانە ئامانگەلی تەشریعییان هەبووە هەروەك پێشتر باسمان کرد، بۆ ئەو ئامانجانەش ڕیوایەتێکیان چێ کردووە کە لەگەڵ ڕوانینە لاهوتییەکانیان بگونجێت. بوونی ئەم جیاوازییە لەنێوان ڕیوایەتی تەورات و پێدراوەکانی قورئان لەبارەی بەدیهێنان(الخلق)ەوە پێویستە بایەخی پێ بدرێ بەتایبەت کە هەمیشە تۆمەت ئاراستەی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) دەکرێت گوایە ڕیوایەتەکانی تەوراتی نەقڵ کردووە. ئەوەی پەیوەستە بە بابەتی بەدیهێنانەوە ئەوا تۆمەتبارکردنەکە هیچ بنەمایەکی نییە. چۆن مرۆڤێك دەتوانێت

لەوەتەی چواردە سەدەوە تا ئەم ڕادەیە ڕیوایەتێکی باوی ئەو سەردەمە ڕاست بکاتەوە، ئەوەش بە دوورخستنەوەی هەڵەگەلی زانستی و ئاشکراکردنی چەند پێدراوێك کە دواجار زانستی ئەم سەردەمە ڕاست و دروستییانی سەلماندووە! ئەمە شیمانەیەکە ناکرێ بەرگری لێ بکەین. قورئان لەبارەی بەدیهێنانەوە ڕیوایەتێك پێشکەش دەکات کە بەتەواوی لە ڕیوایەتی تەورات جیاوازە.

## وەڵامدانەوەی هەندێ پەڵپ و ڕەخنە

بوونی هەندێ خاڵی لێکچوون لەنێوان ڕیوایەتەکانی تەورات و ئینجیل و ڕیوایەتەکانی قورئان پەیوەست بە بابەتەکانی تر بە تایبەت ئەوەی تایبەتە بە مێژووی ئایینی جێی مشتومڕ نییە. سەیر لەوەدایە لەم تێڕوانینەوە تێبینی بکەین ئەگەر هیچ یەکێك مەسیحی بەوە تۆمەتبار نەکردبێت کە هەمان بابەت لەگەڵ ڕێنماییەکانی تەورات دووبارە دەکاتەوە، کەچی بە پێچەوانەوە لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکانمان هیچ کەس گرفتی نییە لەوەی گلەیی بە موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) بکات چونکە لە پەیامەکەی خۆیدا باسی کردووە، ئەوەش وا نیشاندەدا کە موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) فێڵباز بووە(حاشا لەو) لەبەر ئەوەی ئەو بابەت و ڕێنماییانە وەکو وەحیی خودا دەخاتەڕوو. کوا بەڵگە لەسەر ئەوەی کە موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) قورئانی لە پیاوانی ئایینی مەسیحی وەرگرتبێ؟ هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەمە نییە، هەروەها هیچ پاڵپشتییەك بۆ ئەو پڕوپاگەندەیە نییە کە دەڵێ: ڕاهیبێکی مەسیحی فێرکردنێکی ئایینییانەی توندی فێرکردووە. با

ئـەوە بخوێنینـەوە کـە (ڕ.بلاشـیر) لـە کتێبەکەیـدا بـە نـاوی(گرفتـی موحەممـەد) لەبارەی ئەم درۆیەوە نووسیویەتی.

بە شێوەیەکی گشتیتر: هەندێك کەس ویسـتوویانە لـە کتێبـە پیرۆزەکـان بـۆنی هەندێ ئەفسانەی پەیدابوونی بوونەوەر بکات، بۆ نموونە: باوەڕی پۆلینزییەکان بە بوونی شـلەگەلێکی بـەرایی ڕۆچـوو لـە تاریکـایی کـە لـە دەرکـەوتنی ڕووناکییـەوە جیابۆتەوە. دواتر زەوی و ئاسمـانی دروسـت کـردووە. ئەگـەر ئەفسـانەکەمان بـە ڕیوایەتی بەدیهێنان لە تەورات بەراورد کرد ئەوا بەدڵنیاییەوە لێکچوونێك دەبینین، بەڵام سادەییە گەر تـەورات تۆمـەتبار بکـەین بـەوەی ئـەم ئەفسـانەی پەیـدابوونی بوونەوەری خستۆتە ئەستۆی خۆی.

هەروەها سادەگۆییشە بڵێین: تێگەیشتنی قورئان لەبارەی دابەشبوونی ماددەی یەکـەم کـە لـە قۆنـاغی یەکەمـدا بوونـەوەری دروسـت کـردووە تێگەیشـتنێکە لـە ئەفسانە جیاوازەکانی پەیدابوونی بوونەوەرەوە پەیدابووە کە دەربڕی هەمان شـتە بە شێوەیەك یان بە شێوەیەکی تر.

سەیر ئەوەیە کە لە نزیکەوە ئەم باوەڕ و گێڕانەوە ئەفسانەییانە شی بکەینەوە زۆر جار سەرەتاکەیان بیرۆکەیەکی مەعقوڵ دێتە بەرچاو، بـەڵکو لـە هەنـدێ بـاردا هاوشێوەی ئەو واقیعەیە کە ئەمڕۆ دەیزانین یان وا دادەنێین کە دەیزانین، بەڵام لە ئەفسـانەکەدا وەسـفی ئەفسـانەییانە بـۆ بیرۆکەکـە زێـدە دەکـرێ. ئـەوە ئـەم تێگەیشتنە بەر بڵاوەیە کە دەڵێ: سەرەتا ئاسمان و زەوی یەکگرتوو بوونە پاشان دوای ئەوە لێك جیابوونەتەوە.

بۆ نموونە: لە ژاپۆن ئەفسانەکان بوونەوەری یەکەمیان لە بارێکی تێکەڵ و پێکەڵ و پاشاگەردانی وێناندووە، پاشان وێنەی هێلکەیەك کە لە ناویدا ناووکێك هەیە بۆ ئەم وێنەیە زیاد کردووە، بەم شێوەیە ئەم زیادکردنە خەیاڵییە جیددییەتی تێگەیشتنی لە ئەفسانەکە ستاندۆتەوە.

لە وڵاتانی تر بیرۆکەی (پنچکەیەك گەشە دەکات و ئاسمان بەرز دەکاتەوە و لە زەوی جیا دەکاتەوە)ی بۆ زیاد کراوە، لێرەوەش وەهمی وردەکارییە زیادکراوەکان دەبینین کە مۆرکێکی تایبەتی پێ دەدات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە مۆرکی هاوبەش لە هەموو ئەمانە بریتییە لە چەمکی بوونی یەك بارستە لە سەرەتای پەیدابوون و پەرەسەندنی بوونەوەر کە دابەشبوونی بۆتە هۆی (جیهانگەل)ێکی جیاواز کە ئەمڕۆ دەیزانین.

ئەگەر ئێمە لێرە ئەفسانەکانی پەیدابوونی بوونەوەر باس دەکەین بۆ ئەوەیە تا ئاماژە بەو ئارایشتکارییە بدەین کە وەهمی خەیاڵکردن لای مرۆڤ دەیخاتە سەر و بۆ ئەوەشە جەخت بکەینەوە لەسەر ئەو جیاوازە قوڵەی دەربڕینەکانی قورئان لەم بابەتەدا کە خاڵییە لە وردەکارییە وەهمییەکان کە تێکەڵی ئەو بیروباوەڕانە بووە. بە پێچەوانەوە دەربڕینەکانی قورئان بە کورتبڕی و ڕێکەوتن لەگەڵ پێدراوە نوێیەکانی زانست ناسراون.

ئەگەر ئەمانە سیفەتەکانی وتەکانی قورئان بن کە ماوەی چواردە سەدەیە ڕایگەیاندوون ئەوا پێناچێ بکرێ تەفسیرێکی زەمینییانە بەم وتانە بدرێت.

ئایەتە یەکەمەکانی ئێرە کە باسکران کەرەستەیەك نین بۆ تێڕامانی زانستی، بە سادەیی ئامانجی سەرنجڕاکێشانە بۆ لای توانای بەدیهێنەر. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئاماژەی بۆ بکرێ بۆ خستنەڕووی بیرۆکەیەکی دروست لەبارەی ئەو میتۆدەی کە دەقی قورئان ڕێکخستنی بوونەوەری چواردە سەدە لەمەوبەر پێ نمایش کردووە.

ئەم ئاماژانە دەبنە ڕووداوێکی نوێ لە نامەی خودایی. نە ئینجیل و نە تەورات باسی ڕێکخستن و ڕیزبەندی بوونەوەر ناکەن(بێجگە لەو چەمکانەی لەبارەی بەدیهێنانەوە لە تەورات هاتوون و بینیمان نادروستن). بەڵام قورئان بە درێژی دەڕوانێتە ئەم بابەتە. ئەوەی تێیدایە گرینگە، ئەوەی تێشیدا نییە هەر گرینگە. ئەو تیۆرانەی تێدا نییە کە لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی لەبارەی ڕێکخستنی جیهانی ئاسمانیی باو بووە، ئەو تیۆرانەی کە دواتر زانست ناڕاستیانی سەلماند. لە لاپەڕەکانی داهاتوو نموونەیەك دەخەینەڕوو.

## گەردوونناسی لە قورئان

قورئان زۆرێك لە تێڕامان لە ئاسمانەكانی لەخۆگرتووە. لە بەشی پێشوو كە تایبەت بوو بە بەدیهێنان، ئاماژەدان بۆ فرەییی ئاسمانەكان و ئەو هەسارانەی كە بە زەوی دەچن، هەروەها بوونی ئەوەی قورئان بە (ناوەندێكی نێوان ئاسمانەكان و زەوی) دەناسێنێ، ئەوەی كە زانستی نوێ دانی بە بوونی ناوە. كەواتە ئایەتەكانی تایبەت بە بەدیهێنان بە شێوەیەك بیرۆكەیەكی گشتی لەبارەی ناوەڕۆكی ئاسمانەكان واتە ئەوەی لە دەرەوەی هەسارەكەمانە بە دەستەوە داوە.

زێدەباری ئەو ئایەتانەی بە شێوەیەكی تایبەت وەسفی بەدیهێنان دەكات، نزیكەی چل ئایەتی تر هەن وردەكاریی تەواوكاری ئەم پێدراوانە لەبارەی گەردووناسییەوە باس دەكەن. هەندێ لەم ئایەتانە تەنها تێڕامانن لە گەورەییی ئەو بەدیهێنەرەی سیستمی هەموو ئەستێرە و هەسارەكانی ڕێكخستووە كە دەزانین لە سەنتەری هاوسەنگییەوە دانراون،(نیوتن) بە یاساكەی لەبارەی جێگیریی هەمیشەیی، ئەم هاوسەنگییەی لەبارەی ڕاكێشانی تەنەكان ڕوون كردۆتەوە.

### ( أ ) تێڕامانێكی گشتی لە ئاسمان:

ئایەتی (٦)ی سوڕەتی (ق):

﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ(٦)﴾

ئایەتی (١٠)ی سوڕەتی (لقمان):

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾

ئایەتی(٢)ی سورەتی (الرعد):

﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾

دوو ئایەتەکەی دوایی ئەو باوەڕە ڕەتدەکەنەوە کە پێی وایە بۆیە ئاسمان ناکەوێتە سەر زەوی چونکە کۆڵەگەیەك ڕایگرتووە.

ئایەتی (٧)ی سورەتی (الرحمان):

﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا﴾

ئایەتی (٦٥)ی سورەتی (الحج):

﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾

ئاشکرایە کە دوورکەوتنەوەی تەنە ئاسمانییەکان لە ماوەیەکی گەورە و گونجاو ڕاستەوانە لەگەڵ بارستەکانی خۆیان بنەڕەتی هاوسەنگییانە. هەر چەند تەنەکان دوورکەوتنەوە هێزی ڕاکێشانی یەکتریان لاواز دەبێت، هەر چەند زیاتر لە یەکتر نزیك ببنەوە هەر یەکەیان کاریگەری بەسەر ئەویترەوە دەبێ، ئەوە حاڵەتی مانگە، بە هۆی نزیکییەوەی لە زەوی بە یاسای ڕاکێشان کار لە هەڵکەوتەی ئاوی دەریاکان دەکات، لێرەوەیە دیاردەی هەڵکشان و داکشان دێت. نزیکایەتیی زۆری نێوان دوو تەنی ئاسمانیی بێگومان دەبێتە هۆی پێکدادانیان. ملکەچبوون بۆ هاوسەنگی، مەرجی بنەڕەتیی نەبوونی پشێوی و تێکچوونە.

لێرەدا قورئان زۆر باسی ملکەچیی ئاسمانەکان و زەوی بۆ فەرمانی خودا دەکات.

ئایەتی(٨٦)ی سورەتی (المؤمنون):

﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ (٨٦)﴾

بینیمـان کـە پێویسـتە چـۆن تێبگـەین کـە حـەوت ئاسمانەکـە واتـای چـەند ئاسمانێکە نەك ئاسمانگەلێکی بە ژمارە دیاریکراو.

ئایەتی (١٣)ی سورەتی (الجاثية):

﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (١٣)﴾

ئایەتی(٥)ی سورەتی(الرحمان):

﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ (٥)﴾

ئایەتی (٩٦)ی سورەتی(الانعام):

﴿وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَنًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا﴾

ئایەتی(٣٣)ی سورەتی (ابراهیم):

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ (٣٣)﴾

لێرە ئایەتەکـەی تـر تـەواو دەبـێ: ئاکـامی حیسـابە باسـکراوەکان بریتییـە لـە ڕێکوپێکیی گەشتی تەنە ئاسمانییەکان، قورئان بە وشەی (دائـب) گوزارشـت لـەم ڕێکوپێکییە دەکات، ئەم وشەیە لە دەقەکەدا (اسم فاعل)ی (فعـل)ێکـە کـە واتـای یەکـەمی بریتییـە لـە (کـارکردن بـە هیمـەت و بێپچـڕان: لێـرەدا ئـەم واتایـە لێ دەفامرێـت: (کۆششـکردن لــە شــتێك بــە وردی و پوختــەیی و بــە شـێوەیەکی بەردەوام، نەگۆڕێ و بە نەریتێکی جێگیر حیساب بکرێ).(سەیری الزمخشری بکە بەشی دووەم لاپەڕە ٣٠٢ چاپی حمزە ابی بکر بۆ قورئان ١٩٧٢)..

ئایەتی (٣٩)ی سورەتی(یس):

﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ (٣٩)﴾

ئەمە ئاماژەیە بۆ کەوانەبوونی هێشووە خورما کاتێ وشك دەبێ و شێوەی مانگ وەردەگرێ.

ئایەتی(١٢)ی سورەتی (النحل):

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (١٢)﴾

قورئـان ئامـاژە بـۆ ئاكـامی پرۆسـەی بنیـاتی ئاسمـانیی دەكـات لەگـەڵ جەختكردنەوە لەسەر گرینگییەكەی لە ئاسانكاری هاموشۆی مرۆڤ بە سەر زەوی و لە دەریاكان و لە حیسابكردنی كاتیشدا. ئەم تێبینییە زیاتر ڕوون دەبێتەوە كاتێ بیرمان دێتەوە كە لە ئەسڵدا قورئـان پـەیامێكی ئاراستـەكراو بـووە بـۆ خـەڵكانێك جگە لە زمانی ئاسان كە زمانی ڕۆژانەیان بووە لـە تواناياندا نـەبووە لـە شتی تـر تێبگەن. ئەوەش هۆی بوونی ئەم تێڕامانانەی خوارەوەیە:

ئایەتی(٩٧)سورەتی (الانعام):

﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٩٧)﴾

ئایەتی (١٦)ی سورەتی(النحل):

﴿وَعَلَامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ (١٦)﴾

ئایەتی(٥)ی سورەتی (یونس):

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٥)﴾

لێرە تێبینییەك پێویستە: لە كاتێكدا تەورات خۆر و مانگی بە ڕووناك وەسفاندووە، سیفەتی گەورەیی خستۆتە پاڵ یەكەم و گچكەییشی پاڵ دووەم، قورئان هەر یەكەیان تایبەت دەكات بە جیاوازیگەلێكی جگە لەوەی پەیوەستە بە قەبارەوە. بێگومان جیاوازییەكە تەنێ لە قسەدایە بەڵام چۆن دەتوانرا لەو سەردەمەدا خەڵك بدوێنرابایە بێ پەشۆكاندنیان لە هەمان كات گوزارشتیش لەو بیرۆكەیە بكەیت كە خۆر و مانگ دوو هەسارەی ڕووناك لە یەك سروشت نین؟

## (ب) سروشتی تەنە ئاسمانییەكان

## خۆر و مانگ

لە قورئاندا خۆر بە (الضیاء) و مانگیش بە (النور) ناویان هاتووە. ئەگەر ڕاستیمان بوێت ئەوا جیاوازیی نێوان ئەم دووانە زۆر كەمە تەنانەت ئەگەر بنچینەی (الضیاء) وشەی (ضوا) بێت كە بە واتای (تیشكی دایەوە) دێت.

بەڵام قورئان لە ڕێی چەند بەراوردكردنێكی ترەوە جیاوازیی نێوان خۆر و مانگ دیاری دەكات.

ئایەتی(٦١)ی سورەتی (الفرقان):

﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجًا وَقَمَرًا مُنِيرًا (٦١)﴾

ئایەتی (١٥ و ١٦)ی سورەتی (نوح):

﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا (١٥) وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا(١٦)﴾

ئایەتی(١٢ و ١٣)ی سورەتی (النبأ):

﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا (١٢)وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا (١٣)﴾

تەواو ڕوونە کە مەبەست لە (السراج الوهاج) خۆرە.

لێرە هەیڤ وەکو تەنێکی ڕووناککەرەوە دەناسرێ و بنجی وشەکە (النور)ە کە سیفەتی مانگە، بەڵام خۆر قورئان بەراوردی دەکات (السراج الوهاج).

بەدڵنیاییەوە مرۆڤی سەردەمی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) دەیتوانی جیاوازی بکات لە نێوان خۆر کە تەنێکی ئاسمانیی گڕدارە و دانیشتوانی بیابان باشی دەناسن، لەگەڵ هەیڤ کە تەنی شەماڵ و شێداریی شەوانە. کەواتە بەراوردکردنەکانی تایبەت بەم بابەتە کە لە قورئاندا دەیبینین تەواو سروشتییە. ئەوەی لێرەدا شیاوی ئاماژەپێدانە ئەو کورتبڕییەیە لە بەراوردکردنەکان، زیاد لەوەش دەقی قورئان هیچ ڕەگەزێکی بەراوردکراوی تێدا نییە کە لەو سەردەمەدا باو و بڵاو بووە و ئەمڕۆ بۆتە وەهم.

زانراوە کە خۆر ئەستێرەیەکە بە هۆی سووتانی ناوەوە گەرمییەکی زۆر و ڕووناکی پەیدا دەبێ، لە کاتێکدا هەیڤ لە خۆیدا ڕووناککەرەوە نییە بەڵکو ئەو

ڕووناکییەی لە خۆری وەردەگرێ پەرچی دەکاتەوە، هەورەها هەسارەیەکی سستە(بە لای کەمەوە ئەوە بە نیسبەت توێکڵە دەرەکییەکەی). کەواتە هیچ شتێك لە قورئاندا نییە ناساز و بەرهەڵست بێت لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ لەبارەی ئەم دوو تەنە ئاسمانییە دەیزانین.

## ئەستێرەکان

هەروەك دەزانین ئەستێرەکان تەنی ئاسمانیین وەکو خۆر و شوێنی دیاردەگەلی فیزیکی جۆراوجۆرن. ئاسانترین شت کە لەم تەنانە ببینرێ بریتییە لە دیاردەی بەرهەمهێنانی ڕووناکی. ئەو تەنانە تیشکی تایبەت بە خۆیان هەیە. وشەی (نجم — نجوم کۆیەکەیەتی) سێزدە جار لە قورئان هاتووە و چاووگی وشەی نجم بە واتای: دەرکەوت، توانای دیتنی هەیە، دێت،، ئاماژە دەکات بۆ تەنێکی ئاسمانیی بینراو بێ ئەوەی سروشتەکەی دیاری بکات: واتە سەرچاوەی تیشك و ڕووناکی بێت یان تەنها پەرچدەرەوەی ڕووناکییەك بێت کە وەریگرتووە، سیفەتێك دەدرێتە پاڵ وشەکە کە دیاری دەکات مەبەست لێی ئەوەیە کە ئەمڕۆ ناوی دەنێین ئەستێرە(نجم). ئەمەش لەمانەدا دەبینین:

ئایەتی(١ بۆ ٣)ی سورەتی (الطارق):

﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ (٢) النَّجْمُ الثَّاقِبُ (٣)﴾

لە قورئان ئەستێرەی ئاسمان بە وشەی (الثاقب) وەسف دەکرێ واتە: ئەوەی گڕدەگرێ و دەسووتێ و بەناو شتێکدا دەڕوات(مەبەست لێرە تاریکاییەکانی

شەوگارە). هەروەها هەمان وشە بۆ دەلالەتکردن لە (نەیزەك) لە ئایەتی (١٠)ی سورەتی (الصافات)دا دەبینین:

﴿فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ (١٠)﴾

ئەم نەیزەکانە (یان ئەستێرە کونکەرانە) بەرەنجامی کردەی سووتانە.

## هەسارەکان

زەحمەتە بتوانین بڵێین: ئەو هەسارانەی لە قورئاندا باس کراون بە دیاریکراوی مەبەست لێیان ئەو تەنە ئاسمانییانەی ئەمڕۆن.

هەسارەکان لە خودی خۆیاندا ڕووناك و ڕووناککەرەوە نین. ئەوان بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە و زەوییەکەشمان بەشێکە لێیان. ئەگەر وامان دانا کە دەکرێ ئەم هەسارانە لە شوێنێکی تردا هەبن ئەوا ئێمە بوونی ئەم هەسارانە لە دەرەوەی سیستمی خۆردا نازانین.

لە سەردەمی کۆن بێجگە لە زەوی پێنج هەسارەی تر دەناسران: عەتارد، ڤینۆس، مەریخ، موشتەری، زوحەل. سێ هەسارەی تریش تازە دۆزراونەتەوە: ئورانۆس، نیپتۆن، پلۆتۆن.

وا دەردەکەوێ کە قورئان بە ناوی (کواکب – هەسارەکان) بێ دیاریکردنی ژمارە ئاماژەی پێ دەکات. خەونی یوسف ئاماژە بە یازدە هەسارە دەکات، ئایەتی (٤)ی سورەتی یوسف:

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا﴾

لە ڕووی لۆژیکەوە، مەبەست لێرە گێڕانەوەی خەیاڵییە. بەڵام وا دەردەکەوێ کە لێرەدا پێناسەیەکی دروست بۆ دەلالەتی وشەکە لە قورئاندا هەیە، ئەو پێناسەیەش ئایەتەکە دەیدات ئاشکرا و دیارە ئەگەرچی واتا قووڵەکەی، ڕووحییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئایەتە مایەی مشتومڕێکی زۆرە لەنێو ڕاڤەکاران، بەڵام گرینگییەکی زۆریشی هەیە، هۆکاری ئەوەش بە هۆی ئەو بەراوردکردنەیە کە تایبەت بە وشەیەکە کە وا پێدەچێ ئاماژە بۆ هەسارەیەك دەکات، ئەو ئایەتەی مەبەستمانە ئەم ئایەتەیە:

ئایەتی(٣٥)ی سورەتی (النور):

﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ﴾

مەبەست لێرە بەرکەوتنی تیشکێکە بە تەنێك کە پەرچی دەکاتەوە(شووشە) و شەوقی مرواری دەداتێ وەکو ئەو هەسارەیەی خۆر ڕووناکی دەکاتەوە. ئەوە ئەو تاکە وردەکارییە ڕوونکەرەوەیەی تایبەت بە وشەکەیە کە دەکرێ لە قورئان بیدۆزینەوە.

وشەکە لە چەند ئایەتێکی تردا هاتووە. لە هەندێکیاندا ناکرێ دیاری بکرێ کە مەبەست لێی چ تەنێکی ئاسمانییە.

ئایەتی(٧٦)ی سورەتی (الانعام): ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا﴾

ئایەتی(١و٢)ی سورەتی(الانفطار):

﴿إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ (١) وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انْتَثَرَتْ (٢)﴾

لەگەڵ ئەوەشدا لە یەکێك لە ئایەتەکان و لەبەر ڕۆشنایی زانیارییە نوێیەکان دەبینین کە مەبەست لێی جگە لە تەنە ئاسمانییەکان کە دەزانین هەسارەکانن زەحمەتە شتێکی تر بێت.ئایەتی (٣٧)ی سورەتی (الصافات) دەڵێ: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ (٦)﴾

ئایا (ئاسمانی دونیا)ی تەعبیری قورئان ئاماژە بۆ سیستمی خۆر دەکات..؟ زانراوە کە لێرەدا لەنێوان ئەو تۆخمە ئاسمانییانەی زیاتر لێمانەوە نزیکن جگە لە هەسارەکان توخمگەلێکی تری بەردەوام نین: خۆر تاکە ئەستێرەیە لەو سیستمە کە ناوەکەی هەڵگرتووە. ئێمە لێرەدا هیچ تەنێکی ئاسمانیی تر نابینین کە مەبەستی بێت مەگەر مەبەست هەر هەسارەکان بێت. لەسەر ئەمە ئەو تەفسیرە دراوە وا دەردەکەوێ ڕاستەکە بێت، هەروەکو پێدەچێ قورئان باسی بوونی هەسارەکان بەپێی پێناسەی نوێ بکات.

## ئاسمانی دونیا

قورئان زۆر جار ئاماژە دەکات بۆ ئاسمانی دونیا و ئەو تەنە ئاسمانییانەی پێکیان دێنێ، لە سەرەتاشەوە هەسارەکان هەروەکو دەردەکەوێ و وەکو کە تازەش بینیمان. بەڵام واتا دروستە تاماوی دەبێت کاتێ دەبینین کە قورئان چەند ئیعتیبارێکی تری خاوەن مۆرکی ڕۆحی دێنێتە ناوەوە کە ئێمە ئەمڕۆ تێگەیشتنێکی ماددیی سووکمان پێداوە و بە زانستی نوێ دامانپۆشتووە.

لەسەر ئەوە دەکرێ ئەم ئایەتەی دوایی کە لە سەرەوە باسمان کردووە بێ گرفت تێ بگەین. بەڵام کاتێ ئایەتی دوای ئەو دەڵێ (ئایەتی ٧ی سورەتی

الصافات): ئەوا ئەو قسانە خودان مۆرکێکی ترە. (الحفظ) لە ئایەتی ٢١ی سورەتی (الانبیاء)ی هاتووە: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَحْفُوظًا﴾

لە ئایەتی ١٢ی سورەتی (فصلت)یش: ﴿وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا﴾

هەروەها دەکرێ چ واتایەك بدرێ بەو بەردانە(رجوما للشیاطین) کە ئایەتی (٥)ی سورەتی (الملك) لە ئاسمانی دونیای دادەنێ..؟ ئایا ئەو چرایانەی کە لە هەمان ئایەت باس کرا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەیزەکانەی کە بینیمان پێشتر باسی کرد؟

هەموو ئەم تێڕامانانە وا دەردەکەوێ لە دەرەوەی بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە بێت. لێرە بە مەبەستی شارەزابوون و ئاگاداربوونی تەواو ئاماژەی بۆ دەکەم..وا پێناچێ پێدراوە زانستییەکان بتوانێ لە باری ئێستادا هیچ ڕۆشناییەك بخاتە سەر بابەتێك کە لە سەرووی تێگەیشتنی مرۆڤەوەیە..

## (ج) پێکهاتەی ئاسمانی:

لەبارەی ئەم پرسەوە لە قورئاندا شتێکی تایبەت بە سیستمی خۆر بە شێوەیەکی سەرەکی نابینین، بەڵام ئاماژەگەلێك هەن لەمەڕ دیاردەگەلێك کە لە سەرووی خودی سیستمی خۆرەوەن، ئەم دیاردانە لە سەردەمی نوێدا دۆزراونەتەوە.

لێرەدا دوو ئایەتی ئەوپەڕی گرینگ هەن کە تایبەتن بە هەردوو خولگەی خۆر و مانگەوە:

ئایەتی (٣٣)ی سورەتی (الانبیاو):

﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ (٣٣)﴾

ئایەتی(٤٠)ی سورەتی (یس):

﴿لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ (٤٠)﴾

قورئان بە ڕوونی باسی بابەتێکی جەوهەری دەکات ئەویش بریتییە لە بوونی خولگەیەك بۆ هەر یەك لە خۆر و مانگ هەروەکو ئاماژە بە هاتوچۆی ئەم دوو تەنە دەکات لە بۆشایی ئاسمان و هەر یەکەیان بە جووڵەیەکی تایبەت.

زیاد لەوەش، خوێندنەوەی ئەم دوو ئایەتە بابەتێکی تر بە نەرێ دەردەخات ئەویش ئاماژەکردنە بۆ هاتوچۆی خۆر لەسەر خولگەیەك بێ وردەکاری لەسەر ئەو خولگەیە بەنیسبەت زەوییەوە، بە نیسبەت تێبینی کردنەوە ئەم خولگەیە تەنها ڕواڵەتییە. لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان وا باوەڕ دەکرا کە خۆر وەکو خاڵێکی جێگیر لەگەڵ زەویدا هاتوچۆ دەکات. ئەوە سیستمی باوی سەنتەرایەتیی زەمینی بوو لەوەتەی (پەتلیمۆس)ەوە، واتە لە سەدەمی دووەمی پێش زایینەوە، ئەم باوەڕە تاوەکو (کۆپەرنیك) لە سەدەی شازدە پشتیوانی لێ دەکرا. ئەم تێگەیشتنە وێڕای باو و بڵاو بوونی لە سەردەمی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) بەڵام لە هیچ شوێنێکی قورئان بەدەرناکەوێ نە لە ئایەتە گەردوونییەکان نە لە شوێنی تر.

## بوونی دوو خولگە بۆ مانگ و خۆر

ئەوەی لێرە بە خولگە(مدار) لێکدەدرێتەوە، لە قورئاندا وشەی (فلك)ی بۆ بەکارهاتووە کە وشەیەکی کۆنی عەرەبییە. زۆرێك لە وەرگێڕ و لێکدەرەوان واتای (گۆ – کرة)یان بە وشەی (فلك) بەخشیوە و (حميدالله) بە واتای خولگە تەفسیری کردووە.

وشەکە ڕاڤەکارانی کۆنی قورئان سەرسام کردووە چونکە لە توانایاندا نەبووە گەشتی بازنەییی مانگ و خۆر لە بۆشاییی ئاسماندا بێننە بەرچاویان، بۆیە لەبارەی ڕێڕەوی ئەم دوو تەنە وێنەی تەواو هەڵەیان نمایان کردووە یان لە دروستیدا لە ئاستی جیاوازدا بوونە.(حەمزە ئەبووبەکر) لە لێکدانەوەی قورئاندا باس لە هەمەچەشنی لێکدانەوەکان لەبارەی وشەی (فلك)ەوە دەکات لەوانە: (وەکو شێوەی ئاسنی دەستاڕ، گۆیەکی ئاسمانی، خولگە، کەلووەکان، ڕۆیی، خێرایی، کوێرە شەپۆل...) بەڵام (الطبری) ڕاڤەکاری بەناوبانگی سەدەی دەیەم لەبارەی ئەم وشەیەوە دەڵێ: (لەبارەی شتێك کە هیچ زانستێکمان لەبارەیەوە نییە بێدەنگ دەبین)(تەفسیری تەبەری بەشی ١٧ لاپەڕە ١٥ ، ١٦). ئەوە بۆمان ڕوون دەکاتەوە خەڵك تا چ ڕادەیەك دەستەوسان بوونە لە وێناکردنی بیرۆکەی خولگەی خۆر و خولگەی مانگ، لەمەشەوە ڕوون دەبێتەوە ئەگەر وشەی (فلك) تێگەیشتنێکی باوی لە سەردەمی موحەممەددا (درودی خوای لێ بێت)مەبەست بووایە ئەوا تەفسیرکردنی ئەم ئایەتانە ئەم هەموو دژوارییەی تووش نەدەهات، بەم جۆرە قورئان لەو سەردەمەدا تێگەیشتنێکی نوێی پێشکەش کرد کە تەنها دوای چەندان سەدە ئینجا ڕوون بۆوە.

## سەبارەت بە مانگ:

لە سەردەمی ئێستاماندا ئەو تێگەیشتنە باوە کە مانگ وەکو شوێنکەوتەیەکی، بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە و بە ٢٩ ڕۆژیش خولانەوە زەمەنییەکەی تەواو دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بیرۆکەی سوڕانەوەی ڕەهای خولگەی مانگ ڕاست بکرێتەوە: گەردووننناسیی نوێ سەلماندوویەتی کە خولگەکە بەتەواوی بازنەیی نییە، بە جۆرێك موەی نێوان زەوی و مانگ بە خەملاندنێکی تێکڕا دەگاتە (٣٨٤٠٠٠) کم.

پێشتر بینیمان کە قورئان سوودی تێبینی کردنی جووڵەکانی مانگی لە پێوانەکردنی زەمەندا دەرخست (ئایەتی ٥ ی سوڕەتی یونس، تەماشای سەرەتای ئەم بەشە بکە).

ئەم ڕێبازی حیسابکردنی زەمەنە ڕەخنەی زۆری لێ گیراوە چونکە زۆر کۆنە و کردەنی و زانستییش نییە بەراورد لەگەڵ ئەو ڕێبازەی ئێمە کە پشت دەبەستێ بە خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆر و کە ئەمڕۆ بە ساڵنامەی ساڵانەی (جولیان) ناسراوە.

ئەم ڕەخنەیە دوو تێبینی دەخوازێ:

أ- قورئان چواردە سەدە لەمەوبەر ڕووی کردۆتە دانیشتووانی نیوە دوورگەی عەرەبی ئەوانەی بۆ کات و زەمەن حیسابی مانگییان بەکاردەهێنا. کەواتە وەها گونجاو بووە کە بەو تاکە گوتارەی دەیانتوانی لێی تێ بگەن بدوێنرێن و قسەیان لەگەڵدا بکرێ وەگەرنا لە وەرگرتنی ئاماژەگەلی شوێن و کاتدا نەریتەکانیان لێ دەشێوا چونکە نەریتەکەیان تەواو کارا و کاریگەر بووە. زانراوە کە دانیشتووانی

بیابان لە ئاسماننناسی و ڕێبەریکردن بە ئەستێرەکان و دیاریکردنی زەمەن بەپێی قۆناغەکانی مانگ شارەزا بوون و هەموو ئەمانە بۆ ئەوان لە سادەترین هۆکار و کاریگەرترینیان بوون.

ب- ئەگەر لەم پرسانەدا پسپۆڕانمان خستە لایەکەوە، ئەوا ئێمە بە گشتی لەبارەی پەیوەندیی تەواوی نێوان ساڵنامەی مانگی و ساڵنامەی جولیان کە تێیدا ساڵ لە ٣٦٥ ڕۆژ و چارەگە ڕۆژێك پێکهاتووە نەشارەزاین، درێژاییی ساڵێك کە تەنها لە ٣٦٥ ڕۆژ پێکدێ هەموو چوار ساڵێك پێویستی بە ڕاستکردنەوەیە(ئەوەیە کە بە ساڵانی کەبیسە ناسراوە واتە ساڵی تەواو). بەڵام لە ساڵنامەی مانگی ئەوا هەمان ئەو دیاردانە هەموو ١٩ ساڵێك لە ساڵنامەی جولیان دووبارە دەبێتەوە.ئەوەش ناودەبرێ بە سوڕی میتون گەردوونناسی یۆنانی کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین چوونیەکیی وردی نێوان هەردوو زەمەنی خۆری و مانگی دۆزییەوە.

## سەبارەت بە خۆر:

وێناکردنی بوونی خولگەیەك بۆ خۆر مەسەلەیەکی زیاتر دژوارە، ئێمە ڕاهاتووین لەسەر ئەوەی سیستمی خۆرەکەمان بە دەوریدا ڕێکخراوە. بۆ ئەوەی لە ئایەتە قورئانییەکە تێ بگەین پێویستە سەیری خۆر بکەین لەنێو کاکێشانەکەمان و دواتر سوود لە زانیارییەکانی زانستی نوێ وەربگرین. کاکێشانەکەمان لە ژمارەیەکی بێشوماری ئەستێرە پێکهاتووە کە دابەش بەسەر لوولەکێك کە لە سەنتەرەکەیدا ئەستوورترە وەك لە دەوروبەرەکەی. شوێنێکی دوور لە سەنتەری

لوولەکەکە داگیردەکات. لەبەرئەوەی کاکێشان بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و تەوەرەکەی سەنتەرەکەیەتی بۆیە بەرەنجامی ئەوە بریتییە لەوەی خۆر بەپێی خولگەیەکی بازنەیی بە دەوری هەمان ئەم سەنتەرە دەخولێتەوە. گەردووناسیی نوێ توخمەکانی ئەم خولگەیەی حیساب کردووە و (شاپلی shapley) لە ساڵی ١٩١٧ دووریی خۆری لە سەنتەری کاکێشان بە (١٠) کیلۆ فەرسەخ خەمڵاندووە واتە بە کیلۆمەتر بە نزیکەیی دەکاتە ژمارە (٣) و لە لای ڕاستیدا ١٧ سفر هەبێ(٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠). بۆ ئەوەی کاکێشان بە خۆرەوە خولێکی تەواو بە دەوری خۆیدا بسووڕێتەوە ئەوا پێویستی بە نزیکەی ٢٥٠ ملیۆن ساڵە، خۆر لەم بزاوتەدا بەخێراییەکی نزیکەیی کە دەگاتە ٢٥٠ کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەڕوات.

ئەوە ئەو جووڵە خولگەییەی خۆرە کە قورئان بەر لە چواردە سەدە لەمەوبەر ڕایگەیاندووە، بوونی ئەم جووڵەیە و نیشانەکەی، ئێستا لە دۆزراوەکانی گەردووناسیی نوێیە.

## ئاماژەکردن بۆ هاتوچۆی مانگ و خۆر لە بۆشاییی ئاسمان بە جووڵەیەکی تایبەت

ئەم چەمکە لە وەرگێڕان و تەفسیرەکانی قورئان کە ئەدیبان کردوویانە بوونی نییە، لەبەرئەوەی چییان لە گەردووناسی نەزانیوە بۆیە ئەم وشە عەرەبییەی تەعبیر لەم جووڵەیە دەکات بە یەك واتا لە واتاکانی لێکداوەتەوە کە بریتییە لە(عام — یعوم: مەلەی کرد، مەلە دەکات): ئەوە وەکیەك لە تەفسیرە فەرەنسیی

و ئینگلیزییەکان دەبینین، ئەمەی دوایی کە یوسف عەلی لە تەفسیرە ئینگلیزییەکەیدا ئەنجامی داوە شیاوی دەسخۆشی و پێزانینە.

ئەو وشە عەرەبییەی ئاماژە بۆ هاتوچۆ بە جووڵەیەکی تایبەت دەکات بریتییە لە(سبح) (لە دوو ئایەتەکە: ((یسبحون)). هەموو واتاکانی وشەکە هاتوچۆکردن بە جوڵەیەکی وەها لە خۆدەگرێ کە تەنەکەی پێ جیادەکرێتەوە. ئەگەر هاتوچۆکردنەکە لەناو ئاودا بێت دەبێتە واتای (سبح)، هەروەها ئەگەر هاتوچۆ لەسەر زەوی بە پێیەکانیش بێت هەر ئەو واتایەی هەیە، سەبارەت بە جووڵە لە بۆشاییی ئاسمان تەعبیرکردن لە بیرۆکەی نێو ئەم وشەیە دژوار دەبێت مەگەر بە بەکارهێنانی واتای یەکەم. بەم شێوەیە پێناچێ بە بەکارهێنانی واتای بنجیی وشەکە هەڵە ڕوویدا بێت ئەوەش لەبەر ئەم هۆکارانە:

— هەیڤ خولانەوەی بە دەوری خۆیدا لە هەمان ئەو وەختە تەواو دەکات کە بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە، واتە نزیکەی ٢٩ ڕۆژ و نیو، بە جۆرێك ڕووەکەی لەبەر چاومان هەمان ئەو ڕووەیە کە دەیبینین.

— خۆر بە نزیکەی ٢٥ ڕۆژ بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە نیسبەت هێڵی یەکسان و هەردوو جەمسەرەکەوە هەندێ سیفەتی تایبەت لە خولانەوەکەدا هەیە ئێمە ناچینە نێو وردەکارییەوە.

کەواتە لێرەدا جیاوازییەکی (وتەیی)ی ورد هەیە تێیدا قورئان ئاماژە بۆ بزاوتە تایبەتەکانی هەر یەك لە خۆر و هەیڤ دەکات. زانستی نوێ بزاوتەکانی ئەو دوو تەنە ئاسمانییەی تەئکید کردۆتەوە و ناکرێ وێنای ئەوە بکرێ کە پیاوێك لە

سەدەی حەوتەم توانیویەتی خەیاڵی ئەمە بکات هەرچەند لە سەردەمەکەی خۆیدا زانا بوو بێت، ئەوەش حاڵی موحەممەد نییە(درودی خوای لێ بێت).

هەندێ جار دژ بەم ڕوانینە حاڵەتی چەند بیریارێکی گەورەی سەردەمی کۆن دەهێنرێتە پێشەوە، ئەو بیریارانە بێ هیچ مشتومڕێك هەندێ بابەتیان دەربڕیوە کە زانستی نوێ دانی بە دروستییان ناوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە توانای ئەم بیریارانە نەبووە پشت بە بەرهەمهێنانی زانستی ببەستن بەڵکو زیاتر پشتیان بە عەقلگەرایی فەلسەفی بەستووە. بۆ نموونە: زۆرێك حاڵەتی فیساگۆرس دەهێننەوە ئەوانەی لە سەدەی شەشەمی پێش زایین داکۆکییان لە تیۆری خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆی و سوڕانەوەی هەسارەکان بە دەوری خۆردا دەکرد، ئەو تیۆرەش زانستی نوێ دروستییەکەی سەلماندووە. ئەگەر حاڵەتی فیساگۆرسییەکان و ئەو حاڵەتەی مەبەستمان لێك نزیك کردەوە، ئەوا هێنانەوە پێشەوەی ئەو گریمانەیە ئاسان دەبێت کە دەڵێ: موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) بیریارێکی بلیمەت بوو و بە تەنها خۆی بیری لەو شتانە کردەوە کە بە چەند سەدەیەك دواتر زانستی نوێ کەشفی کرد. بە سادەیی: ئەو ڕەخنەگرانە بەم بیرکردنەوەیان، باسکردنی لایەنەکانی تری بەرهەمی عەقڵی لە کن بلیمەتەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفی فەرامۆش دەکەن، هەروەك باسکردنی ئەو هەڵە گەورانەش فەرامۆش دەکەن کە دانراوەکانیان لەکەدار دەکات. بۆ نموونە: پێویستە ئەوە لەبیرنەکەین کە فیساگۆرییەکانیش بەرگرییان لە تیۆری جێگیریی خۆر لە بۆشاییی ئاسماندا دەکرد و کردبوویانە سەنتەری جیهان و بوونی پێکهاتەیەکی ئاسمانییان جگە لە خۆر بەبیردا نەهاتبوو. لە واقیعدا بوونی تێکەڵەیەك لە بیروبۆچوونی ڕاست و هەڵە لەبارەی بوونەوەرەوە شتێکی ئاسایییە لە کن گەورە فەیلەسووفەکانی

کۆن. پێویستە ڕەونەقی چەمکە پێشکەوتووەکانی ئەم دانراوە مرۆییانە سەرسامەمان نەکەن و ئەو چەمکە چەوتانەمان لەبیرببەنەوە کە خوڵقاندوویانە. هەر ئەوەشە تەنها لە ڕوانگەی زانستییەوە لە قورئان جیای دەکاتەوە، ئەو قورئانەی باسکردنی چەندان بابەتی پەیوەست بە زانیارییە نوێیەکان تێدایە بێ ئەوەی هیچ بانگەشەیەکی پێچەوانە لە بەرامبەریدا هەبێ لەو شتانەی زانست لەم سەردەمەماندا سەلماندوویەتی.

## بەدوای یەکداهاتنی ڕۆژ و شەو

ئەو مرۆڤە کێیە کە نەدەبوو قسە لەبارەی بزاوتی خۆر بکات سەبارەت بە بەدوای یەکداهاتنی ڕۆژ و شەو، لە سەردەمێکدا کە زەوییان بە سەنتەری جیهان و بە نیسبەت زەوییە خۆریان بە جوڵاو دادەنا؟ وێڕای ئەوە ئەم پرسە لە قورئان دەرناکەوێ کە بابەتەکە بەم جۆرە باس دەکات:

ئایەتی ٥٤ی سوڕەتی (الاعراف):

﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾

ئایەتی ٣٧ی سوڕەتی (يس):

﴿وَآيَةٌ لَهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُمْ مُظْلِمُونَ(٣٧)﴾

ئایەتی ٢٩ی سوڕەتی (لقمان):

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾

ئایەتی ٥ی سورەتی (الزمر):

﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾

ئایەتی یەکەم پێویستی بە هیچ کۆمێنتێك نییە. ئایەتی دووەمیش تەنها دەیەوێ وێنەیەك پێشکەش بکات. بەڵام ئایەتەکانی دووەم و سێیەم دەکرێ بە شێوەیەکی سەرەکی گرینگییەك بە نیسبەت پرۆسەی بەناویەکداچوون و بەتایبەت هاتنی شەو بەسەر ڕۆژ و هاتنی ڕۆژ بەسەر ڕۆژدا دەربخەن(ئایەتی ٥ ی سورەتی الزمر).

(كور) بە واتای پێچرانەوە دێت، هەروەك (ر.بلاشیر) لە تەرجەمەکردنی قورئاندا وا دەڵێ. واتای یەکەمی ئەم فرمانە بریتییە لە پێچانی مێزەر لە سەر بە شێوەی حەلەزۆنی. هەموو واتاکانی تری وشەکە چەمکی (التكور — پێچانەوە) لەخۆدەگرن..

بەم پێیە، کەواتە لە بۆشایی ئاسماندا چی ڕوودەدات..؟ خۆر بە شێوەیەکی بەردەوام ئەوە نیوە گۆی زەوییەی دەکەوێتە بەردەمی ڕووناك دەکاتەوە(تەنها لە کاتی خۆرگیران نەبێت)، لە کاتێکدا نیوەکەی تر بە تاریکی دەمێنێتەوە. ئاسمانەوانە(رائد الفضاء) ئەمریکاییەکان ئەمەیان بینیوە و لە کەشتییە ئاسمانییەکانیانەوە وێنەیان گرتووە بەتایبەت لە دوورایییەکی دووری زەوییەوە..بۆ نموونە لەسەر ڕووی مانگەوە. بە خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لە کاتێکدا ڕووناك کردنەوە بەجێگیری دەمێنێتەوە ئەوا بەشە ڕووناکەکەی — لەسەر شێوەی نیوە گۆیەك — لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا خولانەوەکەی بە دەوری زەویدا تەواو دەکات، لە کاتێکدا نیوە تاریکەکەی تر لە هەمان دەم نیوەی گەشتەکە تەواو

دەكات. قورئان بە شێوەیەكی تەواو وەسفی ئەم خولانەوەیە دەكات كە شەو و ڕۆژ هەرگیز ناوەستێ. ئەمڕۆ ئەمە بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ ئاسانە چونكە ئەمڕۆ ئێمە شارەزاییەكی فیكریمان لەبارەی جێگیریی خۆر(جێگیرییەكی ڕێژەیی) و خولانەوەی زەویدا هەیە. ئەم پرۆسە بەردەوامە لە پێچانەوە لەگەڵ چوونە ناوەوەیەكی بەردەوامی بەشێك لە یەكێكی تر قورئان وەها گوزارشتی لێ دەكات وەكو ئەوەی دۆزینەوەی سوڕانەوەی زەوی لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان ڕوویدا بێت، بێگومان هێشتا ئەمە ڕووی نەدابوو.

پێویستە ئەم ئیعتیبارە تایبەتانە بە بەدوای یەكداهاتنی ڕۆژ و شەو بە ئاماژەگەلی هەندێ ئایەتی قورئان لەبارەی فرەیی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواكان ببەستینەوە. گرینگیی ئەم ئاماژانە تەنێ وەسفین و تێبینی كردنیان شتێكی باوە. لێرەش هەر بە ئامانجی گواستنەوەی تەواوی كەماڵی قورئان لەبارەی ئەم بابەتەوە ئاماژەی بۆ دەكەین. بۆ نموونە، لەم ئایەتانە وەكو ئەمانەی خوارەوە:

ئایەتی(٤٠)ی سورەتی (المعارج):

﴿....بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ....﴾

ئایەتی(١٧)ی سورەتی (الرحمان):

﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ (١٧)﴾

ئایەتی (٣٨) سورەتی (الزخرف):

﴿...بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ....﴾ ئەوەش وێنەیەكە گوزارشت لە فراوانیی ماوەی نێوان دوو خاڵ دەكات.

ئەوەی سەرنجی هەڵهاتن و ئاوابوونەکانی خۆر بکات باش دەزانێ کە خۆر لە چەند خاڵێکی جیاوازی ڕۆژهەڵات هەڵدێ و لە چەند خاڵێکی جیاوازی ڕۆژئاوا ئاوا دەبێ، ئەوەش بە پێی وەرزەکان. ئەو نیشانانەی لە هەر دوو ئاسۆکە وەردەگیرێ خاڵانێکی ئەوپەڕ وەردەگیرێ کە ئاماژە بۆ دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا دەکات، چەند خاڵێکی ناوەند بە درێژاییی ساڵ لەنێوانیاندا هەیە. لەم دیاردەیەدا هیچ شتێکی نائاسایی نییە بەڵام ئەوەی پێویستە سەرنجی بدەین پەیوەستە بە بابەتەکانی تر کە لەم بەشەدا شوێنی لێکۆڵینەوەیەو، وەسفی چەند دیاردەیەکی گەردوونیی تێدایە کە لە قورئاندا باس کراوە، وا دەردەکەوێ ئەم وەسفەش لەگەڵ چەمکە نوێیەکان هاوڕێك و تەبا بێت.

## ( د ) پەرەسەندنی جیهانی ئاسمانیی:

بە باسکردنی بیرە نوێیەکان لەبارەی دروستبوونی بوونەوار، باسی ئەو پەرەسەندنەشمان کرد کە لەوەتەی سەدیمی یەکەمەوە ڕوویداوە تا دروستبوونی کاکێشان و ئەستێرەکان ئەوەی پەیوەستە بە سیستمی خۆر تا دەرکەوتنی ئەستێرەکان ئەوەش بە دەسپێك لە خۆرەوە لە قۆناغێکی پەرەسەندنیدا. پێدراوە نوێیەکان ڕێ بەوە دەدات بیر بکەینەوە لە بوونی پەرەسەندنێکی بەردەوامی سیستمی خۆر و بوونەوار بە شێوەیەکی گشتی تاوەکو ئێستا.

قورئان چەندان جار باس لەوە دەکات کە خودا ﴿سخر الشمس و القمر كل يجري لأجل مسمى﴾.

ئەم ڕستەیە لە ئایەتی ٢ی سورەتی الرعد و ئایەتی ٢٩ی سورەتی لقمان و ئایەتی ١٣ی سورەتی فاطر و ئایەتی ٥ی سورەتی الزمر دەبینین.

لەوە زیاتر، بیرۆکەی (الاجل المسمی — کاتی دیاریکراو) هاوبەشە بە بیرۆکەی شوێنێکی دیاریکراو بۆ گەیشتن پێی، ئەمە دەبینین لە:

ئایەتی ٣٨ی سورەتی (یس):

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (٣٨)﴾

شوێنە دیاریکراوەکە تەفسیری وشەی (مستقر)ە. لێرەدا هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە بیرۆکەی شوێنی دیاریکراو پەیوەستە بەم وشەیەوە.

بەراوردکردنی نێوان ئەم بانگەشانە و ئەو پێدراوانەی زانستی نوێ سەلماندوونی چۆن دەردەکەوێ؟

قورئان سنورێك بۆ پەرەسەندنی خۆر و شوێنێك بۆ گەیشتنی دادەنێ و هەروەها کۆتاییەك بۆ خولی مانگ دادەنێ. بۆ ئەوەی واتای گونجاوی ئەم وتانە تێ بگەین پێویستە باسی زانیارییە نوێیەکان لەبارەی پەرەسەندنی ئەستێرەکان بە گشتی و خۆر بەتایبەتی بکەین، پاشان باسی ئەو پێکهاتە ئاسمانییانە بکەین کە لە بۆشاییی ئاسماندا بە زەرورەت شوێن بزاوتی خۆر دەکەون کە مانگیش بەشێکە لێی.

خۆر ئەستێرەیەکە زانایانی گەردوونناسی تەمەنەکەی بە (٤,٥) ملیار ساڵ دەخەملێنن. هەروەکو حاڵی هەموو ئەستێرەکان دەکرێ قۆناغی پەرەسەندنی دیاری بکرێ. ئێستا خۆر لە قۆناغی یەکەمیدایە ناسراوە بە گۆڕانی گەردیلەکانی

هایدرۆجین بۆ گەردیلەکانی هیلیۆم: لە ڕووی تیۆرییەوە دەکرێ ئەم قۆناغە (٥,٥) ملیار ساڵی دیکە بەردەوام بێت ئەوەش بەپێی ئەو حیسابانەی کراون کە بۆ قۆناغی یەکەمی ئەستێرەیەکی لە جۆری خۆر بەردەوامییەکی زەمەنی کە ١٠ ملیار ساڵە دەخەملێنی. دوای ئەم قۆناغە هەروەك بۆ ئەستێرەکانی تری هەمان جۆر تێبینی کراوە، ماوەیی دووەم دێت کە بە تەواوبوونی گۆڕانی هایدرۆجین بۆ هیلیۆم دەناسرێتەوە و ئاکامی ئەم گۆڕانەش بریتی دەبێت لە داکشان و لێککشانی چینە دەرەکییەکان و ساردبوونەوەی خۆر. لە قۆناغی کۆتاییشدا ڕووناکایی خۆر زۆر بەتوندی کەم دەبێتەوە و هەروەها چڕییەکەی زۆر بەتوندی بەرز دەبێتەوە: ئەوەیە کە لەو جۆرە ئەستێرانەی پێیان دەگوترێ(کورتەبنە سپییەکان) تێبینی دەکرێ.

لە هەموو ئەمانە ئەوەی پێویستە ئاوڕی لێ بدەینەوە مێژووەکان نین چونکە گرینگییەکی ئەوتۆی نییە تەنها لەو ڕووەوە نەبێ کە هەڵسەنگاندنێکی نزیکەیی بۆ فاکتەری زەمەن دەدات بە دەستەوە، ئەوەی لە بنەڕەتدا ڕوون دەبێتەوە بیرۆکەی پەرەسەندنە. پێدراوە نوێیەکان ڕێ دەدات بە پێشبینی کردن بەوەی کە دوای چەند ملیار ساڵێکی تر سیستمی خۆر وەکو ئەوەی ئێستا نامێنێتەوە. هەروەك بۆ ئەستێرەکانی تریش ڕوویداوە و گۆڕانکارییەکانیان تا کۆتا قۆناغ تۆمار کراوە دەشێ کۆتایی خۆریش پێشبینی بکرێ.

ئایەتی (٣٦ی سورەتی یس) کە پێشتر ئاماژەمان پێدا باسی خۆر دەکات کە بەرەو شوێنێکی تایبەت بەڕێوەیە (لمستقر لها)..

گەردووناسیی نوێ بە شێوەیەکی تەواو ئەم شوێنە دیاری دەکات، بەڵکو ناوی (ماڵی خۆر) Apex Solaire.. لە واقیعدا سیستمی خۆر لە بۆشایی ئاسماندا

بەرەو خاڵێك لە خولگەی (هرقل)ی هاوسێی ئەستێرەی ڤیجا کە بەتەواوی ڕایەڵەکەی دیاریکراوە، دەجووڵێ، توانراوە خێراییی ئەم جووڵەیە دیاری بکرێ کە بە نزیکەیی ١٩ کیلۆمەتر لە چرکەیەکە..

پێویست بوو باسی ئەم پێدراوانەی گەردووونناسی بکەین، ئەوەش بە بۆنەی تەفسیرکردنی ئەو دوو ئایەتەی قورئان کە دەتوانین بڵێین لەگەڵ پێدراوە زانستییە نوێیەکان تەواو هاوڕێك و تەبان.

## فراوانبوونی بوونەوەر

فراوانبوونی بوونەوەر مەزنترین دیاردەیە کە زانستی نوێ دۆزیتییەوە. ئەو چەمکە ئەمڕۆ بەتەواوی ساغ بۆتەوە و مشتومڕەکان تەنها لەبارەی ئەو نموونەیە کە ئەم فراوانبوونەی پێ دەکرێ.

ئەگەر ئەوە ڕێژەییی گشتی بێت ئاماژەی پێدا بێت، ئەوا فراوانبوونی بوونەوەر پشت بە پێدراوە ماددییەکان دەبەستێ، ئەوەش لەمیانەی لێکۆڵینەوەی شەبەنگی کاکێشانەکان، گواستنەوەی مەنهەجییانە بەرەو ڕەنگی سووری شەبەنگ پاساوێکی هەیە لە خۆلادانی کاکێشانەکان لە یەکتر.

بەم پێیە بوونەوەر لە درێژبوونەوە و گەورەبوون ناوەستێ و ئەم فراوانبوونەش گرینگییەکی تایبەتی خۆی هەیە و کاکێشانەکان بەردەوام لێمان دوور دەکەونەوە.

ئایا دەتوانین ئەم ئایەتە لەگەڵ چەمکە نوێیەکان بەراورد بکەین؟

ئایەتی ٤٧ی سورەتی (الذاریات):

﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ (٤٧)﴾

مەبەست لە ئاسمان بە دیاریکراوی بوونەوەری دەرەوەی زەوی نییە؟ (و موسعون) (اسم فاعل)ی (فعل)ی (أوسع)ە کە واتای فراوانکردن و پانوپۆڕکردنی شتێك دێت.

هەندێ لە ڕاڤەکاران کە نەیانتوانیوە لە وشەی کۆتایی تێ بگەن هاتوون واتای هەڵەیان داوەتێ. هەندێ نووسەری تر هەست بە واتاکەی دەکەن بێ ئەوەی بوێریی ئەوەیان هەبێ بیڵێن.هەندێکی تر ڕای زانایان دێننەوە و هەمان ئەو لێکدانەوەیە دەخەنە ڕوو کە ئێمە کردمان.

## داگیرکردنی ئاسمان:

لەم تێڕوانینەوە سێ ئایەتی قورئان هەیە کە شیاوی ئاوڕلێدانەوەیە. یەکێکیان بە شێوەیەکی بێ پێچوپەنا باس لەوە دەکات کە دەبێ لەم مەیدانەدا چی ئەنجام بدات و بە کردەوەش چی ئەنجام دەدەن. لە دوو ئایەتەکەی تریشدا خودا نموونەیەك بۆ بێباوەڕەکانی مەککە دێنێتەوە و پێیان دەڵێ: ئەگەر بتوانن بەرەو ئاسمان بەرز ببنەوە چەندە سەرسام دەبن؟! !بەوەش ئاماژە بە گریمانەیەك دەکات کە نایەتەدی.

ئایەتی یەکەم، ئایەتی ٣٣ی سورەتی (الرحمان)ە:

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانْفُذُوا لَا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ (٣٣)﴾

تەفسیرکردنی ئەم ئایەتە هەندێ وردەکاری دەوێ:

أ- زمانی عەرەبی لە زمانەکانی تر بە شێوەیەکی زیاتر دەتوانێ (دۆخ - ظرف) ڕوونتر و ڕاشکاوانەتر جیا بکاتەوە. لێرەدا پیتێك هەیە بۆ گوزارشتکردن لە (ئەگەر) کە بریتییە لە (اذا) و پیتێکی تر هەیە بۆ تەعبیرکردن لە گریمانەیەکی ڕەوا(فرض جائز) کە بریتییە لە (إن)، پیتێکی تر هەیە بۆ تەعبیرکردن لە نەبوون(امتناع) کە پیتی (لو)ە. ئەو ئایەتەی بە پیتی (إن) تەعبیری لێ کراوە دان دەنێ بە گریمانەیەکی ڕەوا (فرض جائز). کەواتە قورئان باس لە ئەگەرێکی ماددی بۆ جێبەجێبوونی شتێکی بەرجەستە دەکات. ئەم ناسینەوە و جیاوازییەی زمانەوانییە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە ئەو تەفسیرە سۆفیگەرییە ڕووتە وەلا دەنێ کە هەندێك دەیانەویست بە هەڵە بەسەر ئەم ئایەتەیدا بسەپێنن.

ب- خودا قسە بۆ جنۆکە و مرۆڤ دەکات، لەم گوزارشتەدا هیچ خوازەیەکی ڕەمزی نییە.

ج- (نفذ من))، هەروەکو فەرهەنگی کازمیرسکی دەڵێ، واتای ئەوەیە: لە لایەکەوە پەڕیەوە بۆ لایەکی تر و لە لایەکی تری تەنێکەوە دەرچوو(بۆ نموونە: بە تیرێکیش دەگوترێ کە لە لای پێچەوانەوە دەرچوو بێت).

کەواتە ئایەتەکە ئاماژە بە چوونە ژوورەوەی قووڵ و دەرچوون لە لایەکی پێچەوانەی ناوچە مەبەستدارەکان دەکات.

د- ئەو دەسەڵاتەی کە لە بەدیهێنانی ئەم پرۆژەیەدا مرۆڤ دەیبێت وا دەردەکەوێ دەسەڵاتێکە لە خودای بەتواناوە دێت.

هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ توانای مرۆڤ دەکات لەوەی ڕۆژێك دادێت کە ئەوە بەدی بێنێ کە ئەمڕۆ ئێمە ناوی لێ دەنێین داگیرکردنی ئاسمان. پێویستە تێبینی ئەوەش بکەین کە کە دەقە قورئانییەکە هەر تەنێ پێشبینی چوون بۆ ناوچەکانی ئاسمانەکان ناکات بەڵکو باس لە چوون بۆ ناوچەکانی زەویش دەکات کە مەبەست لێی کەشفکردنی قوڵاییەکانە.

٢- دوو ئایەتەکەی تر، ئایەتەکانی ١٤و١٥ی سورەتی (الحجر)ن: لەوێ خودا قسە بۆ بێباوەڕەکانی مەککە دەکات و دەڵێ:

﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَابًا مِنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ (١٤) لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَسْحُورُونَ (١٥)﴾

ئەوە گوزارشتکردنە لە واقوڕمانێك لە بەرانبەر دیمەنێکی چاوەڕواننەکراو کە جیاوازە لەوە کە مرۆڤ دەیتوانی خەیاڵی بکات.

تەعبیرکردن بە پیتی (لو) کە دەچێتە سەر گریمانەیەك، بۆ ئەوانەی ئایەتەکە مەبەستیەتی هیچ دەسکەوت و کارێکی بەدوادا نایەت.

بەم پێیە و ئەوەی پەیوەستە بە داگیرکردنی ئاسمان ئەوا ئێمە خۆمان لە بەرامبەر دوو برگەی قورئان دەبینینەوە کە یەکێکیان ئاماژە بەو دەسکەوتانە دەکات کە ڕۆژێك دادێ بێنەدی ئەویش بە هۆی ئەو دەسەڵاتانەی خودا بە زیرەکی

و بلیمەتیی مرۆڤایەتی دەبەخشێ. لە کاتێکدا برگەی دووەم هێما بۆ ڕووداوێك دەکات بێباوەڕانی مەککە نایبینن، لێرەوەیە نیشانەی ئەم گریمانەیەی کە نایەتەدی. بەڵام لێرەدا کەسانی تر هەن ئەم ڕووداوە دەبینن هەروەکو ئایەتی یەکەم ئەم گریمانەیە دەخاتە بەر چاو. ئەو ئایەتە وەسفی کاردانەوەی مرۆڤ دەکات لە بەرانبەر دیمەنێکی چاوەڕێنەکراو کە گەشتیارانی بۆشایی ئاسمان تووشی دەبن: ڕوانینی پەشۆکانە و هەستکردن بە جادوولێکردن.

کەشتیەوانانی ئاسمان لە ساڵی ١٩٦١ بەتەواوی لەو سەرکێشییە یاسابەدەرە ژیان، ئەو مێژووە یەکەم فرینی مرۆڤ بوو بە دەوری زەویدا. لە ڕاستیدا ئاشکرایە کە کاتێ ئێمە لە دەرەوەی بەرگە هەوای دەوری زەوی دەبین، ئاسمان هەرگیز بە وێنە لازوردییەکەی کە خەڵکی سەر زەوی دەیبینن دەرناکەوێ، ئەوەش لە ئەنجامی مژینی تیشکی هەتاو لە لایەن بەرگە هەواکان و دروستبوونی چەند دیاردەیەك. ئەو مرۆڤەی لە بۆشایی ئاسماندایە و لە بەرگە هەوای دەوری زەوی دوورترە ئاسمان بە ڕەشی دەبینێ و زەوی وەها بۆ دەردەکەوێ کە خەرمانەیەکی ڕەنگینی شین دەوری داوە، ئەوەش لەبەر هەمان هۆی دیاردەکانی مژینی ڕووناکی لەلایەن بەرگە هەوای زەوییەوە، لە کاتێکدا مانگ کە هیچ هەوایەك دەوری نەداوە لە ڕەنگە تایبەتەکانیدا بە باکگراوندێکی ڕەش لە ئاسمانەوە دەردەکەوێ. کەواتە ئەوە دیمەنێکی تەواو نوێیە کە مرۆڤ لە ئاسمانەوە دەیبینێ، دیمەنێك بە لای خەڵکی ئەم سەردەمەوە بۆتە وێنەیەکی کلاسیکی.

ئیتر لێرەوەیە، کاتێ دەقی قورئان لەگەڵ پێدراوە نوێیەکان پێك دەگرین، چۆن سەرسام نەبین بەو دیاریکردنە وردانە کە ناکرێ گریمانەی ئەوە بکەین کە لە بیری مرۆڤێکەوە دەرچوون کە نزیکەی چواردە سەدە لەمەوبەرەوە ژیاوە؟

## زەوی

ئەو ئایەتانەی لەبارەی زەوییەوە دەدوێن بە هەموو قورئاندا پەرش و بڵاون، بە چەشنی بابەتەکانی تر کە لە پێشوودا باسمان کردن. ڕیزکردنیان سەختە، ئەو پۆلێنکردنەی لێرەدا دەیخەینە ڕوو تەواو شەخسییە.

بۆ ئەوەی خستنەڕووەکە ڕوون بێت، دەکرێ سەرەتا ژمارەیەك لەو ئایەتانە دەربێنین کە زۆربەی جار باسی بابەتگەلێکی فرە دەکات و لە سەرووی هەموو شتێکەوە ئامانجێکی گشتی هەیە، بانگهێشتی مرۆڤ دەکات لە جوان دروستکردنەکانی خودا ورد بێتەوە و ئەوەش لە میانەی نموونە پێشکەشکراوەکان.

چەند کۆمەڵە ئایەتێکی تر هەن دەکرێ جیابکرێنەوە، ئەوان باسی بابەتی تایبەتتر دەکەن:

- سوڕی دەریا و ئاو.
- بەرزی و نزمییەکانی زەوی.
- بەرگە هەوای دەوری زەوی.

### ( أ ) ئەو ئایەتانەی ئامانجی گشتییان هەیە:

لە کاتێکدا ئەم ئایەتانە ژمارەیەك بەڵگە دەخەنە ڕوو کە ببێتە هۆی ئەوەی خەڵك لە چاکەی خودا بەسەر مرۆڤەکانەوە ورد ببنەوە، لە هەمان دەم، لێرە و لەوێ، چەند بانگەشەیەکی تێدایە کە گرینگە لەگەڵ پێدراوەکانی زانست

پێکبگیرێن. لەم تێڕوانینەوە لەوانەیە ئەم ئایەتانە گرینگییان زیاتر هەبێ چونکە گوزارشت ناکات لە هەموو جۆرە باوەڕێکی تایبەت بە هەندێ دیاردەی سروشتی کە لە سەردەمی دابەزینی قورئان لەلایەن خەڵکەوە پشتیوانی لێ دەکرا. ئەوانە باوەڕگەلێکی جۆراوجۆر بوون کە دواتر زانیاریی زانستی ناڕاستییانی سەلماند. ئەم ئایەتانە لە لایەك تەعبیر لە بیرۆکەگەلێکی سادە دەکەن کە تێگەیشتنی ئاسان بێت بۆ ئەوانەی قورئان قسەی لەگەڵ دەکردن کە خەڵکی ناوچەیەکی جوگرافیی دیاریکراو (مەککە و مەدینە و دەشتەکییەکانی نیوە دورگەی عەرەب) بوون، لە لایەکی ترەوە گوزارشت لە هەندێ تێڕامانی گشتی دەکات کە خەڵکی ڕۆشنبیری هەموو شوێن و سەردەمێك دەتوانێ زانیاری لێ وەربگرێ ئەگەر ڕەنجی تێڕامان و وردبوونەوە بکێشێ، ئەوەش نیشانەی گەردوونییانەی هەمەلایەنی قورئانە.

لەبەرئەوەی لە قورئان هیچ ڕیزبەندییەکی دیار بۆ ئەم ئایەتانە نییە بۆیە لێرە بەپێی ڕیزبەندیی سورەتەکان دەیانخەینە ڕوو.

ئایەتی ٢٢ی سورەتی (البقرة):

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (٢١) الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٢)﴾

ئایەتی ١٦٤ی سورەتی (البقرة):

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا

وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (١٦٤)﴾

ئایەتی ٣ی سوڕەتی (الرعد):

﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ(٣)﴾

ئایەتی ١٩ — ٢١ ی سوڕەتی (الحجر):

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ (١٩) وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ وَمَنْ لَسْتُمْ لَهُ بِرَازِقِينَ (٢٠) وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ (٢١)﴾

ئایەتی ٥٣و٥٤ی سوڕەتی (طه):

﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى (٥٣) كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَى (٥٤)﴾

ئایەتی ٦١ی سوڕەتی سوڕەتی (النمل):

﴿أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ(٦١)﴾

ئەوەی لێرەدا ئاماژەی بۆ کراوە ئەو سەقامگیرییە گشتییەیە کە بۆتە مۆرکی توێکڵی زەوی. زانراوە کە توێکڵی ڕواڵەتی زەوی لە سەردەمە بەراییەکان بەر لەوەی سارد ببێتەوە جێگیر نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا سەقامگیریی توێکڵی زەوی

ڕەها نییە چونکە هەندێ ناوچە هەن بە شێوەی پچڕپچڕ زەویلەرزەی لێ ڕوودەدات. سەبارەت بەو بەربەستەی تایبەتە بە دوو دەریاکە ئەوا ئەوە وێنەیەکە بۆ ڕوونکردنەوەی تێکەڵ نەبوونی ئاوی ڕووبارەکان لەگەڵ ئاوی دەریاکان لە هەندێ گەورە ڕێژگەی ڕووبارەکان هەروەکو دواتر دەبینین.

ئایەتی ١٥ی سورەتی (الملك):

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ (١٥)﴾

ئایەتی ٣٠ — ٣٣ی سورەتی (النازعات):

﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا (٣٠) أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا (٣١) وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا (٣٢) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٣)﴾

لە زۆرێك لەم ئایەتانە جەختکردنەوەیەك دەبینین لەسەر گرینگیی ئاو و ئاکامی زانستییانەی بوونی لەسەر خۆڵی زەوی واتە بەپیتیی زەوی. بێگومان ئاو لە وڵاتە بیابانییەکان توخمی یەکەمە بۆ مانەوەی مرۆڤ. بەڵام باسکردنی قورئان بۆ ئەمە ئەم خاسییەتە جوگرافییە تێدەپەڕێنێ. ئایەتەکە سیفەتی دەوڵەمەندیی هەسارەکە بە ئاو زەق دەکاتەوە، بەپێی سەلمێنراوترین پێدراوە زانستییە نوێیەکان ئەو سیفەتە لە سیستمی خۆردا تاقانەیە. ئەگەر ئاو نەبووایە زەوی وەکو مانگ هەسارەیەکی مردوو دەبوو. قورئان لە باسکردنی دیاردە سروشتییەکانی زەوی، گرینگایەتیی یەکەم دەداتە ئاو. سوڕی ئاو بە وردییەکی تۆکمە وەسف کراوە.

## ( ب ) سوڕی ئاو و دەریاکان

لەم سەردەمەدا، کاتێ جار دوای جار ئەو ئایەتانەی قورئان دەخوێنینەوە کە تایبەتن بە ڕۆڵی ئاو لە ژیانی مرۆڤ ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە گوزارشت لە بیرۆکەی تەواو ڕوون دەکات. هۆکاری ئەوەش سادەیە: لەم سەردەمەدا هەموومان — کەم و زۆر — دەزانین سوڕی ئاو لە سروشتدا چۆن ڕوودەدات.

ئەگەر لەبارەی ئەم بابەتەوە هەموو ئەو تێگەیشتنە کۆنانە بێنینە بەرچاومان ئەوا دەرك بەوە دەکەین کە پێدراوە قورئانییەکان هیچ توخمێکی وەهای تێدا نییە کە هەڵقوڵاوی ئەو تێگەیشتنە ئەفسانەییانە بێت کە لەو سەردەمەدا باو بووە و بیرکردنەوەی تیۆری ڕۆڵی زیاتر بووە لە پێدراوەکانی تێبینیکردن و سەرنجدان. ئەگەر خەڵك لە ڕێی ئەزموونەوە و لە ئاستێکی دیاریکراو بۆ باشکردنی ئاودێریی زەوییەکان لە بەدەسهێنانی زانیاریی عەمەلی سوودبەخش سەرکەوتوو بووبن، ئەوا بە پێچەوانەوە تێگەیشتنیان لەبارەی سوڕی ئاوەوە بە گشتی لەم سەردەمەی ئێستادا پەسندکراو نییە.

دەکرا خەیاڵی ئەوە بکرێ کە ئاوی ژێرزەوی لە دزەکردنی ئاوی بارانەوە بۆ نێو زەوی پەیدا دەبێ، بەڵام ئەوە ڕووی نەدا و جیا لەمە لەو سەردەمە کۆنانەدا تێگەیشتنی پیاوێکە ناوی (ڤیترۆڤ — Vitruve)ە، لە سەدەی یەکەمی پێش زایین لە ڕۆما پشتیوانی لەم بیرۆکەیە کرد. لەم کاتەوە بەدرێژایی چەندان سەدە بە سەردەمی دابەزینی قورئانیشەوە خەڵك لەبارەی ڕۆیشتن و سوڕی ئاو لە سروشتدا تێگەیشتنی هەڵەیان هەبوو.

لە وتاری هیدرۆجیۆلۆجیا لە ئینسکلۆپیدیای یونیڤەرسالیس، (ج.کاستانی) و (ب.بلاڤو) کە دوو نووسەری پسپۆڕی ئەم پرسانەن، لەبارەی ئەم پرسەوە کورتەیەکی مێژوویی دەخەنە ڕوو:

لە لای (تالیس دی میلات) لە سەدەی حەوتەمی پێش زایین تیۆرەکە بریتی بوو لەو هورژومی ئاو لە ئۆقیانووسەکانەوە بە کاریگەریی باوە بۆ ناو کیشوەرەکان پاشان کەوتنی بۆ سەر زەوی دواتر چوونی بۆ ناو خاك. ئەفلاتوونیش باوەڕی بەم فکرانە هەبوو و پێی وابوو کە گەڕانەوەی ئاو بۆ ئۆقیانووسەکان لە ڕێی کەلێنێکی قوڵەوە دەبێت کە ناوی(تاتار)ە.

ئەم تیۆرە تا سەدەی هەژدە شوێنکەوتەی زۆری هەبوو لەنێویشیاندا دیکارت. بەڵام ئەرستۆ وای گریمانە دەکرد کە هەڵمی ئاوی خاك لە بۆشاییە ساردەکانی چیاکان چڕدەبێتەوە و لەژێر زەویدا دەریاچەگەلێك دروست دەبن کە ئاوی کانیاوەکان دابین دەکات. سینیکا (سەدەی یەکەمی زایین) پشتیوانی لەم ڕایەی کرد و تاوەکو ساڵی ١٨٧٧ ئەم باوەڕە شوێنکەوتەی زۆری هەبوو لەوان(ئۆ.ڤۆلگەر). یەکەم تێگەیشتنی دروست لەبارەی سوڕی ئاوەوە دەگەڕێتەوە بۆ بێرنارد پالیسی لە ساڵی ١٥٨٠ کە جەختی لەوە کردەوە ئاوی ژێرزەوی لە دزەکردنی ئاوی باران بۆ نێو خاك پەیدا دەبێ. (ئی.ماریۆت) و (پ.پیرۆت)لە سەدەی حەڤدە پشتیوانییان لەم ڕایە کرد.

بەڵام ئێمە زایەڵەی تێگەیشتنە ناڕاستە باوەکانی سەردەمی محەممەد(درودی خوای لێ بێت) لە هیچ شوێنێکی دەستەواژەکانی قورئاندا نابینین..

ئایەتی ٩ — ١١ ی سورەتی (ق):

﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكًا فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ (٩) وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ (١٠) رِزْقًا لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا كَذَلِكَ الْخُرُوجُ (١١)﴾

ئایەتی ١٨و١٩ی سورەتی (المؤمنون):

﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَى ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ (١٨) فَأَنْشَأْنَا لَكُمْ بِهِ جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ (١٩)﴾

ئایەتی ٢٢ی سورەتی(الحجر):

﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنْتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ (٢٢)﴾

بە نیسبەت ئەم ئایەتەی دواییەوە دوو ئەگەر بۆ تەفسیرکردن هەیە: دەکرێ با بە پیتێنەری ڕووەکەکان بە هۆی گواستنەوەی هەلآلە(لقاح)ەوە دابنرێ، بەلآم دەشکرێ مەبەست لێی وێنەیەکی تەعبیرانە بێت کە باسی ڕۆلی ئەو بایە دەکات کە وا لە هەورێك دەکات باران نەبارێنێ:

ئایەتی ٩ی سورەتی (فاطر):

﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ (٩)﴾

تێبینی دەکرێ کە لە بەشی یەکەمی ئایەتەکە شێوازەکە بریتییە لە شێوازی چیرۆك و دواتر بۆ پێشەکی لێدوانێکی خودا دێت. ئەم دەسکارییە لەناکاوانە لە شێوە گوتار لە قورئان زۆر دووبارە دەبێتەوە.

ئایەتی ٤٨ی سورەتی (الروم):

﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ (٤٨)﴾

ئایەتی ٧ی سورەتی (الاعراف):

﴿وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَنْزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَى لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (٥٧)﴾

ئایەتی ٤٨و٤٩ی سورەتی(الفرقان):

﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا (٤٨) لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا(٤٩)﴾

ئایەتی ٥ی سورەتی (الجاثية):

﴿وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ رِزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (٥)﴾

مەبەست لەو (رزق)ەی لەم ئایەتەی دواییدا هاتووە ئەو ئاوەیە کە لە ئاسمان دێتە خوارەوە. پاشان ڕیتمی ئایەتەکە جەخت لە گۆڕانی با دەکاتەوە کە سیستمی بارانبارین دەگۆڕێ.

ئایەتی ١٧ی سورەتی (الرعد):

﴿أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا﴾

ئایەتی ٣٠ی سورەتی(الملك):

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْرًا فَمَنْ يَأْتِيكُمْ بِمَاءٍ مَعِينٍ (٣٠)﴾

ئایەتی ٢١ی سورەتی (الزمر):

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَامًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ (٢١)﴾

ئایەتی ٣٤ی سورەتی (يس):

﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ (٣٤)﴾

سێ ئایەتەکەی دوایی جەخت لە گرینگایەتیی کانیاوەکان و تێراوکردنیان بە ئاوی باران دەکاتەوە. ئەو بابەتە پێویستی بە لەسەر وەستانێك هەیە بۆ ئەوەی باسی زاڵبوونی هەندێ تێگەیشتن بکەین لە سەردەکانی ناوەڕاست وەکو تێگەیشتنی ئەرستۆ کە پێی وابوو کانیاوەکان لە لایەن دەریاچەکانی ژێرزەوییەوە تێراو دەکرێن. (ر.ڕامینیراس) مامۆستا لە قوتابخانەی نیشتیمانی بۆ ئەندازیاریی کشتوکاڵی و ئاو و دارستانەکان لە وتاری (هیدرۆلۆجیا) لە ئینسکلۆپیدیای

یونیڤێرسالدا وەسفی قۆناغە سەرەکییەکانی زانستی ئاو (ئاوزانی) دەکات و بەڵگە بە ئاودێریی ئاوازەی کۆن دەهێنێتەوە بەتایبەتی ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین ئەنجام دراوە، ئەو تێبینی کردووە کە زانیاریی کردەیی لە هەموو ئەم دەسکەوتانە بوونی هەبووە، لە کاتێکدا بیرۆکەکان لە تێگەیشتنی هەڵەوە هاتبوون. دانەر دەڵێ: ((دەبێ تاوەکو سەردەمی ڕێینسانس چاوەڕێ بکەین(لە نێوان سالانی ١٤٠٠ تاوەکو ١٦٠٠ تاوەکو تێگەیشتنە پەتییە فەلسەفییەکان شوێنیان بۆ ئەو لێکۆڵینەوانە چۆڵ کرد کە بۆ دیاردە هیدرۆلۆجییەکان پشتیان بە تێبینی و سەرنجدانی بابەتییانە دەبەست. لیۆناردۆ داڤنشی(١٤٥٢ — ١٥١٩) دژ بە بانگەشەکانی ئەرستۆ یاخی بوو. بێرنارد پالیسی لە لێکۆڵینەوەیەکیدا بە ناوونیشانی (وتارێك لەبارەی جوانیی سروشتی ئاو و کانیاوە سروشتیی و دەسکردەکان) لێکدانەوەیەکی دروست سەبارەت بە ڕۆڵی ئاو بەتایبەتی لە تێراوکردنی کانییەکان بە هۆی بارانەوە، دەخاتەڕوو)).

ئایا بە دیاریکراوی ئەمە ئەو ئاماژەیە نییە کە لە ئایەتی ٢١ی سورەتی (الزمر)دا دەیبینین کە باس لە ئاراستەی ئاوی باران بەرەو کانیاوەکانی زەوی دەکات.

باران و تەزرە دوو بابەتی ئایەتی ٤٣ی سورەتی (النور)ن:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَنْ مَنْ يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ (٤٣)﴾

ئەم دەستەواژەیەش شیاوی قسە لەسەر کردنە(ئایەتی ٦٨ — ٧٠)ی سورەتی (الواقعه):

﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ (٦٨) أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ (٦٩)لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ (٧٠)﴾

بەڵگەهێنانەوە بەوەی کە خودا دەتوانێ ئاوێکی سازگار بکاتە سوێراو شێوازێکە بۆ گوزارشتکردن لە توانای خودا. شێوازێکی تر بۆ تەعبیرکردن لە هەمان ئەو توانایە: تەحەددا کردنی مرۆڤە بتوانێ ئاو لە هەورەوە بێنێتە خوارەوە. بەڵام ئەگەر شێوازی یەکەم تەنها قسەیەکی بەڵگەنەویست بێت، ئایا دووەمیش لە سەردەمی نوێ هەروا نابێت بە جۆرێك کە تەکنەلۆژیا توانیویەتی بارانی دەسکرد ببارێنێ..؟ ئایا دەکرێ بە توانای مرۆڤ بۆ بەرهەمهێنانی باران بەرهەڵستی وتەی قورئان بکەین..؟

مەسەلەکە ئەوها نییە، دەبێ سنووری تواناکانی مرۆڤ لەو مەیدانەدا لەبەرچاو بگرین. (م.ئە.فاسی M.A.Facy) ئەندازیاری گشتیی کەشناسیی نیشتیمانی، لە وتارێکدا بە ناوونیشانی (بارانەکان) لە ئینسکلۆپیدیای یونیڤێرسال نووسیویەتی: هەرگیز ناکرێ باران لە هەورێك ببارێنرێت کە سیفەتەکانی هەوری شیاوی بارینی تێدا نەبێت یان لە هەورێك نەگەیشتبێتە ئاستێکی گونجاوی پێگەیشتن. کەواتە مرۆڤ تەنها بە یارمەتیی هۆکارە تەکنیکییە گونجاوەکان دەتوانێ پرۆسەی باراندن زووتر بکات بەو مەرجەی پێشتر دۆخی سروشتی بۆ ئەوە ئامادە بێت. ئەگەر مەسەلەکە ئەوها نەبێ ئەوا وشکەساڵی نەدەبوو، ئەمەش ڕوونادات. هەروەکو ڕوونیشە کۆنترۆڵکردنی باران و کەشوهەوای خۆش تا ئەمڕۆش هێشتا هەر خەونە.

مرۆڤ ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی سوڕی نەگۆڕی جوولەی ئاو لە سروشتدا بپچڕێنێ، بە پێی ڕێنماییەکانی هیدرۆلۆجیای نوێ دەکرێ ئەم سوڕە بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:

تیشکی گەرمی هەتاو لە ئاوی ئۆقیانووسەکان و هەموو شتێکی تەڕ هەڵم دروست دەکات. هەڵمی ئاو بەم شێوەیە بەرەو هەوا بەرز دەبێتەوە و لە ڕێی چڕبوونەوەیەوە هەور چێ دەکات. ئەو کاتە با دێت تاوەکو ڕۆڵی خۆی لە گواستنەوەی هەورەکان بۆ شوێنی جیاجیا بگێڕێ. لەوانەیە هەور بێ ئەوەی باران ببارێنێ نەمێنێ. هەروەها دەکرێ بارستە هەور لەگەڵ بارستەی تر یەکبگرن بەوەش هەوری چڕتر دروست ببێ، یان بەش بەش دەبن بۆ ئەوەی لە قۆناغێکی پێگەیشتنی باران ببارێنێ. سوڕەکە بە گەیشتنی بارانەکە بۆ دەریاکان(کە لە ٧٠٪ی ڕووی زەوی پێکدێنن) تەواو دەبێ.

بەڵام ئەو بارانەی دەگاتە زەوی بەشێکی بە هۆی ڕووەکەکانەوە دەمژێت، بەوەش بەشدار دەبێت لە گەشەکردنی ڕووەکەکە و ئەمیش بەهۆی دەڵاندنەوە بەشێك لە ئاوەکە دەداتە هەوا. بەشەکەی تریش بە بڕێکی کەم یان زۆر دەچێتە نێو خاکەوە تاوەکو لە ڕێی ڕێڕەوەکانی ئاوەوە بەرەو ئۆقیانووسەکان بڕوات یان دەچێتە نێو خاکەوە تاوەکو لە ڕێی کانیاوەکانەوە بێتەوە سەر زەوی.

با پێدراوەکانی زانستی هیدرۆلۆجیای نوێ بەراورد بکەین بەوەی لە زۆرێك لەو ئایەتە قورئانییانەی کە لەم برگەیەدا باسکران دەبینین، ئەو کات تێبینی بوونی سازانێکی ناوازە لەنێوان هەردووکدا دەکەین.

## دەریاكان

ئەگەر ئایەتە قورئانییەكان لەبارەی سوڕی ئاو لە سروشت بە گشتی بەم شێوەیە كەرەستەیەك بۆ بەراوردكردن لەگەڵ زانیارییە نوێیەكان دەدات بە دەستەوە ئەوا مەسەلەكە سەبارەت بە دەریاكان وەها نییە. لێرەدا هیچ ڕستەیەكی قورئانی نییە كە پەیوەست بێت بە دەریاكان و شیاوی بەراوردكردن بێت لەگەڵ پێدراوە زانستییەكان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە لە زەرورەتی تەئكیدكردنەوە لەوە كەم ناكاتەوە كە لە قورئاندا ڕستەیەك لەبارەی دەریاكانەوە نییە كە باوەڕ یان ئەفسانە یان خورافەیەكی باوی ئەو سەردەمی تێدا بێت.

لێرەدا ژمارەیەك ئایەت هەن كە پەیوەستن بە ئۆقیانووسەكان و كەشتیەوانی و چەند نیشانەیەك بۆ تێڕامان لە توانای خودا دەخاتەڕوو:

ئایەتی ٣٢ی سوڕەتی (إبراهیم):

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ﴾

ئایەتی ١٤ی سوڕەتی(النحل):

﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٤)﴾

ئایەتی ٣١ی سوڕەتی (لقمان):

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ لِيُرِيَكُمْ مِنْ آيَاتِهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ (٣١)﴾

ئایەتی ٢٤ی سورەتی (الرحمن):

﴿وَلَهُ الْجَوَارِ الْمُنْشَآتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ (٢٤)﴾

ئایەتی ٤١ — ٤٤ی سورەتی (یس):

﴿وَآيَةٌ لَهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ (٤١) وَخَلَقْنَا لَهُمْ مِنْ مِثْلِهِ مَا يَرْكَبُونَ (٤٢) وَإِنْ نَشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنْقَذُونَ (٤٣) إِلَّا رَحْمَةً مِنَّا وَمَتَاعًا إِلَى حِينٍ (٤٤)﴾

ڕوون و ئاشکرایە کە مەبەست لێرە ئەو کەشتیەیە کە خەڵك لە دەریا هەڵدەگرێ هەروەکو پێشتر نوح و سەرنشینەکانی هەڵگرت و گەیاندنیە وشکانی.

لێرەدا مەسەلەیەکی تر هەیە بۆ تێبینیکردن کە تایبەتە بە دەریا و دەکرێ لە هەموو ئەو ئایەتانەی قورئان جیا بکرێتەوە کە تایبەتە بەم بابەتە، ئەوەش لەبەرئەوەی سیفەتێکی تایبەتی هەیە. لێرەدا سێ ئایەت هەیە کە ئاماژە بۆ هەندێ سیفەتی ڕووبارە گەورەکان دەکات کاتێ دەڕژێنە ئۆقیانووسەکانەوە.

ئەو دیاردەیە بە تەواوی زانراوە کە زۆر جار دەبینرێ ئاوی سوێری دەریاکان دەمودەست لەگەڵ ئاوی شیرینی ڕووبارە گەورەکان تێکەڵ نابن. هەندێك وا دەبینن کە بۆیە قورئان ئاماژەی بۆ دەکات چونکە پەیوەندی هەیە بە ڕێژگەی هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات کە بە یەککگرتنیان دەریایەك دروست دەکەن کە درێژاییەکەی ١٥٠ کیلۆمەترە و پێی دەوترێ(شط العرب)، لە کەنداویش بە هۆی کاریگەریی هەڵکشانەوە دیاردەیەکی جوان دروست دەبێ کە بریتییە لە کشانەوەی ئاو بۆ ناو زەوی و ئەوەش دەبێتە هۆی ئاودێرییەکی باش. بۆ ئەوەی باش لە دەقەکە تێ بگەیت دەبێ ئەوە بزانیت کە وشەی (بحر — دەریا) واتای

برِێکی زۆر لە ئاو دەگەیەنێ، ئەوەش ئۆقیانووسەکان و ڕووبارە گەورەکانی وەکو نیل و دیجلە و فورات دەگرێتەوە. ئەمەش ئەو ئایەتانەن کە لەبارەی ئەم دیاردەیەوە دەدوێن:

ئایەتی ٥٣ی سورەتی (الفرقان):

﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا(٥٣)﴾

ئایەتی ١٢ی سورەتی (فاطر):

﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِنْ كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾

ئایەتی ١٩ — ٢١ ی سورەتی (الرحمان):

﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٢١) يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ (٢٢)﴾

زێدەباری باسکردنی بابەتە سەرەکییەکە، ئەم ئایەتانە ئاماژە بەو سامانانە دەکەن کە لە ئاوی شیرین و سوێر دەردەهێنرێن، واتە ماسی و خشڵ لە مەرجان و مرواری..بەڵام سەبارەت بە دیاردەی تێکەڵنەبوونی ئاوی ڕووبار بە ئاوی دەریا لە ڕێژگەدا ئەوا پێویستە ئەوە بزانرێ کە ئەمە تایبەت نییە تەنها بە دیجلە و فورات کە دەقەکە باسیان ناکات ئەگەرچی باوەڕ وا بوو کە ئاماژە بۆ ئەوان دەکات..هەندێ ڕێڕەوی ڕووبار کە کۆگایەکی گەورەی ئاویان هەیە وەکو

(میسیسیپی) و ڕووباری(یانگ تسی) ئەم خاسییەتەیان هەیە، هەندێ کات تێکەڵبوونی ئاوەکان تەنها لە پانایی دەریادا تێکەڵ دەبن.

## ( ج ) بەرزی و نزمی زەوی( تۆپۆگرافیا )؛

پێکهاتەی زەوی ئاڵۆزە. بە شێوەیەکی خێرا دەکرێ وەها بیهێنینە بەر چاو کە پێکهاتووە لە چینێکی قووڵ کە پلەی گەرمی زۆر بەرزە، بەشە سەنتەرەکەشی بەردی تێدا دەتوێتەوە، هەروەها چینی دەرەوەشی واتە توێکڵی زەوی سارد و ڕەقە. ئەم توێکڵە زۆر تەنکە، ئەستوورایییەکەی لە چەند کیلۆمەترێکەوە تا ئەوپەڕەکەی دەیان کیلۆمەترێکە، لە کاتێکدا نیوە تیرەی گۆی زەوی کەمێك لە (٦٠٠٠)کم زیاترە، ئەوە واتای ئەوەیە کە تێکڕای توێکڵی زەوی یەك لە سەتی نیوەتیرەی زەوی نابێت. ئەگەر دروست بێت بگوترێ، دیاردە جیۆلۆجییەکان لەسەر ئەم توێکڵە تەنکە ڕوویانداوە. بنچینەی ئەو دیاردانە بریتییە لە بەرز و نزمییەکان کە بنەڕەتی زنجیرە چیاکانە، پێکهاتنیان لە جیۆلۆجیادا پێی دەوترێ Orogenese (واتە پێکهاتنی چیاکان).ئەم پرۆسەیەش گرینگایەتییەکی زۆری هەیە بۆ دەرکەوتنی ئەو هەڵتۆقیوەی کە چیایەکی لێوە پەیدا دەبێ و بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە قووڵایی توێکڵی زەوی ڕۆدەچێ و بنکەی چینی ژێرەوە پتەو دەکات.

مێژووی دابەشبوونی دەریا و زەوی لەسەر ڕووی گۆی زەوی تازەکی زانراوە، ئەگەر هەیە دەرکەوتنی ئۆقیانووسەکان بۆ نیو ملیار ساڵ بگەڕێتەوە. بەڵام کیشوەرەکان یان بەشێك لە کیشوەرەکان کە لە کۆتایی چاخی یەکەم یەك

بارستە بوون دوای ئەوە پەرشوبڵاو بوونەوە بە هۆکاری پرۆسەی دروستبوونی چیاکان لە ناوچە ئۆقیانووسییەکان دەرکەوتووە(بۆ نموونە حاڵەتی کیشوەری باکوری ئەتڵەنتیك و بەشێك لە ئەوروپا).

بە پێی بیری نوێ دەرکەوتنی زنجیرە چیاکان مێژووی پێکهاتنی ئەو زەوییەی دەرکەوتووە پێکدێنێ. هەموو پەرەسەندنێکی زەوی لە چاخی یەکەمەوە بۆ چاخی چوارەم بە پێی قۆناغەکانی دروستبوونی چیاکان پۆلێن دەکرێت، لەم پرۆسەی پەرەسەندنەدا هەندێ بەشی زەوی ون بوون کە پێشتر دەرکەوتبوون و هەندێ بەشی تر دەرکەوتن. لەوەتەی سەدان ملیۆن ساڵەوە دابەشکاریی ناوچە کیشوەری و ئۆقیانووسییەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە: ئێستا ناوچە کیشوەرییەکان تەنها سێ لە دەی گۆی زەوی داگیردەکەن.

بەم جۆرە بە شێوەیەکی ناتەواو و تەواونەکراو ئەو گۆڕانکارییانەی لە سەدان ملیۆن ساڵی ڕابردوو ڕوویانداوە کورت دەبنەوە.

سەبارەت بە تۆپۆگرافیای زەوییەوە قورئان تەنها باس لە دروستبوونی چیاکان دەکات. بۆ ئەو تێڕوانینەی ئێمە مەبەستمانە لە قورئاندا ئایەتگەلێکی زۆر نییە تەنها ئەوانە نەبێ کە باس لە گرینگیدانی خودا بە مرۆڤ دەکات، ئەوەش بە نیسبەت دروستبوونی زەوییەوە:

ئایەتی ١٩و٢٠ی سورەتی (نوح):

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا (١٩) لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا (٢٠)﴾

ئایەتی ٤٨ی سورەتی (الذاريات):

﴿وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ (٤٨)﴾

ئەم ڕایەخە کە ڕاخراوە و پانکراوەتەوە بریتییە لە توێکڵی زەوی کە ڕەق بووە و ئێمەی لەسەر دەژی، بەڵام چینەکانی ژێرەوە زۆر گەرم و شلە و بۆ هیچ جۆرە ژیانێك گونجاو نییە.

ئەو ڕستە قورئانییانە کە تایبەتن بە چیاکان و ئاماژەکردن بە جێگیرییان لە ئاکامی دیاردەکانی بەرزونزمی زۆر گرینگە.

ئایەتی ١٩و٢٠ی سورەتی(الغاشية):

﴿وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩) وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ(٢٠)﴾

ئەم ئایەتانە داوا لە بێباوەڕان دەکات سەرنج بدەنە هەندێ دیاردەی سروشتی.

ئایەتی ٦و٧ی سورەتی (النبأ):

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا(٦) وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا (٧)﴾

ئەو مێخانەی لێرە ئاماژەی بۆ کراوە بریتییە لەوانەی لە چەسپاندنی ڕەشماڵ لە زەویدا بەکاردێ(أوتاد...تاکەکەی(وتد) )واتا: مێخ، سنگ..

زانایانی نوێی جیۆلۆجیا دەڵێن: بەرزونزمییەکانی زەوی بەشە دیارەکانی زەوی کە دوراییان لە کیلۆمەترێك بۆ دەیان کیلۆمەتر دەبێ سەقامگیر دەکات، هەر بە هۆی ئەو بەرزونزمییەوە توێکڵی زەوی جێگیر دەبێ.

لەم بارەوە لە چەند دەستەواژەیەکی قورئان هەندێ تێڕامان لە چیاکان دەخوێنینەوە:

ئایەتی ٣٢ی سورەتی (النازعات):

﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا (٣٢)﴾

ئایەتی ١٠ی سورەتی (لقمان):

﴿وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ﴾

هەمان ڕستە لە ئایەتی ١٥ی سورەتی (النحل) و هەمان بیرۆکە لە ئایەتی ٣١ی سورەتی (الانبیاء) دووپات دەبێتەوە:

﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِهِمْ﴾

ئەم ئایەتانە دەڵێن کە ئەو شێوازەی چیاکان پێ خوڵقێنراوە بۆ چەسپان و جێگیربوون گونجاوە، ئەوەش بە تەواوی لەگەڵ جیۆلۆجیادا ڕێك دەکەوێت.

## ( د ) کەشی زەوی

لەپاڵ هەندێ لایەن کە پەیوەستن بە ئاسمانەوە کە لە بەشی پێشوو باسمان کرد، قورئان چەند دەستەواژەیەکی لەخۆگرتووە کە پەیوەستە بەو دیاردانەی لەناو کەشدا ڕوودەدەن. سەبارەت بە بەراوردکردنیشیان بە پێدراوەکانی زانستی نوێ تێبینی دەکەین کە هیچ ناکۆکییەکی نییە لەگەڵ ئەو زانیارییە نوێیانەی ئەمڕۆ لەبارەی ئەم دیاردانەوە هەمانە.

## بەرزایی

لە ڕاستیدا ئایەتی ١٢٥ی سورەتی(الانعام) گوزارشت لە بیرۆکەیەکی تەواو ئاسایی دەکات لەبارەی ئەو هەناسەتەنگییەی لە شوێنە بەرزەکان هەستی پێ دەکەین و هەر چەند بەرزتر بینەوە زیاتر دەبێت، ئایەتەکە دەڵێ:

﴿فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾

هەندێك بانگەشەی ئەوە دەكەن گوایە بیرۆكەی هەناسە تەنگی لە كن عەرەبەكانی سەردەمی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) زانراو بووە، بەڵام دەردەكەوێ كە بابەتەكە وەها نییە: بوونی بەرزاییی بڵند لە نیوەدورگەی عەرەبی كە لە ٣٥٠٠ مەتر زیاتر بێت وا دەكات بڵێین: نالۆژیكییە كە خەڵكی ئەو كات لەبارەی هەناسەتەنگی لە بەرزایی زانیارییان نەبووبێت. هەروەكو هەندێ نووسەر هەن ویستوویانە لەو ئایەتەدا مزگێنی داگیركردنی ئاسمان ببینن، بەڵام وا پێدەچێ دەبێ ئەو بیرۆكەیە بەتەواوی دوور بخەینەوە، بە لای كەمەوە پەیوەست بەم ئایەتەوە.

## كارەبای ناو كەش

كارەبای ناو كەش و ئەنجامەكانی وەكو هەورە تریشقە و تەزرە لەم ئایەتانەدا هێمای بۆ كراوە:

ئایەتی ١٢و١٣ی سورەتی (الرعد):

﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ(١٢) وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلَائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ (١٣)﴾

ئایەتی ٤٣ی سورەتی (النور):

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَنْ مَنْ يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ (٤٣)﴾

ئەم دوو ئایەتە گوزارشتە لە پەیوەندیی ڕوونی نێوان دروستبوونی هەوری قورسی باران یان تەرزە و ڕوودانی هەورەتریشقە: یەکەمیان هەمووان حەزی پێ دەکەن چونکە خێری پێیە، لە کاتێکدا ئەوەی دووەم مایەی ترسە و ملکەچی بڕیاری خودای بەتوانایە. پەیوەندیی نێوان دوو دیاردەکە تەواو لەگەڵ ئەو زانیارییانە تەبایە کە ئەمڕۆ ئێمە لەبارەی کارەبای نێو کەشەوە هەمانە.

## سێبەر

بەڵام دیاردەی سێبەر و گواستنەوەی، لە سەردەمی ئەمڕۆماندا زانینی هۆکاری دروستبوونی بۆتە شتێکی ئاسایی دەبینین لەم ئایەتانەدا بۆتە بابەتی تێڕامان:

ئایەتی ٨١ی سورەتی (النحل):

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالًا﴾

ئایەتی ٤٨ی سورەتی (النحل):

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى مَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ (٤٨)﴾

**ئایەتی ٤٥و٤٦ی سورەتی (الفرقان):**

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا (٤٥) ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا (٤٦)﴾

دەقە قورئانییەکە ئاماژە بۆ پەیوەندییەکانی نێوان سێبەر و خۆر دەکات، ئەوەش لە دەرەوەی هەر شتێك کە پەیوەندی بە ملکەچبوونی هەموو مەخلوقێك لە بەرامبەر خودا هەیە بە سێبەریشەوە. لەم بارەوە پێویستە باس لەوە بکەین کە خەڵکی سەردەمی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) باوەڕیان وابوو کە گواستنەوەی سێبەر مەرجدارە بە گواستنەوەی خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا. بەڵام لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ دیاردەکە دەکات بێ ئەوەی هێما بۆ باوەڕی سەردەمەکە بکات: دەکرا ئەم باوەڕەی ئەو کات بە درێژاییی سەدەکانی دوای سەردەمی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) دەسخۆشی خەڵکی لێکەوتبایەوە و لە کۆتاییشدا دەبووە هەڵەیەکی دیار. هەروەها قورئان تەنها باس لە ڕۆڵی خۆر وەکو ئاماژەیەك بۆ سێبەر دەکات. لێرەدا دەبینین هیچ ناکۆکییەك نییە لە نێوان باسکردنی سێبەر لە لایەن قورئان و ئەو زانیارییانەی لەبارەی ئەم دیاردەیەوە لە سەردەمی نوێدا دەیزانین.

## جیهانی ڕووەك و جیهانی گیانلەبەر

ئەم بەشە زۆر ئایەت لەخۆدەگرێ کە باس لە ئەسڵی ژیان و هەندێ لایەنی جیهانی ڕووەك و چەند بابەتێکی تری گشتی یان تایبەتی پەیوەست بە جیهانی گیانلەبەران دەکات. کۆکردنەوەی ئایەتە پەرشوبڵاوەکانی قورئان لە پۆلێنکردنێکی عەقڵانییدا دەتوانێ بیرۆکەیەکی گشتگیرمان بداتێ لەبارەی پێدراوە قورئانییەکان لە هەموو ئەم بابەتانە.

بە نیسبەت بابەتەکانی ئەم بەشە و بابەتەکانی بەشی دواتر، هەندێ کات توێژینەوەی دەقی قورئان بە شێوەیەکی تایبەت دژوار دەبێت ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دژواریی وشەکان. زاڵبوون بەسەر ئەم دژوارییانە تەنها دوای شارەزابوون لە پێدراوە زانستییەکانی تایبەت بە بابەتە باسکراوەکە دێت. زەرورەتی بەراوردکردن لەگەڵ پێدراوەکانی زانست بە شێوەیەك کە بە تایبەت گرینگی بدات بە بوونەوەرە زیندووەکان لە ڕووەك و گیانلەبەر و مرۆڤ، ئەوەش بۆ ئەوەی واتای هەندێ وتەی قورئان لەم بوارانەدا بزانین.

لێرەوە دەرکی ئەوە دەکەین کە بۆچی کەسی زانا بڕیاری نادروستی لەبارەی هەندێ وەرگێڕانی ئەم دەستەواژە قورئانییانە دەدات؟ هەمان شت سەبارەت بە تەفسیرەکانیش کاتێ خاوەنەکانیان زانیاری زانستی پێویستییان بۆ تێگەیشتنی دەق نییە.

## (أ) ئەسلی ژیان

ئەم پرسە لە هەموو سەردەمێکدا مرۆڤی سەرقاڵ کردووە، جا ئەوەی پەیوەست بێت بە خۆیەوە یان تایبەت بێت بە بوونەوەر زیندووەکانی دەوروبەرییەوە. لێرەدا لە تێڕوانینێکی گشتییەوە لێی دەکۆڵینەوە. بەڵام بەشی دووەم باس لە دۆخی مرۆڤ دەکات کە گەیشتنی بۆ زەوی و زاوزێکردنی بابەتی توێژینەوەگەلێکی چڕوپڕی زۆر گرینگە.

کاتێ قورئان باس لەسەر ئاستێکی تەواو گشتی باس لە ئەسڵی ژیان دەکات ئەوا ئەوە زۆر بە کورتی لە ئایەتێکدا باس دەکات کە تایبەتە بە دروستبوونی بوونەوەر کە پێشتر باسمان کرد و قسەمان لەبارەیەوە کرد.

ئایەتی ٣٠ی سورەتی (الانبياء):

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (٣٠)﴾

لێرەدا هیچ گومانێک لە چەمکی سەرچاوەکە نییە، دەکرێ دەستەواژەکە مەبەستی ئەوە بێت کە هەموو شتێک سەرچاوەکەی ئاوە وەک ماددەیەکی بنەڕەتی و جەوهەری، یان ئەسڵی هەموو شتێکی زیندوو بریتییە لە ئاو..ئەم دوو واتایە تەواو لەگەڵ زانستدا کۆکە: ئەوەی بەدیاریکراوی جێگیرە ئەوەیە کە ئەسڵی ژیان ئاوییە و ئاو توخمی پێکهێنەری یەکەمە بۆ هەموو خانەیەکی زیندوو، ژیانی بێ ئاو مومکین نییە و ناکرێ، ئەگەر گفتوگۆ لەبارەی ئەگەری ژیان لەسەر هەسارەیەک کرا ئەوا یەکەم پرسیار بکرێ ئەوەیە: ئایا ئەم هەسارەیە بڕی پێویست ئاوی بۆ ژیان تێدایە؟

بەپێی پێدراوە نوێیەکان باوەڕ دەکرێ کە کۆنترین بوونەوەرە زیندووەکان سەر بە جیهانی ڕووەکەوە بووە: قەوزەگەلێك دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی(کمبری precambrien ) واتە لە کۆنترین خاکی ناسراو. دەبێ تۆخمەکانی جیهانی گیانلەبەر کەمێك دوای ئەوە دەرکەوتبێ: ئەویش هەر لە ئۆقیانووسەکانەوە هاتووە.

وشەی ئاو ئاماژە بۆ ئاوی ئاسمان دەکات هەروەك واتای ئاوی ئۆقیانووسەکان یان هەر شلەیەکی تر دەگەیەنێ. بە پێی واتای یەکەم ئاو تۆخمی پێویستە بۆ ژیانی هەر ڕووەکێك.

ئایەتی٥٣ی سورەتی(طه):

﴿وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى (٥٣)﴾

ئەوە یەکەم دەستەواژەیە لەبارەی (جووتێتی) لە ڕووەکدا و دواتر بۆ ئەم چەمکە دەگەڕێینەوە.

وشەکە بە واتای دووەمی، ئەوەی کە واتای (شلە) دەگەیەنێ بێ هیچ دیاریکردنێك، بە شێوە نادیاریکراوەکەی بۆ دەلالەتکردن لە دروستبوونی هەر گیانلەبەرێك بەکارهاتووە.

ئایەتی ٤٥ی سورەتی (النور):

﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ﴾

دواتر دەبینین کە وشەکە هەروەها بەسەر (سپێرم)یشدا دەچەسپێ.

کەواتە مەبەستەکە بریتی بێت لە ئەسڵی ژیان بە گشتی یان ئەو توخمەی وا دەکات ڕووەکەکان لە خاکەوە بڕوێن، یاخود مەبەستەکە تۆوی گیانلەبەر بێت، ئەوا هەموو دەستەواژەکانی قورئان لەگەڵ پێدراوە زانستییە نوێیەکان تەواو تەبا و ڕێکە، لە دەقی قورئاندا هیچ شوێنێك بۆ هیچ ئەفسانەیەك لەو ئەفسانانە نییە کە لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا بڵاو بوو.

## (ب) جیهانی ڕووەك:

لێرەدا ناتوانین بە شێوەیەکی گشتی باس لە هەموو ئەو دەستەواژە زۆرانە بکەین کە لە قورئاندا هەن و باس لەو نیعمەتانەی خودا دەکەن کە پەیوەستن بە مۆرکی سوودبەخشانەی باران کە دەبێتە هۆی ڕواندنی ڕووەك. کەواتە با لەم بابەتەدا سێ ئایەت هەڵبژێرین.

ئایەتی ١٠و١١ی سورەتی (النحل):

﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ (١٠) يُنبِتُ لَكُم بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالْأَعْنَابَ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (١١)﴾

ئایەتی ٩٩ی سورەتی (الانعام):

﴿وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ النَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انظُرُوا إِلَىٰ ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمْ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٩٩)﴾

ئایەتی ٩ بۆ ١١ی سورەتی (ق):

﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكًا فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ (٩) وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ (١٠) رِزْقًا لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا كَذَلِكَ الْخُرُوجُ (١١)﴾

وێڕای ئەم بابەخپێدانە گشتییانە، قورئان هەندێ بابەخپێدانی تریشی تێدایە کە وردتر باس لە بابەتەکان دەکات.

## هاوسەنگی لە جیهانی ڕووەك

ئایەتی ١٩ی سورەتی(الحجر):

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ (١٩)﴾

## هەمەجۆرایەتیی خۆراك

ئایەتی ٤ی سورەتی (الرعد):

﴿وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (٤)﴾

بوونی ئەم ئایەتانە شیاوی سەرنجدانە، ئەوەش بۆ ئەوەی سادەیی و سەنگینیی واژە بەکارهاتووەکان دیاربخەین، هەروەها باسی ئەو باوەڕانەش نییە

کە نەگونجاوە لەگەڵ ئەو ڕاستییە بنەڕەتییانەی لە سەردەمی ئێستادا سەلماوە و ساغ بۆتەوە. بەڵام ئەوەی زیاتر مایەی سەرنجدانە ئەو دەستەواژە قورئانییانەن کە تایبەتن بە زۆربوون لە جیهانی ڕووەکدا.

## زاوزێی ڕووەك:

پێویستە باسی ئەوە بکەین کە زۆربوون و زاوزێکردن لە جیهانی ڕووەکدا بە دوو ڕێگا دەبێت: ڕێگایەکی سێکسی و یەکێکی ناسێکسی. لە ڕاستیدا تەنێ ئەوە یەکەم شیاوی ئەوەیە ناوی (زاوزێ)ی بەسەردا ببڕێ، هەر ئەو ڕێگایە ئەو پرۆسە بایۆلۆژییە دیاری دەکات کە ئامانجی دەرخستنی تاکێکی نوێ و هاوشێوەی ئەو ڕووەکەیە کە هێناویەتە بوون.

بەڵام زاوزێی ناسێکسی تەنها زۆربوونە، ئەو لە دابەشبوونی ئەندامێکەوە پەیدا دەبێ کە بە جیابوونەوەی لە ڕووەکە ئەسڵییەکە گەشە دەکات و دەبێتە هاوشێوەی ئەو ڕووەکەی لێوەی پەیدا بووە: (گیارمون Guillermond) و (مانگینۆ Mangenoi) ئەم زۆربوونە بە (حاڵەتێکی گەشەکردنی تایبەت) دادەنێن. نموونەیەکی سادەش لەم بارەوە بریتییە لە نەمام: واتە لقێکی ڕووەکێك، چاندنی لە خاکێك و ئاودانی بە شێوەیەکی گونجاو تاوەکو بە هۆی ڕەگی تازەوە نوێ ببێتەوە. هەندێ ڕووەك ئەندامی تایبەتیان بۆ ئەم مەبەستە هەیە.(با جارێکی تر باسی بکەینەوە: دانەوێڵە ئەنجامی پرۆسەی زاوزێی سێکسییە.)..

زاوزێی سێکسی بە هۆی جووتبوونی توخمی نێرینە لەگەڵ توخمی مێینەوە دەبێ، ئەو توخمانەش لە پێکهاتەی نوێن و لەسەر هەمان ڕووەك یان بە جودا کۆبوونەتەوە. قورئان تەنها باسی ئەم پرۆسەیە دەکات.

ئایەتی ٥٣ی سورەتی (طه):

﴿وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى (٥٣)﴾

(زوج، کۆیەکەی أزواج) واتە جووت، دووان. وشەکە بۆ هەر شتێك بەکاردێ کە لە دووان پێکهاتبێ بۆ نموونە: جووتێك پێڵاو، بە هەمان شێوە بۆ یەکەیەکیش بەکاردێ کە لە نێر یان مێ پێکهاتبێ.

ئایەتی ٥ی سورەتی (الحج):

﴿وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ (٥)﴾

ئایەتی ١٠ی سورەتی (لقمان):

﴿فَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ(١٠)﴾

ئایەتی ٣ی سورەتی (الرعد):

﴿وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾

ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە بەری ڕووەك ئەنجامی پرۆسەی زاوزێی ڕووەکە باڵاکانە کە سیستمێکی ئاوێتەیان هەیە، قۆناغی پێش بەر قۆناغی گوڵە بە ئەندامە نێرینە(چقڵ) و ئەندامە مێینەییەکانییەوە(هێلکۆکە). دوای گواستنەوەی هەڵاڵە

ئەمەی دوایی بەر دەدات ئەویش دوای پێگەیشتنی ئەم دانەوێڵەیە دەدات. کەواتە هەموو بەرێك ئەندامی نێرینە و ئەندامی مێینەی لەخۆگرتووە. ئەوەشە ئایەتە قورئانییەکە دەیەوێ بیلێت.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە بەری هەندێ ڕووەك دەتوانێ بە بێ گوڵی نەپیتێنراو بەرهەم بدات، ((ئەمانەش بریتین لە بەری (زۆربوونی پاکانە — عذرية التوالد) وەکو بەری مۆز و هەندێ جۆری ئاناناس و هەنجیر و پرتەقاڵ و ترێ، ئەمەش واتای ئەوە نییە کە ئەم بەرانە لە ڕووەکی خاوەن چالاکیی سێکسییەوە نایەن.).

زاوزێ کاتێ ڕوودەدات کە تۆو بەرگی دەرەوەی دەکرێتەوە و دەڕوێ..ئەو کرانەوەیە وا دەکات ڕەگ دەربێت کە لە خاکەوە پەیدا دەبێ.

ئایەتێك ئاماژە بۆ ئەم ڕووانە دەکات:

ئایەتی ٩٥ی سورەتی (الانعام):

﴿إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى﴾

ئەگەر قورئان بوونی ئەم دوو توخمە جووتە لە جیهانی ڕووەکدا زۆر دووپات دەکاتەوە، ئەوا چەمکی جووتبوون لە چوارچێوەیەکی گشتیتری بێسنوور تۆمار دەکات.

ئایەتی ٣٦ی سورەتی (یس):

﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ (٣٦)﴾

دەکـرێ گریمانــەی زۆر لــەبارەی واتــای شــتەکان کــە خــەڵك لــە ســەردەمی موحەممەددا(درودی خوای لێ بێت) نەیاندەزانی بخرێتەڕوو و دەکرێ ئـەمڕۆ بناغـە یــان وەزیفــەی جووتبــوون لــە شــتە زۆر بچــووك یــان گــەورەکان یــان جیهــانی زیندەوەران یان جیهانی بێگیان ببینین. گرینگ ئەوەیە تێبینی ئەوە بکەین کە لـە قورئاندا شتێك نابینین لەگەڵ زانستی ئەمڕۆدا ناتەبا بێت.

## ( ح ) جیهانی ئاژەڵ:

لە قورئانـدا چـەند پرسـێکی پەیوەسـت بـە جیهـانی گیانلەبـەر هەیـە، ئـەوەش بابەتی سەرنجەڕاکێشە کە وا دەخوازێ بەراوردێك بکەین لەگەڵ زانیارییـە زانسـتییە نوێیەکان سەبارەت بەم خاڵـە تایبەتانـە. لێـرەدا باسـێك دەخەینـە ڕوو ئەگەرچـی ناتەواویشـە لـەبارەی ئـەم بابەتـەوە کـە لـە قورئانـدا هـاتووە، خـودا ئامـاژە بـە خەڵقکردنی هەندێ ڕەگەزی جیهانی گیانلەبەر دەکـات بـە ئامـانجی ئـەوەی خـەڵك سـەرنج لـە نیعمەتـەکانی خـودا بـدەن. ئـەم دەسـتەواژەیە وەکـو بناغەیـەك بـۆ خستنەڕووی نموونەیەك لەبارەی ئەو شێوازەی قورئان باسی دەکات سـەبارەت بـە گونجـانی مـەخلوقات کـە هاوئاهەنگـە لەگـەڵ پێداویسـتییەکانی مـرۆڤ بـە تایبـەت سەبارەت بە جووتیاران.

ئایەتی ٥ بۆ ٨ی سورەتی (النحل):

﴿وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ (٥) وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ (٦) وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ

الْأَنْفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ (٧) وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٨)﴾

لە پاڵ ئەم بابەخپێدانە گشتییانە، قورئان باس لە هەندێ پێدراو لەبارەی چەند بابەتێکی هەمەجۆر دەکات:

- زاوزێکردن لە جیهانی گیانلەبەر.
- باسی بوونی هەندێ گروپی گیانلەبەران.
- وردبوونەوە لە هەنگ و جاڵجاڵۆکە و باڵندەکان
- وتەیەك لەبارەی ئەسڵی شیری ئاژەڵەوە.

## ١- زاوزێکردن لە جیهانی گیانلەبەران

زاوزێکردن بە شێوەیەکی زۆر کورت لە هەر دوو ئایەتی ٤٥ و ٤٦ی سورەتی (النجم)دا باس دەکرێ:

﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى (٤٥) مِنْ نُطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى (٤٦)﴾

جووت، تۆخمی جووتبوون هەمان ئەو گوزارشتەیە کە لە ئایەتەکانی تایبەت بە زاوزێی ڕووەکەکان بینیمان. وردەکاریی جوان لە دیاریکردنی ئەو بڕە کەمەی سپێرمدایە کە پێویستە بۆ زاوزێکردن. لەبەرئەوەی ئەو وشەیەی بۆ ئاماژەدان بە سپێرم بەکارهاتووە تایبەتە بە مرۆڤ، بۆیە ئێمە لە بەشی داهاتوو لێدوانێك لەبارەی گرینگیی ئەم تێبینییە پێشکەش دەکەین.

## ٢- بوونی گروپی گیانلەبەران

ئایەتی ٣٨ی سورەتی (الانعام):

﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ (٣٨)﴾

چەند خاڵێک لەم ئایەتەدا هەیە پێویستە تەفسیری بکەین. یەکەم: وا دەردەکەوێت کە قورئان باس لە چارەنووسی گیانلەبەران دوای مردنیان دەکات: بە نیسبەت ئەم خاڵەوە هەروەکو روونە ئیسلام هیچ رێبازێکی نییە. چارەنووسی گشتی کە وا دەردەکەوێ بابەتی ئێرەیە، دەکرێ وەکو چارەنووسێکی رەها یان چارەنووسێکی رێژەیی دیاریکراو بە پێکهاتە و سیستمێکی وەزیفی وێنا بکرێ کە کۆنترۆڵی شێوازی رەفتار دەکات: گیانلەبەر وەڵامدانەوەی بۆ پاڵنەری دەرەکی هەمەجۆر هەیە و لەوەشدا لە رووی وەزیفییەوە ملکەچی مەرجی تایبەتە.

بەپێی قسەی (بلاشیر) راڤەکارێکی کۆنی وەکو(الرازی) پێی وا بوو کە ئەم ئایەتە واتای هەندێ رەفتاری سروشتییانەیە کە گیانلەبەران ستایشی خودای پێ دەکەن...بەڵام شێخ (ئەبووبەکر حەمزە) لە وەرگێرانەکەی بۆ قورئان دەڵێ: ((ئەو غەریزەیەی بە پێی حیکمەتی خودایی پاڵ بە هەموو بوونەوەرێکەوە دەنێ بۆ ئەوەی کۆببێتەوە بە مەبەستی زاوزێکردن و خۆ رێکخستن لە کۆمەڵدا وا دەخوازێ کە کاری هەر تاکێك بۆ کۆمەڵەکە سوودبەخش بێت.)).

لەم دەیانەی دوواییدا ئەم رەفتارە گیانەوەرییانە بەوردی لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کراوە و لێکۆڵەران گەیشتوونەتە دۆزینەوەی بوونی گروپگەلی راستەقینەی گیانەوەران. بێگومان لێکۆڵینەوەی ئاکامی کاری هەر گروپێك وای لە

لێکۆڵەران کردووە لە مێژساڵەوە زەرورەتی ڕێکخستنی بەکۆمەڵ قەبووڵ بکەن. بەڵام بە نیسبەت هەندێ جۆرەوە لەمێژ نییە وردەکاری ئەم ڕێکخستنانە دۆزراوەتەوە. بێگومان باشترین نموونەی لێکۆڵراوە و ناسراوترین نموونە: نموونەی هەنگە کە ڕەفتاری بەستراوەتەوە بە ناوەکانی (ڤۆن فریش) و (لۆرێنز) و (تینبێرگن) کە بەم هۆیەوە لە ساڵی ١٩٧٣ خەڵاتی نۆبڵیان بردەوە.

## ٣- چەند تێڕامانێکی تایبەت بە هەنگ و جاڵجاڵۆکە و باڵندە

کاتێ پسپۆڕانی کۆئەندامی دەمار بیانەوێ نموونەی سەرنجڕاکێش لەبارەی ئەو سیستمە وردەی کۆنترۆڵی ڕەفتاری گیانلەبەران دەکات بخەنەڕوو ئەوا ڕەنگە ئەو گیانلەبەرانەی زۆر باس بکرێن بریتیین لە هەنگ و جاڵجاڵۆکە و باڵندەکان(بەتایبەتی باڵندە کۆچەرەکان). بە هەر حاڵ دەکرێ جەخت لەوە بکرێتەوە کە ئەم سێ گروپە نموونەیەکی ئەوپەڕی جوانن لەبارەی سیستمی باڵاوە.

کەواتە باسکردنی ئەم سێیانە نموونەییە لە جیهانی گیانلەبەران لە قورئاندا تەواو هاودەنگە لەگەڵ ئەو مۆرکە گرینگەی هەر یەك لەم گیانلەبەرانە بە شێوەیەکی بێوێنە لە تێڕوانینی زانستییدا هەیانە.

### هەنگ:

هەنگ بابەتی درێژترین لێدوانە لە قورئاندا:

ئایەتی ٦٨و٦٩ی سوڕەتی (النحل):

﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ (٦٨) ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٦٩)﴾

زانینی مەبەست لە فەرمانکردن بە شوێنکەوتنی ڕێگاکانی خودا بەدیاریکراوی دژوارە ئەگەر ئەوە لە تێڕوانینێکی گشتییەوە نەبێ. بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی لەبارەی ڕەفتاری هەنگەوە هەمانە،هەموو ئەوەی دەتوانرێ بوترێ ئەوەیە کە لێرەدا سیستمێکی دەماریی نایاب هەیە کە بنەمای ڕەفتاری حاڵەتی ئەو سێ گیانلەبەرە باسکراوەی قورئان وەکو نموونە نیشان دەدات. زانراوە کە هەنگ هۆکارێکی بۆ دواندن هەیە ئەوەش لە ڕێی سەماوە. هەنگ بەم شێوەیە دەتوانێ ئەو ئاراستەیەی کە پێویستە بیگرێتەبەر و ئەو ماوەیەی ئەو گوڵانەی لێوە دوورە بۆ ئەوەی شیلەیان بمژێ، بزانێ.

## جاڵجاڵۆکە( دا پیرۆچکە ):

قورئان بۆ جەختکردنەوە لە ورد و ناسکی لانەکەی، ئاماژە بۆ جاڵجاڵۆکە دەکات، لانەی ئەو لە هەموو ماڵەکان لاوازتر و بێهێزترە. دەقەکەی قورئان دەڵێ: ئەوێ پەناگەیەکی نائارامە و ناپارێزراوە، وەکو ئەو خەڵکەی کە جگە لە خودا شتێکی تر دەپەرستن.

ئایەتی ٤١ی سورەتی (العنکبوت):

﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ (٤١)﴾

لە ڕاستییدا چنراوی داپیرۆچکە لە داوی ئاوریشمی پێکدێ کە لە لایەن ڕژێنەکانیەوە دەردەدرێ و پێوانەی ئەو داوانە زۆر لاوازە. مرۆڤ ناتوانێ لاسایی وردی و باریکایی ئەو چنراوە بکاتەوە.

زانایانی سروشت لەبارەی ئەو پلانی کارە یاسابەدەرەوە دەپرسن کە خانە دەمارییەکانی ئەو گیانلەبەرە تۆماری کردووە کە ڕێی پێ دەدات چنراوێکی ئەندازەیی تەواو دروست بکات، بەڵام قورئان باس لەمە ناکات.

## باڵندەکان:

باڵندەکان بابەتی چەندان ئاماژەن لە قورئاندا، لە بەسەرهاتەکانی پێغەمبەران ئیبراهیم و یوسف و داوود و سولەیماندا(سەلامی خوایان لێ بێت) هاتووە.ئەم ئاماژانە پەیوەندییان بە بابەتەکەی ئێرەوە نییە.

پێشتر ئەو ئایەتەت بینی کە لەبارەی بوونی گروپی گیانلەبەرانی زەوینی و باڵندەکانەوە بوو.

ئایەتی٣٨ی سورەتی (الانعام):

﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ (٣٨)﴾

دوو ئایەتی تر کە ملکەچیی ڕەهای باڵندان بۆ دەسەڵاتی خودا زەق دەکەنەوە.

ئایەتی ٧٩ی سورەتی (النحل):

﴿أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٧٩)﴾

ئایەتی ١٩ی سورەتی(الملك):

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ﴾

تەفسیرکردنی هەر وشەیەکی هەر یەکێك لەم ئایەتانە کارێکی سەختە. ئەو تەفسیرەی دەماندەنێ گوزارشت بەو بیرۆکەیە دەکات کە دەڵێ خودا باڵندەکانی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. واتای یەکەمی فرمانی (أمسك) بریتییە لە: دەستی لەسەر شتەکە دانا، گرتی، شتێکی لە دەستی خۆیدا هەڵگرت.

دەتوانین ئەم ئایەتانە کە پەیوەستبوونێکی پتەوی ڕەفتاری باڵندە لە پەیوەندیی لەگەڵ دەسەڵاتی خودا زەق دەکاتەوە لەگەڵ پێدراوە نوێیەکان نزیك بکەینەوە، ئەو پێدراوانەی ئاستی کەماڵیی هەندێ جۆر باڵندەی لە پلاندانان بۆ بەرنامەی هاتوچۆیەکانی ڕوون کردۆتەوە..بوونی بەرنامەی کۆچکردن کە لەسەر خشتەی (جینیتیکی) بۆ جانەوەر تۆمارکراوە تەنها ئەو دەتوانێ ئەو ئاراستە زۆر ئاڵۆز و درێژانە شی بکاتەوە کە باڵندەی کەمتەمەن و بێ ئەزموونی پێشوو و بێ هیچ فەرماندەیەك دەیگرێتەبەر کە دواتر لە بەروارێکی دیاریکراو دێتەوە هەمان خاڵ کە لێوەی دەرچووە. بۆ نموونە ئوستاز هامبۆرگ لە کتێبەکەیدا(هێز و لاوازی) باس لە نموونە بەناوبانگەکەی باڵندەی ئۆقیانووسی هێمن دەکات کە ناوی (Mutton bird)ە کە گەشتێکی لە شێوەی ژمارە(٨)ی ئینگلیزی دەکات کە

دەگاتە ماوەی ٢٥٠٠٠ کیلۆمەتر و شەش مانگ درێژە دەکێشێ، ئێستا مایەی قەبووڵکردنە کە ڕێنماییە زۆر ئاڵۆزەکانی نموونەی ئەم گەشتانە لەسەر خانە دەمارییەکانی باڵندەکە تۆمارکراوە..بێگومان ئەوە بە بەرنامە نەخشەی بۆ دانراوە..

کەواتە کێ نەخشەکێشەکەیە..؟

## بنچینەی پێکهاتەکانی شیری گیانلەبەر

ئایەتی ٦٦ی سورەتی (النحل):

﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ (٦٦)﴾

پێناسەی قورئان بۆ بنچینەی پێکهاتەکانی شیری گیانلەبەر تەواو لەگەڵ پێدراوەکانی زانستی نوێ هاوڕێکە. ئەو شێوازەی ئایەتەکەی پێ تەفسیر دەکەین شەخسییە، ئەم جۆرە تەفسیرانە تەنانەت نوێیەکانیشی بە ڕای من پەسندکراو نەماوە. دوو نموونە لەم بارەوە:

- تەفسیری (ر.بلاشیر) ١٩٦٦:

((لە ڕاستییدا لە ئاژەڵەکانتان ئامۆژگارییەك بۆتان هەیە کە هیچ گومانێکی تێدا نییە. لە شیرێکی خاوێنی بەتام تێراوتان دەکەن بۆ کەسێك بیخواتەوە، ئەو شیرە لە هەناوییدا لەنێوان خۆراکی هەرسکراو و خوێنەوە بۆتان دێت.)).

- تەفسیری ئوستاز (حمید الله) ١٩٧١:

((بێگومان لە گیانلەبەراندا بابەتێك بۆ تێڕامان هەیە. لە هەناویدا لەنێوان پاشەڕۆ و خوێنەوە وا دەكەین شیرێكی پاك و سازگار بخۆنەوە)).

ئەگەر ئەم دەقانە بخەینە بەردەم هەر پسپۆڕێكی فسیۆلۆجیا ئەوا دەڵێ كە ئەوە زۆر لێڵ و ناڕوونە. بە جۆرێك كە هەرگیز هیچ سازان و هاوڕێكییەك لەگەڵ شارەزاییەكانی زانیاریی نوێ تەنانەت زانیاریی بەراییش ڕوون ناكاتەوە. ئەم چەند دێڕە لە كتێبی نووسەرە دیارەكانە. بەڵام شتێكی زۆر ئاساییە كە هەر نووسەرێك هەر چەند شارەزا بێت ئەگەر هەیە تووشی هەڵەی لێدوان ببێت لەبارەی بابەتی زانستییەوە ئەگەر لەو بوارەدا پسپۆڕ نەبێ.

ئەو تەفسیرەی بە لای ئێمەوە دروست دەردەكەوێ بریتییە لە: ((لە ڕاستییدا ئێوە لە گیانلەبەرە چوار پێیەكانتان زانستێكتان چنگ دەكەوێ: ئێمە لە جەستەی ئەوانەوە خواردنەوەیەكتان پێ دەدەین، واتە ئەوەی لە تێكەڵاوبوونی نێوان ناوەڕۆكی ڕیخۆڵەكان و خوێنەوە دێت كە بریتییە لە شیرێكی سازگار و خاوێن كە نۆشكردنی بۆ هەر یەكێك ئاسانە كە بیخواتەوە)).

ئەم تەفسیرە نزیكە لەو لێكدانەوەیەی لە كتێبی (المنتخب فی تفسیر القران الكريم)دا هاتووە كە ئەنجوومەنی باڵای كاروباری ئیسلامی لە قاهیرە بڵاوی كردۆتەوە، ئەو تەفسیرە پشت بە پێدراوەكانی زانستی فسیۆلۆجیای نوێ دەبەستێ.

سەبارەت بە وشەكانی ئەم تەفسیرە بەم شێوەیە ڕوونكردنەوە دەدەین:

گوتم((ئەوەی لەناو جەستەیاندایە)) و نەمگوت لە هەناویدایە هەروەكو (ر.بلاشیر) یان ئوستاز(حمیدالله) وەهایان گوت، چونكە وشەی (بطن) بە واتای:

ناوەند یان نێو شتێك دێت، ئەم وشەیەش هیچ واتایەکی تۆێکاریی دیاریکراوی نییە..کەواتە دەڵێین: ((ئەوەی لەناو جەستەیاندایە، ئەوەش وا دەردەکەوێت کە تەواو لەگەڵ سیاقەکە گونجاوە.)).

سەبارەت بە چەمکی (سەرچاوە)ی پێکهاتەکانی شیر ئەوا گوزارشتەکەی لە (حرف جر)ی (من) و واژەی بەیەکەوەبەستنی (بین)دا دەبینین. ئەو پیتەی دوایی تەنها نیشانە نییە لەسەر بیرۆکەی بوونی شتێك لەنێو شتگەلێکی تر یان لەناویدا، هەروەك ئەوە لە تەفسیرەکانی (بلاشیر و حمیداللە)دا دەبینین کە بە فەرەنسایی نووسیویانە، بەڵکو نیشانە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوو شت یان دوو کەس.

بۆ ئەوەی لە تێڕوانینی زانستییەوە لە واتای ئەم ئایەتە تێ بگەین دەبێ سوود لە زانیارییەکانی فسیۆلۆجیا وەربگرین.

ئەو مادده بنەڕەتییانەی بە گشتی خۆراکی جەستە دابین دەکەن لەو کارلێکە کیمیاییانەوە دێن کە لە کەناڵی هەرسکردنەوە ڕوودەدەن. ئەم ماددانەش لەو توخمانەوە دێن کە لە ناو ڕیخۆڵەکاندا هەن. کاتێ ئەم ماددانەی لە ڕیخۆڵەکاندا هەن دەگەنە قۆناغی خوازراو لە کارلێکی کیمیایی ئەوا لە ڕێی دیواری ڕیخۆڵەکانەوە بەرەو سوڕی گشتی دەڕۆن. ئەم گواستنەوەیە بە دوو ڕێگا دەکرێ: یان ڕاستەوخۆ بە هۆی بۆڕییە لیمفاوییەکان یان ناڕاستەوخۆ بە هۆی سوڕی خوێن بۆ جگەر porntal circulatiorn کە ئەو ماددانە بۆ جگەر دەبات و لەوێ هەندێ گۆڕانکاری تێدا دەکرێ، پاشان لە جگەرەوە دەردەچێ تاوەکو دوا جار بچێت بۆ سوڕی خوێن. بەم شێوەیە هەموو شتێك بە سوڕی خوێندا تێدەپەڕێ.

ڕژێنەکانی مەمك پێکهاتەکانی شیر دەردەدەن. ئەم ڕژێنانەش خۆراك لە بەرهەمەکانی هەرسکردنی ئەو خۆراکانە وەردەگرن کە بە هۆی خوێنی سوڕاوەوە بۆی دێت، کەواتە خوێن ڕۆڵی دەستخەر و گوێزەرەوەی ماددە دەرهاتووەکان لە خۆراك دەگێڕێ و خۆراکدەری ڕژێنەکانی مەمکە کە شیر بەرهەم دێنن هەروەکو خۆراکی هەر ئەندامێکی تر دەدات.

کەواتە هەموو شتێك لێرەوە ڕوودەدات سەرەتا لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ناوەڕۆکی ڕیخۆڵەکان لەگەڵ خوێن لە هەمان دیواری ڕیخۆڵەدا. ئەم زانیارییە دیاریکراوە ئەمڕۆ بە یەکێك لە دەسکەوتەکانی کیمیا و فسیۆلۆجیای هەرس دادەنرێ، لە سەردەمی پێغەمبەر موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) هەرگیز زانراو نەبووە. زانینی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نوێ. بەڵام دۆزینەوەی سوڕی خوێن کاری (هارڤی) بووە و بە نزیکەی دوای دە سەدە لە هاتنەخوارەوەی قورئان ئەم دۆزینەوەیە ڕووی داوە.

ئەز باوەڕم وەهایە کە بوونی ئەو ئایەتە قورئانییە کە ئاماژە بۆ ئەو زانیارییانە دەکات ناکرێ تەفسیرێکی وەزعییانەی بۆ بکەین، ئەوەش بە تێڕوانین و ڕەچاوکردنی دووریی ئەو سەردەمەی ئەم زانیارییانەی تێدا دارێژراوە.

# زاوزێی مرۆڤ

زاوزێ بابەتێکە کە ئەگەر لە نووسراوە کۆنەکان وردبیتەوە نووسراوێك نادۆزیتەوە تێگەیشتنی هەڵەی لەبارەیەوە نەبوویێت ئەگەر کەمێکیش بێت. لە سەدەکانی ناوەڕاست بەڵکو تەنانەت لە سەردەمێکی زۆر دووریش نا، چەندان ئەفسانە بە دەوری زاوزێوە تەنرابوو! جا چۆن وا نابێت بەتایبەتی کە تێگەیشتن لە پرۆسە ئاڵۆزەکانی زاوزێ لە مرۆڤی خواستووە توێکاری بزانی و وردبین بدۆزێتەوە و ئەو زانستە بنەڕەتییانە دابنێت کە زانستەکانی فسیۆلۆجیا و کۆرپەلەزانی و لەدایکبوون و هیتری لێوە هەڵێنجرێ؟

بەڵام بە نیسبەت قورئانەوە بابەتەکە تەواو جودایە، لە چەندان شوێن باس لە پرۆسیسەکانی زاوزێکردن دەکات. قورئان قۆناغەکانی بەوردی و دیاریکراوی باس دەکات بێ ئەوەی لە خوێندنەوەیدا وتەیەکی هەڵەی تێ بکەوێ. بە دەستەواژەی سادە گوزارشت لەوە دەکات کە تێگەیشتنی مرۆڤ بتوانێ پەی پێ ببات و تەواو تەبایە لەگەڵ ئەو زانیارییانەی دوای ماوەیەکی زۆر پاش ئەو دەدۆزرێنەوە.

ئەگەر بابەتی زاوزێکردنی مرۆڤ لە دەیان ئایەتی قورئاندا بێ هیچ ڕیزبەندییەکی ڕوون باسکرابێت ئەوا قورئان لە ڕێی چەند وتەیەکەوە کە هەر یەکێکیان جەخت دەکاتە سەر خاڵێك یان چەند خاڵێك ئەم بابەتە دەخاتە ڕوو. بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی گشتگیرمان لەبارەی بابەتەکەوە هەبێ دەبێ هەموو ئەم ئایەتانە کۆبکەینەوە، ئەوەش وەکو بابەتەکانی پێشوو کە باسمان کرد بۆ قسە لەسەرکردن ئاسانترە.

## دووبارەکردنەوەی هەندێ زانیاری:

پێویستە هەندێ زانیاری کە لە سەردەمی دابەزینی قورئان و سەدەکانی دواتریش نەزانراو بوون لێرەدا دووبارە بکەینەوە.

زاوزێی مرۆڤ بە هۆی زنجیرەیەك پرۆسەی هاوبەش لەنێوان هەموو مەمکدارەکان ڕوودەدات. سەرەتای ئەم زنجیرەیە بە پیتاندنی هێلکۆکەیەك لە ڤالوب کە لە نیوەی دەورەی بێنوێژی لە هێلکەدان جوێ بۆتەوە. هۆکاری پیتێنەر بریتییە لە تۆوی پیاو یان بە دیاریکراوی سپێرم، یەك خانەی بەرهەمهێنەر بۆ پیتاندن بەسە: کەواتە بۆ ئەوەی پیتاندن ڕووبدات بڕێکی زۆر کەم لەم تۆواوە بەسە کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر سپێرمی تێدایە(لە یەك ئاوهاتنەوەی نێردا دەیان ملیۆن سپێرم هەیە). سپێرم بە هۆی گورچیلەکانەوە بەرهەم دەهێنرێ و بە شێوەیەکی کاتی لە ئامێری هەڵگرتن و لەو کەناڵانە هەڵدەگیرێ کە لە کۆتاییدا دەچنەوە بۆ ڕێڕەوەکانی میزەوە، بە درێژایی ئەم ڕێڕەوانە ڕژێنی پاشکۆی جیاجیا هەن کە دەرهاویشتەیەکی زێدە بۆ سپێرمەکە زیاد دەکەن بەڵام ئەم دەرهاویشتەیە هیچ توخمێکی پیتێنەری تێدا نییە.

لە خاڵێکی دیاریکراوی کۆئەندامی زاوزێی مێینە هێلکەی پیتێنراو هێلانە دەکات، لە ڕێی یەکێك لە ڤالوبەکانەوە دێتە خوار بۆ ناو منداڵدان و لەوێدا جێگیر دەبێت، زۆر نابات خۆی بە منداڵدانەوە هەڵدەواسێ و دەچێتە نێو ئەستووراییی منداڵدان و پاشان دوای دروستبوونی وێڵاش دەچێتە نێو ماسوولکەکەیەوە. بۆ نموونە ئەگەر هاتوو هێلکە پیتێنراوەکە لەبری منداڵدان لە ڤالوب جێگیربوو ئەوا سکپڕییەکە دەپچڕێ.

کاتێ دەتوانین کۆرپەلە بە چاوی ئاسایی ببینین لەسەر شێوەی پارچە گۆشتێك دەردەکەوێ کە سەرەتا ناتوانین هیچ ڕواڵەتێکی مرۆڤانەی تێدا بناسینەوە، بە چەند قۆناغێکی یەك بە دوای یەك و پلەپلە لەم پارچە گۆشتە گۆڕانکاری ڕوودەدات، پەیکەری ئێسك کە ماسولکە دەوری داوە و کۆئەندامی دەمار و کۆئەندامی سوڕی خوێن و هەناو و هیتر دروست دەبن.

ئەوە ئەم زانیارییانەیە کە لەگەڵ قورئان لەبارەی زاوزێوە بەراوردی دەکەین.

## زاوزێکردنی مرۆڤ لە قورئان:

گەڵاڵەکردنی بیرۆکەیەك لە ناوەڕۆکی قورئان لەبارەی ئەم بابەتەوە کارێکی ئاسان نییە. دژواریی یەکەم لەوەدایە کە وتەکانی تایبەت بە زاوزێی مرۆڤ لە هەموو قورئاندا پەرشوبڵاوە، بەڵام ئەمە دژوارییە گەورەکە نییە، ئەوەی لێرەدا لێکۆڵەر سەرگەردان دەکات گرفتی وشەکانە.

لە ڕاستیدا وەرگێڕان و تەفسیری هەندێ برگە کە هێشتا لە سەردەمی ئێستاماندا بڵاوە بیرۆکەیەکی تەواو هەڵە لەبارەی ئایەتەکانی تایبەت بەم بابەتە دەدات بەو زانایانەی کە دەیانخوێننەوە، بۆ نموونە زۆربەی ئەم تەفسیرانە دەڵێن مرۆڤ سەرەتا لە (پەڵەخوێن)ێك یان (پێکەوەنووسان)ێك چێ دەبێ. ئەم وتەیە زانای پسپۆڕ لە بواری خۆیدا هەرگیز قەبووڵی ناکات: هەرگیز ئەسڵی مرۆڤ شتێکی لەم جۆرە نەبووە. دواتر دەبینین چۆن ئەو کەسانە بە هۆی نەبوونی ڕۆشنبیریی زانستییەوە دەکەونە ئەم هەڵەیەوە.

نموونەی ئەم تێبینییە وا دەکات لەوە تێ بگەین کە بەستنەوەی زانیارییە زمانەوانییەکان و زانیارییە زانستییەکان بۆ تێگەیشتن لە وتەکانی قورئان لەبارەی زاوزێوە چەندە گرینگایەتییەکی گەورەی هەیە.

قورئان یەکەم جار تەرکیز دەکاتە سەر ئەو گۆڕانکارییە یەك لە دوای یەکانەی کۆرپەلە لە منداڵداندا تا کۆتایی سکپڕی پێیدا تێدەپەڕێ..

ئایەتی ٦ بۆ ٨ی سورەتی(الانفطار):

﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ (٥) يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ (٦) الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ (٧) فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ (٨)﴾

ئایەتی ١٤ی سورەتی (نوح):

﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا (١٤)﴾

لە پاڵ ئەم تێبینییە گشتییەوە دەقی قورئان سەرنج بەرەو چەند خاڵێکی تری تایبەت بە زاوزێی مرۆڤ ڕادەکێشێ، دەکرێ بەم شێوەیە پۆلێن بکرێن:

١- پیتاندن بە هۆی برێکی زۆر کەمی تۆواو ئەنجام دەدرێ.

٢- سروشتی تۆواوی پیتێنەر.

٣- لانەکردنی هێلکەی پیتێنراو.

٤- گەشەکردنی کۆرپەلە.

## ١- پیتاندن بە هۆی بڕێکی زۆر کەمی تۆواوەوە

قورئان ئەم زانیارییە ١١ جار دووبارە دەکاتەوە بە بەکارهێنانی ئەم تەعبیرە کە دەیبینین لە:

ئایەتی ٤ی سورەتی (النحل):

﴿خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ﴾

نطفة: وشەکە لە (فعل)ێکەوە هاتووە بە واتای: ڕژا، دڵۆپا، تکا، وەکو ئاماژەیەکیش بۆ ئەو ئاوەی دوای بەتاڵکردنی لە سەتڵدا دەمێنێتەوە. کەواتە هێمایە بۆ بڕێکی زۆر کەمی شلەیەك، لێرەوە واتای دووەمی دەبێتە (دڵۆپە ئاوێك). مەبەست لێرە دڵۆپێك لە ئاوی نێرینەیە(تۆواو). بۆیە هەمان ئەم وشەیە لە ئایەتێکی تردا بە وشەی (مني – تۆواو) دەبەسترێتەوە:

ئایەتی ٣٧ی سورەتی(القيامة):

﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى (٣٧)﴾

ئایەتێکی تر هەیە ئاماژە بەوە دەکات کە تۆواوەکە لە (قرار)ێك دادەنرێ. ئەم (قرار)ەش هەروەك تەواو ڕوونە هێمایە بۆ کۆئەندامی زاوزێ.

ئایەتی ١٣ی سورەتی (المؤمنون):

﴿ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣)﴾

سیفەتی (مكين) کە دەقەکە وەسفی (قرار)ی پێ دەکات تەعبیر لە بیرۆکەی شوێنی جێگیر دەکات. لە هەر بارێکدا بێت مەبەست لێی ئەو شوێنەیە لە

کۆئەندامی دایك کە مرۆڤ تێیدا گەشە دەکات. بەڵام ئەوەی گرینگە بەتایبەتی جەختی لێ بکرێتەوە بریتییە لەو زانیارییە لەبارەی برێکی کەمی پێویست بۆ پیتاندن کە تەواو تەبا و هاورێکە لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە دەیزانین.

## ٢- سروشتی تۆواوی پیتێنەر

قورئان ئەم تۆواوە کە پیتاندن مسۆگەر دەکات بە چەند سیفەتێکی ئەوتۆ باس کە شیاوی لێکۆڵینەوەیە:

(أ) (مني – تۆواو) هەروەك پێشتر دیاریمان کرد(ئایەتی ٣٧ی سورەتی القيامة).

(ب) (ماء دافق – ئاوێکی بەتەوژم): ﴿خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ (٦)﴾ (ئایەتی ٦ی سورەتی الطارق).

(ج) ماء مهين – ئاوێکی بێنرخ): (ئایەتی ٢٠ی سورەتی المرسلات، ئایەتی ٨ی سورەتی السجدة).

دەکرێ سیفەتی (مهين) تەفسیر بکەین نەك وەکو خودی تۆواوەکە بەڵکو بە هۆی دەرچوونی لە کونی میزەوە، کەواتە ئەو لەو ڕێیەوە دێت کە میزی لێوە دێتەدەرێ.

(د) ((أمشاج)) تێکەڵە: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾ ئایەتی ٢ی سورەتی (ألانسان).

زۆرێك لە لێكدەرەوانی قورئان وەكو ئوستاد (حمیداللە) پێیان وایە كە مەبەست لەم تێكەڵەیە ڕەگەزی نێر و ڕەگەزی مێیە. نووسەرە كۆنەكانیش هەروا بوون، چونكە ئەوان كەمترین بیرۆكەیان لەبارەی فسیۆلۆجیای پیتاندن و دۆخی پیتاندنی بایۆلۆجی لە لایەن مێینەوە نەبوو، وایان دادەنا كە وشەكان تەنها ئاماژە بۆ كۆبوونەوەی هەردوو ڕەگەزەكە دەكات.

بەڵام موفەسیرە نوێیەكان وەكو خاوەنی (المنتخب) كە ئەنجوومەنی باڵای كاروباری ئیسلامی لە قاهیرە بڵاوی كردۆتەوە لەم شێوازە لادەدەن و پێیان وایە كە دڵۆپێك تۆواو ((خاوەن چەند توخمێكی جۆراوجۆر))ە. تەفسیری (المنتخب) وردەكاریی زیاتر لەوبارەوە نادات بەڵام بە ڕای من تێبینییەكەی تەواو بەجێیە.

كەواتە توخمە جیاوازەكانی تۆواو چین؟

تۆواو لە چەند دەردراوێكی جیاواز پێكدێت كە لەم ڕژێنانەوە دێن:

(أ) جووتە گوونەكە (دەردراوی ڕژێنەزاوزێی نێرینە سپێرمی تێدایە، ئەو سپێرمەش خانەیەكی درێژكۆڵەی كلكدارە و لەنێو شلەیەكدا مەلە دەكات.).

(ب) كیسە تۆواوەكان: ئەم ئەندامانە تۆواوەكان هەڵدەگرن و كەوتۆتە نزیك پرۆستاتا و دەردراوێكی تایبەت دەردەدەن بەڵام هیچ توخمێكی پیتێنەریان تێدا نییە.

(ج) پرۆستاتا: شلەیەك دەردەدات كە چرپی توند و بۆنێكی تایبەت دەدات بە تۆواو.

(د) ئەو ڕژێنانەی پاشکۆی ڕێڕەوەکانی میزن: بریتیین لەو ڕژێنانەی ناسراون بە (کوپێرcooper) یان (مێری mery) کە شلەیەکی ڕەوان دەردەدەن، هەروەها ڕژێنەکانی (لیتری littre) کە ماددەیەکی لینج دەردەدەن.

ئەوەش ئەم تێکەڵانەن (أمشاج) کەوا دەردەکەوێ قورئان لەبارەیانەوە دەدوێ.

بەڵکو لێرەدا زیاتر لەمەش هەیە: ئەگەر قورئان لەبارەی شلەیەکی پیتێنەر کە لە توخمی جیاجیا پێکدێ دەدوێ، ئەوا سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە وەچەی مرۆڤ بە هۆی شتێکەوە کە دەکرێ لەم شلەیەی دەربێنین بەردەوامی هەیە. ئەمەش واتای ئایەتی ٨ی سورەتی (السجده)یە:

﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ (٨)﴾

سلالە: وشەکە واتای (شتێکی دەرهێنراو یان لە شتێکی تر دەرهاتووە) دەگەیەنێ، یان (باشترین و جوانترین بەشی شتێك). شێوازی تەفسیرەکە هەر چۆنێك بێت مەبەستەکە بریتییە لە بەشێك لە گشت.

ئەوەی دەبێتە هۆی پیتاندنی هێلکۆکە و زاوزێ دەستەبەر دەکات بریتییە لە خانەیەکی زۆر درێژ کە درێژییەکەی بە پێوەری ١: ١٠,٠٠٠ ملم دەپێورێ. یەك توخمی نێو دەیان ملیۆن کە لە دۆخێکی ئاساییدا لە پیاوێکەوە دەردەچێ دەتوانێ بچێتە ناو هێلکۆکەوە((دەکرێ بخەملێنین کە لە دۆخێکی ئاساییدا لە ١سم سێجای تۆواودا ٢٥ ملیۆن سپێرم هەیە، ئەوە لە کاتێکدا کە لە هەر ئاوهاتنەوەیەکی پیاودا چەندان سەنتیمەتر سێجا تۆواو هەیە). ژمارەیەك زۆر لە ڕێگا دەمێننەوە و ناتوانن ئەو ڕێگایە ببڕن کە لە (زێ)وە لە ڕێی بۆشایی و

ڤالوبەوە دەگاتە هێلکۆکە. کەواتە بەشێکی زۆر بچووك کە لە تۆواو دەرچووە و پێکهاتەیەکی ئالۆزی هەیە چالاکییەکەی سەرکەوتووانە ئەنجام دەدات.

چۆن واقورماو نەبین لەبەردەم ئەو هاوڕێکی و سازانەی لە نێوان قورئان و زانیاریی زانستیدا هەیە !.

## ٣- لانەکردنی هێلکۆکە لە کۆئەندامی زاوزێی مێینە

هێلکۆکە دوای ئەوەی دەپیتێنرێ دێتە خوارێ بۆ ئەوەی لە بۆشاییی منداڵدان لانە بکات ئەوەش پێی دەگوترێ لانەکردنی هێلکۆکە. قورئان منداڵدان ئەو شوێنەی هێلکۆکە ناودەنێ شوێن.

ئایەتی ٥ی سورەتی (الحج):

﴿وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾

جێگیربوونی هێلکۆکە بە هۆی چەند درێژبوونەوەیەکی ڕاستەقینەوە دێتەدی، هەروەکو تۆوێك کە ڕەگەکانی بچێتە نێو زەوییەوە ئەویش لە دیواری منداڵدانەوە ئەوەی پێویست بێت بۆ گەشەکردنی کۆرپەلە وەری دەگرێت. ئەم درێژبوونەوانە وا لە هێلکۆکە دەکات بە منداڵدانەوە بلکێ..مێژووی زانینی ئەم زانیارییانە بۆ سەردەمی نوێ دەگەڕێتەوە.

قورئان پێنج جار ئاماژە بۆ ئەم پێوەلکان و خۆپێوەهەڵواسینە دەکات: یەکەم جار لە ئایەتی ١و٢ی سورەتی (العلق):

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢)﴾

علق: وشەکە ئاماژە بۆ شتێك دەکات کە هەڵدەواسیٚ(بە شتێکەوە گیردەبیٚ). ئەوە واتای یەکەمە. پەڵەخوێنیش واتایەکە هەر لەم واتایە وەرگیراوە. ئەمە زۆر لە تەفسیرەکان دەبینین بەڵام ئەمە ڕاست نییە و دەبیٚ وریای بین: مرۆڤ هەرگیز بە قۆناغی پەڵەخوێندا تێناپەڕیٚ. هەمان شت بەسەر تەفسیرێکی تردا دەسەپیٚ کە بریتییە لە ((پێوەنووسان)). ئەوە واژەیەکی ناڕاستە. واتای یەکەمی وشەکە واتە شتێك هەڵدەواسیٚ و گیردەبیٚ ئەوا واتایەیە کە تەواو لەگەڵ واقیعی چەسپاوی ئەمرۆدا ڕێك و تەبایە.

قورئان ئەم زانیارییە لە چوار ئایەتی تردا باس دەکات و لەو گۆڕانکارییە یەك لە دوای یەکانە دەدویٚ کە سەرەتا لە دڵۆپە تۆواوێکەوە دەست پیٚ دەکات تا کۆتاییی سکپڕی.

ئایەتی ٥ی سورەتی (الحج):

﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾

ئایەتی ١٤ی سورەتی (المؤمنون):

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾

ئایەتی ٦٧ی سورەتی (غافر):

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾

ئایەتەکانی ٣٧و٣٨ی سورەتی (القیامة):

﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى (٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى (٣٨)﴾

ئەو ئەندامەی سکپڕی پێ دەبێت قورئان بە وشەیەکی عەرەبی وەسفی دەکات کە ئەمڕۆ ئاماژەیە بۆ منداڵدان هەروەك بینیمان. لە هەندێ ئایەتیش ناوی دەنێت (قرار)..(ئایەتی ١٣ی سورەتی المؤمنون و ئایەتی ٢١ سورەتی المرسلات)..

## ٤- گەشەکردنی کۆرپەلە لە منداڵداندا

گەشەکردنی کۆرپەلە لە منداڵدان هەروەکو قورئان باسی دەکات تەواو هاوڕێك و تەبایە لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە لەبارەی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەوە دەیزانین، ئەم وەسفەش هیچ قسەیەکی وەهای تێدا نییە کە زانستی نوێ بتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێ.

کاتێ قورئان دەڵێ کۆرپەلە دوای قۆناغی پێوەلکان بە قۆناغی (گۆشتپارە — مضغة)دا دەڕوات پاشان دوای ئەوە پێکهاتەی ئێسکیی داپۆشراو بە گۆشت دەردەکەوێ...ئایەتی ١٤ی سورەتی (المؤمنون):

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾

المضغة: ئاماژەیە بۆ شتێك کە وەك پشکە گۆشتێك وایە، گۆشتەکە واتا گۆشتێکی تازە و گەش. ئەم جیاکردنەوەیە پێویستی بە ئاوڕلێدانەوە هەیە. کۆرپەلە لە قۆناغی یەکەمی گەشەکردنیدا بارستەیەکی گچکەیە وەکو پشکە گۆشتێك دێتە بەرچاو. پەیکەری ئێسك لەناو ئەم بارستەیەدا گەشە دەکات. دوای ئەوەی ئێسکەکان دروست بوون بە ماسولکە دادەپۆشرێن: ماسولکە لەگەڵ وشەی گۆشت دەسازێ.

زانراوە کە هەندێ بەش لە میانەی ماوەی گەشەکردنی کۆرپەلەدا وەها دێتە بەرچاو کە لەگەڵ ئەو شێوەیەی مرۆڤ لە دوارۆژ وەریدەگرێ نەگونجاوە، لە کاتێکدا هەندێ بەشی تر هاوگونجاوی یەکترن.

ئەوەش واتای وشەی (مخلق)ە کە بە واتای دروستکراو بە رێژە دەگەیەنێ. ئایەتی ٥ی سورەتی (الحج):

﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾

هەروەها قورئان باس لە دەرکەوتنی هەستەکان و هەناویش دەکات:

ئایەتی ٩ی سورەتی (السجدة):

﴿وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ﴾

هەروەها ئاماژە بۆ دروستبوونی(ڕەگەز)یش دەکات:

ئایەتی ٤٥و٤٦ی سورەتی (النجم):

﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى (٤٥) مِنْ نُطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى (٤٦)﴾

هەروەها ئایەتی ١١ی سورەتی (فاطر) و ئایەتی ٣٩ی سورەتی (القیامة) باس لە دروستبوونی ڕەگەز دەکەن.

هەروەکو گوتمان دەبێ هەموو ئەم وتانەی قورئان لەگەڵ ئەو زانیارییانەی بەراورد بکرێن کە لە سەردەمی نوێدا ساغ بوونەتەوە، ڕێککەوتنی وتەکانی قورئان لەگەڵ زانیارییە نوێیەکان ڕوون دەبێتەوە، بەڵام ئەوەش گرینگە کە بەراورد بکرێن بە باوەڕی گشتی کە لەم بارەوە لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان باو بووە

تاوەکو تێ بگەین کە هاوسەردەمانی ئەو ماوەیە تا چ ڕادەیەك لە هەبوونی ئەو زانیارییانەی قورئان لەبارەی ئەم پرسانەوە دەیانخاتەڕوو دووربوونە. کەمترین گومانی تێدا نییە کە ئەو هاوسەردەمانە لەو سەردەمەدا تەفسیری ئەو سروشەیان نەزانیوە وەك ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە دەیزانین، ئەوەش چونکە پێدراوەکانی زانیاریی نوێ بۆ تەفسیرکردنی کۆمەکیمان دەکات. لە ڕاستیدا پسپۆڕان لەبارەی ئەم پرسانەوە تا ڕادەیەك تاوەکو سەدەی نۆزدەم زانیارییەکی ڕوونیان نەبوو.

بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست ئەفسانە و بیروبۆچوونی تیۆری کە هیچ بنەمایەکیان نەبوو ڕێسای باوەڕە جیاوازەکانی ئەم بابەتە بوون، بەڵکو چەندان سەدە دوای سەدەکانی ناوەڕاستیش هەر بەردەوامییان هەبوو.

قۆناغی یەکلاکەرەوە لە مێژووی کۆرپەلەزانی بە قسەیەکی هارڤی دەستی پێکرد کە لە ساڵی ١٦٥١ گوتی کە هەر شتێکی زیندوو یەکەم جار لە هێلکۆکەوە دێت و، کۆرپەلەش پلە پلە و بەش بەش دوای بەش دروست دەبێ، لەم سەردەمەدا زانستی تازە لەم بابەتەدا سوودی زۆری گەیاند ئەویش بە داهێنانی وردبین کە بە ماوەیەکی لە سەردەمی پێشوو داهێنرا بوو، وێڕای ئەوەش مشتومڕ لەبارەی ڕۆڵی هەر یەکە لە هێلکۆکە و تۆواو گەرم بوو. (بوفون) زانای گەورەی سروشتییەکان سەر بە لایەنگرانی بیرۆکەی هێلکۆکە بوو. هەروەها لەنێویاندا (بۆنیت) هەبوو کە داکۆکی دەکرد لە تیۆری تێکەڵاوبوونی تۆوەکان، ئەو تیۆرە دەڵێ: هێلکەدانی مێینە یان ڕەگەزی مرۆڤ تۆوی هەموو بوونەوەرە مرۆییەکانی تێدا بووە و چوونەتە نێو یەکترەوە. ئەم گریمانەیە لە سەدەی هەژدە هەندێ لایەنگری کرا.

قورئان زیاتر لە هەزار ساڵ بەر لەم سەردەمە کە باوەڕە وەهمییەکان باو بوو خەڵکی فێرکرد، وتەکانی قورئان لەبارەی زاوزێی مرۆڤەوە بە چەند واژەیەکی

سادە گوزارشت لە چەند ڕاستییەکی سەرەتایی دەکات کە بۆ زانینی سەدان ساڵ خەرج کرا.

## قورئان و پەروەردەی سێکسی:

سەردەمی ئێستامان پێی وایە کە لە هەموو بوارەکاندا دۆزینەوەی زۆری ئەنجام داوە. وا گومان دەبات کە لەبارەی پەروەردەی سێکسییەوە شتی نوێی پێشکەش کردووە و کردنەوەی دەرگاکان بۆ لاوان تا گرفتەکانی ژیان بزانن لە دەسکەوتەکانی سەردەمی نوێیە و سەدەکانی پێشوو سەبارەت بەم بابەتانە تاریکاییەکی نووتەك بووە و زۆرێکیش دەڵێن ئایینەکان بێ دیاریکردن لەمە بەرپرسن.

بەڵام هەموو ئەمانەی خستمانەڕوو بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە لەوەتەی چواردە سەدە لەمەوبەرەوە چەندان پرسی تیۆری لەبارەی زاوزێی مرۆڤەوە بۆ زانیاریی خەڵك خراوەتەڕوو ئەوەش بە پێی توانا چونکە زانیاریی توێکاری و فسیۆلۆجی نەبووە کە ڕێ بدات بە تێروتەسەلی باس لەم بابەتانە بکرێ. بەکارهێنانی زمانێکی سادە بۆ ئەوەی گوێگرانی پەیامەکە تێی بگەن پێویست بوو تاوەکو لەوە بگەن کە دەوترێ.

پەیامەکە لایەنە کردەنییەکانیشی فەرامۆش نەکردووە. ئێمە لە قورئاندا سەبارەت بە ژیانی کردەیی و تایبەت بە ڕەوتاری سێکسی کە پێویستە خەڵك پەیڕەوی بکەن لە هەموو دۆخێکی ژیانیاندا وردەکارییەکی زۆر دەبینین. قورئان ژیانی سێکسی پشتگوێ نەخستووە. دوو ئایەتی قورئان هەیە تایبەت بە ژیانی

سێکسی. قورئان ئەمە بە واژەگەلێك باس دەکات کە وردەکاری و شەرمی پێویست بۆ ئەم بابەتە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. کاتێ سەیری تەفسیری ئەم دوو ئایەتە دەکەین یەکەم شت کە سەرنج ڕادەکێشێ جیاوازیی نێوانیانە.

لە بەردەم تەفسیری ئەم دوو ئایەتەدا زۆر ڕاڕا بووم و قەرزاری ئەو تەفسیرەی (د.عەبدولکەریم جیرو)ی ئوستازی پێشووی کۆلیژی پزیشکیی بەیروتم کە ئێستا دەیخەمەڕوو.

ئایەتی ٦و٧ی سورەتی (الطارق):

﴿خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ (٦) يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ (٧)﴾

دەقەکەی قورئان ئاماژە بۆ شوێنی سێکسیی پیاو بە وشەی (صلب) دەکات، بەڵام بۆ شوێنی سێکسیی ژن لە وشەی (الترائب) کە وشەیەکی کۆیە ئاماژەی بۆ دەکات.

ئەم تەفسیرە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو تەفسیرەی نووسەرە فەڕەنسی و ئینگلیزییەکان دەیدەن کە دەڵێن: ((مرۆڤ لە شلەیەکی بڵاو دروست بووە کە لە نێوان بڕبڕەی پشت و ئێسکەکانی سینگەوە دێتە دەرێ.)). ئەم تەفسیرە بە شێوەیەکی تەواو مایەی تێگەیشتن نییە.

دەستەواژە قورئانییەکان ئاماژە دەکەن بۆ ڕەفتاری پیاوان لە پەیوەندیی کاریگەریان لەگەڵ ژنەکانیان لە دۆخی جیاوازدا.

یەکەم جار ڕێنمایی هەیە بۆ ڕەوتاری پێویست لە ماوەی بێنوێژیدا، هەردوو ئایەتی ٢٢٢ و ٢٢٣ ی سورەتی (البقرة) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات:

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ (٢٢٢) نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا لِأَنْفُسِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ مُلَاقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ (٢٢٣)﴾

سەرەتای ئەم دەستەواژەیە واتایەکی تەواو ڕوونی هەیە: حەرامکردنی پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ژنێکی حەیزدار مەسەلەیەکی بڕاوەتەوە. بەشی دووەمی ئاماژە بۆ ئەو کێڵگەیە دەکات کە هێشتا تۆوی پێوە نەکراوە. کەواتە دەستەواژەکە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و بە وێنەیەکی مەجازی جەخت لە ئەو گرینگییە دەکاتەوە کە پێویستە لای مرۆڤ ڕوون بێت کە ئامانجی کۆتایی پەیوەندیی سێکسی بریتییە لە منداڵ خستنەوە، ڕستەی کۆتایی ئامۆژگارییەکی تێدایە وا دەردەکەوێ کە تایبەتە بە پێشەکییەکانی پەیوەندیی سێکسی.

ڕێنماییەکانی ئێرە خاوەن مۆرکێکی گشتیین — بە بۆنەی ئەم ئایەتانەوە هەندێ کەس لەبارەی گرفتی ڕێگرتن لە سکپڕی دەپرسن: قورئان نە لێرە و نە لە هیچ شوێنێکی تر ئاماژەیەکی بۆ ئەوە تێدا نییە. هەروەها لە قورئاندا هیچ ئاماژەیەك بۆ لەباربردن نییە، بەڵام زۆرێك لەو دەستەواژانەی پێشتر لەبارەی گۆڕانکارییە یەك لە دوای یەکەکانی کۆرپەلە باس کران تەواو ڕوونن کە مرۆڤ سەرەتای دروستبوونی بە قۆناغێك دەست پێ دەکات کە وەك (العلقة)یەك وایە، کەواتە لەم دۆخەدا ڕێزگرتنی کەسی مرۆڤ خۆی دەسەپێنێ، ئەم ڕێزگرتنەی قورئان زۆر جەختی لێ دەکاتەوە ڕیشەییانە سەرکۆنەکردنی لەباربردنە. ئەم هەڵوێستەش هەڵوێستی هەموو ئایینەکانی یەکتاپەرستییە لەم سەردەمەی

لە مانگی ڕەمەزاندا تەنها لە شەودا و لە کاتی بێ ڕۆژووییدا ڕێ بە پەیوەندیی سێکسی دراوە. ئایەتی تایبەت بە مانگی ڕەمەزانیش بریتییە لە: ئایەتی ١٨٧ی سوڕەتی (البقرة):

﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ﴾

بە پێچەوانەی ئەوەوە، بۆ حاجییانی لە کاتی ڕۆژە ڕەسمییەکانی حەجدا هیچ هەلاواردنێك نییە. ئایەتی ١٩٧ی سوڕەتی (البقرة):

﴿فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾

کەواتە حەرامکردنەکە یەکلاکەرەوەیە هەروەك حەرامکردنی ڕاو و شەڕ و هیتر لەم ماوەیەدا.

بە بۆنەی تەلاقەوە قورئان جارێکی تر ئاماژە بۆ بێنوێژی دەکات: ئایەتی ٤ی سوڕەتی (الطلاق):

﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾

ئەو ماوەیەی کە لێرەدا ئاماژەی بۆ کراوە بریتییە لەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان ڕاگەیاندنی تەلاق تا ئەو کاتەی دەبێتە ڕاستی. ئەو ژنانەشی قورئان لەبارەیانەوە دەڵێ لە بێنوێژی بێهیوا بوون مەبەست لێیان ئەوانەن کە گەیشتوونەتە تەمەنی بێئومێدی واتە بە هۆی بە تەمەنداچوونەوە حەیزیان

نەماوە. قورئان وەکو خۆپارێزییەك ماوەی سێ مانگی بۆ داناون. دوای ئەو ماوەیە ئەو ژنانە تەڵاقدراوانەی بێنوێژییان نەماوە شوو بکەنەوە.

سەبارەت بەم ژنانەش کە هێشتا بێنوێژ نەبوون یان سکپڕن تەڵاقی ڕاستی تەنها دوای دانانی سکەکەیان دەبێ.

هەموو ئەم یاسایانە لەگەڵ پێدراوە فسیۆلۆجییەکان تەواو ڕێك و تەبایە. زێدەباری ئەمە دەتوانین لە قورئاندا لە دەقگەلێکی تایبەت بە بێوەژنبوون هەمان بڕیاری یاسایی دروست ببینین.

بە پێی هەموو ئەم وتە تیۆرییانەی تایبەت بوون بە زاوزێ و ئاراستەی کردەیی کە قورئان سەبارەت بە ژیانی سێکسیی ژن و مێردەکان دایدەڕێژێ تێبینی ئەوە دەکەین کە هیچ یەکێك لەم وتانەی هێنامان لەگەڵ پێدراوەکانی زانیارییە نوێیەکان و دەرەنجامەکانی ناکۆکی نییە.

## چاوپێداخشاندنێکی گشتی

خوێنەری قورئان ژمارەیەك گرینگ لەو بابەتانە دەبینێ کە تەورات خستوونیەتەڕوو. بابەتەکان بەر لە هەموو شتێك ڕیوایەت و گێڕانەوەی تایبەت بە پێغەمبەران و پاشایانی ئیسرائیلن: نوح و ئیبراهیم و ئیلیا و یونس و ئەییووب و موسا و تالوت و داوود و سولەیمان، تەنها باس لە ڕیوایەتە سەرەکییە هاوبەشەکان دەکەین و ئەوانەی تەنها ئاماژەیەکی ڕاگوزەریان پێکراوە پشتگوێ دەخەین: پاشان دوای ئەوە بە شێوەیەکی نەوعی ڕیوایەتەکانی تایبەت بە ڕووداوە گەورەکان باس دەکەین: بۆ نموونە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و دروستکردنی مرۆڤ و لافاوەکە و دەرچوونی موسا. پاشان لە کۆتاییدا ئەوەی پەیوەندی هەیە بە مەسیح و دایکی، ئەوەش لە چوارچێوەی پەیمانی نوێدا(ئینجیل).

## بەراوردکردنێك لە نێوان قورئان و ئینجیلەکان و زانیارییە نوێیەکان

سەبارەت بە پێکگرتنی نێوان قورئان و ئینجیلەکان یەکەمجار دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە هیچ بابەتێك لە بابەتەکانی ئینجیلەکان نییە کە لە ڕوانگەی زانستییەوە ڕەخنەی وروژاندبێت لە قورئاندا نەبێت — لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێیدا.

مەسیح لە قورئاندا بابەتی گەلێك ئاماژەیە. بۆ نموونە: ڕاگەیاندنی لەدایکبوونی مەریەم بۆ باوکی، ڕاگەیاندنی پەرجووی لەدایکبوونی مەسیح بۆ مەریەم، سروشتی مەسیح کە پێغەمبەرێکە شوێنی یەکەم لەنێو پێغەمبەراندا دەگرێ، سیفەتی وەکو

مەسیح، ئەو نیگایەی پێی مرۆڤی ئاراستە کرد و پاڵپشت و هەموارکاری تەوراتیش بوو، مژدەدان و قوتابییەکانی و پەرجووەکانی و هەڵکشانی دواجاری بۆ لای خودا و ڕۆڵی لە ڕۆژی دوایی و ...هتد..

سورەتی (ال عمران) و سورەتی (مریم) برگەگەلێکی درێژیان بۆ خێزانی مەسیح تەرخان کردووە. ئەم دوو سورەتە لەدایکبوونی مەریەم دایکی مەسیح، تەمەنی منداڵی، بوونی بەدایك بە شێوەیەکی یاسابەدەر دەگێڕنەوە. مەسیح هەمیشە لە قورئان بە(کوڕی مەریەم) ناو دەبرێ. قورئان بە شێوەیەکی بنجیبیانە نەژادی مەسیح دەباتەوە سەر دایکی، ئەوەش شتێکی تەواو لۆژیکییە چونکە مەسیح هیچ باوکێکی بایۆلۆجی نییە.

قورئان لە میانەی نەژادی دایکییەوە، مەسیح دەخاتە نێو زنجیرەی نوح و ئیبراهیم و باوکی مەریەم(کە لە قورئاندا بە عمران ناودەبرێ).

ئایەتی ٣٣و٣٤ی سورەتی (ال عمران):

﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ (٣٣) ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (٣٤)﴾

کەواتە مەسیح نەوەی نوح و ئیبراهیمە لە دایکی مەریەم و باوکی عیمرانەوە. خوێنەری قورئان هیچ هەڵەیەك لە ناوەکان نابینێ وەکو ئەوەی لە ئینجیلەکان دەیبینێ، مەبەستمان لە هەڵەکانی تایبەت بە پێشینانی مەسیح و دەسکاریکردنی ڕەچەڵەکەکانە لە پەیمانی کۆن(تەورات) کە لە بەشی یەکەم و دووەمی ئەم کتێبەدا توێژیمانەوە.

جارێکی تر بابەتیبوون وا دەکات ئاماژە بکەین بە بانگەشەی ئەوانەی بێ هیچ بنەمایەك دەڵێن گوایە موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) دانەری قورئانە و زۆر شتی لە تەورات وەرگرتووە. ئەگەر ئەوە ڕاست بێت دەپرسین چ شتێك پاڵی پێوەنا یان ئەو بەڵگەیە چ بوو کە قەناعەتی پێ هێنا واز لە گواستنەوەی زانیارییەکانی تەورات لەبارەی پێشینانی مەسیحەوە بێنێ و لە قورئاندا ڕاستکردنەوە بۆ ئەو زانیارییانە بە جۆرێك بکات کە زانیارییە نوێیەکان نەتوانن بیکەنە ئامانجی تیری ڕەخنەکانیان لە کاتێکدا دەقەکانی ئینجیلەکان و تەورات بە هیچ جۆرێك لەم ڕوانگەیەوە پەسندکراو نییە؟

## پێکگرتنێك لە نێوان قورئان و تەورات و زانیارییە نوێیەکان

لێرەدا هەندێ لایەنی تایبەت بەم پێکگرتنە تایبەت بە تەورات باسمان لێوە کردووە. بۆ نموونە لە توێژینەوەیەکی ڕەخنەییانەی بەشی تایبەت بە تەورات لەم کتێبە باس لە دروستکردنی جیهان کرا، هەروەها ئەم بابەتە لە گێڕانەوەی قورئانیش ئاماژەی پێ کرا. هەندێ بەراوردکاریشمان کرد بۆیە پێویست ناکات بگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتە.

زانیارییە مێژووییە نوێیەکان زۆر تەماوی و لێڵ دیارن و پێدراوەکانی ئارکیۆلۆجیاش(زانستی شوێنەوار) ئەوەندە هەژارە بە جۆرێك ناکرێ لەبەر ڕۆشنایی زانیارییە نوێیەکان سەبارەت بە گرفتەکانی پەیوەست بە پاشاکانی ئیسرائیل بەراوردکاری بکرێ، ئەمانەش بابەتی ڕیوایەتە هاوبەشەکانی نێوان قورئان و تەوراتن.

سەبارەت بە پەیامبەران، ئەم بابەتانە دەکرێ یان ناکرێ بە کۆمەکی پێدراوە نوێیەکان باسیان بکرێ ئەوەندەی ڕووداوە گێڕدراوەکان سوودێکی مێژوویيان هەیە یان نییە، ئەمانەش شوێنەوارێکییان جێهێشتووە کە توانیویانە پێمان بگەن.

لێرەدا دوو بابەت هەیە کە لە نێوان قورئان و تەوراتدا ڕیوایەتی هاوبەش هەیە و شیاوی ئاوڕ لێدانەوەن و شایستەی ئەوەن لەبەر ڕووناکاییی زانیارییەکانی سەردەم توێژینەوەیان لەبارەوە بکرێ. ئەم دوو بابەتەش بریتیین لە:

- لافاوەکە.

- دەرچوونی موسا لە میسر.

یەکەمیان گرینگە چونکە لە مێژووی شارستانێتییەکان ئەو شوێنەوارانەی بەجێ نەهێشتووە کە لە تەوراتدایە، لە کاتێکدا پێدراوە نوێیەکان سەبارەت بە ڕیوایەتی قورئان هیچ ڕەخنەیەك ناوروژێنێ.

دووەمیش بۆیە گرینگە چونکە گێڕانەوەی قورئان و گێڕانەوەی تەورات وەها دەردەکەوێ کە لە هێڵە گشتییەکانیان تەواو و تەواوکاریی یەکتر بن و لەبەرئەوەش وا دەردەکەوێ پێدراوە نوێیەکان پاڵپشتێکی مێژوویی بەرچاو لە هەردووکیان دەکات.

# لافاوەکە

## بەبیرهێنانەوەی گێڕانەوەی تەورات و ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی دەکرێ

لە بەرەنجامی لێکۆڵینەوەی گێڕانەوەی ڕووداوی لافاوەکە بەپێی پەیمانی کۆن (تەورات) لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئەم تێبینیانەی خوارەوە هاتە ئاراوە:

لە تەوراتدا تەنها یەك گێڕانەوە لەبارەی لافاوەکەوە نییە بەڵکو دوو گێڕانەوە هەیە بەڵام لە سەردەمی جیاوازدا نووسراونەتەوە:

– گێڕانەوەی (یەهوی) کە بۆ سەدەی نۆی پێش زایین دەگەڕێتەوە.

– گێڕانەوەی (کەهەنووتی) کە بۆ سەدەی شەشەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، بۆیەش ئەم ناوەی لێنراوە چونکە دانراوی کاهینەکانی ئەو سەردەمەیە.

ئەم دوو گێڕانەوەیە لە پاڵ یەکترەوە نایەن بەڵکو ڕەگەزەکانی یەکێکیان لەگەڵ ئەویتر دەچنە ناو یەك و پێکدا هەڵدەپڕژێن و برگەکانی هەر سەرچاوەیەك لەگەڵ برگەکانی سەرچاوەکەی تر بە ئاڵوگۆڕ بە دوای یەکتردا دێن. کۆمێنتەکانی وەرگێڕانی بەشی (التكوين)ی باوکە دیڤۆ مامۆستا لە قوتابخانەی کتێبی پیرۆز لە قودس بەباشی ئاماژە بۆ ئەم دابەشکارییەی برگەکان لەنێوان دوو سەرچاوەکە دەکات: گێڕانەوەکە بە بیرۆکەیەکی یەهوی دەست پێ دەکات و کۆتایی دێت: لێرەدا بە تێکڕایی ١٠ برگەی یەهوی هەیە، لەنێوان هەر دوو برگەیەکدا برگەیەکی دەقی کەهەنووتی هەیە(واتە بە تێکڕا ٩ برگەی کەهەنووتی). ئەم برگانە فرە بنچینەن و ڕوونیش نین مەگەر تەنها لە ڕووی بەدوای یەکداهاتنی ڕووداوەکان، لە

نێوان دوو دەقدا ناسازی و ناتەبایی زەق هەیە. باوکە دیڤۆ دەڵێ: ((ئەوان دوو گێڕانەوەی لافاوەکەن کە تێیدا هۆکارەکانی ڕوودانی لافاوەکە لە یەکتر جیاوازن، هەروەکو زەمەنی ڕوودانی جودایە و ژمارەی ئەو گیانلەبەرانەش کە نوح لە کەشتییەکەیدا بارکردوون هەر لە یەکتر جیاوازن.)).

گێڕانەوەی لافاوەکە لە تەورات لە چوارچێوە گشتییەکەیدا پەسندکراو نییە و ئەوەش لەبەر ڕۆشنایی زانیارییە نوێیەکان دوو هۆکاری هەیە:

(أ) تەورات مۆرکێکی جیهانییانە دەداتە لافاوەکە.

(ب) لە کاتێکدا برگەکانی سەرچاوەی یەهوی هیچ مێژوویەك بۆ لافاوەکە نادات بە دەستەوە، کەچی گێڕانەوەی کەهەنووتی کاتی لافاوەکە بە سەردەمێك دیاری دەکات کە مومکین نەبووە کارەساتێکی لەم جۆرەی تێدا ڕووبدات.

بەڵگەکانی ئەم حوکمە ئەمانەن:

گێڕانەوەی کەهەنووتی وەها دیاری دەکات کە کاتێ لافاوەکە ڕووی داوە تەمەنی نوح ٦٠٠ ساڵ بووە. بەڵام ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە بە پێی ئەو ڕەچەڵەکانەی لە ئیصحاحی پێنجەمی بەشی التكوين باس کراوە نوح ١٠٥٦ ساڵ دوای ئادەم لە دایك بووە(ژێدەری ئەم ڕەچەڵەکانەش هەر کەهەنووتییە و لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان لێوە کرد.). لەوەشەوە بەرەنجامی ئەوە دەستگیردەبێ کە لافاوەکە ١٦٥٦ ساڵ دوای خوڵقاندنی ئادەم قەوماوە. لە لایەکی ترەوە خشتەی ڕەچەڵەکی ئیبراهیم کە بەشی التكوين (١١، ١٠ — ٣٢) بەپێی هەمان سەرچاوە دەیخاتەڕوو ڕێ دەدات بەوەی لەدایکبوونی ئیبراهیم بە ٢٩٢ ساڵ لە دوای لافاوەکە بخەملێنین، لەبەرئەوەی دەزانین کە ئیبراهیم لە

دەوروبەری ١٨٥٠ ساڵ پێش زایین ژیاوە کەواتە کاتی لافاوەکە بەپێی تەورات بە ٢١ یان ٢٢ سەدە پێش مەسیح دیاری دەکرێ. ئەم حیسابە بەوپەڕی وردییەوە لەگەڵ ئاماژەکانی نووسراوە کۆنەکانی تەورات یەکدەگرێتەوە کە ئەو دیاریکردنە مێژووییە زنجیرەییانە شوێنێکی باش بەر لە دەقی تەورات داگیردەکەن، ئەوەش لە سەردەمێکدا بوو کە پێویستیی بۆ زانیارییەکانی مرۆییەکان لەم بابەتەوە وای دەکرد پێدراوەکانی ئەم زنجیرە مێژووییەی ڕووداوەکان لای خوێنەرەکانی بێ هیچ مشتومڕێك پەسندکراو بێت – بە جۆرێك کە لەوێدا هیچ دژە بەڵگەیەك نەبوو.((لەوەتەی پسپۆڕان هەندێ زانیارییان لەبارەی زنجیرەی ڕووداوەکان لە سەردەمی کۆندا دەست کەوتووە و ئەم ساڵە وەهمییانەی نووسەرە کەهەنووتییەکانی تەورات جێی متمانە نەماوە بەرپرسان بەخێرایی لە کتێبەکانی تەوراتیان سڕیونەتەوە.)).

ئەمڕۆ چۆن دەتوانین وێنای ئەوە بکەین کە لە سەدەی ٢١ یان ٢٢ی پێش زایین کارەساتێکی جیهانییانە ژیانی لەسەر ڕووی زەوی سڕیوەتەوە (بێجگە لە سەرنشینانی کەشتییەکە).؟ لەو سەردەمەدا لە چەند شوێنێکی زەویدا شارستانێتیی گەشەکردوو هەبوون و شوێنەوارییان گەیشتبووە نەوەکانی دواتر. بۆنموونە، بە نیسبەت میسرەوە، لە ماوەی ناوەندا بوو کە لە دوای کۆتاییهاتنی دەوڵەتی کۆن و سەرەتای دەوڵەتی ناوەڕاست بوو. بە ڕوانین لەم زانیارییانەی لەبارەی مێژوو ئەم سەردەمەوە هەمانە ئەوا ئەو قسەیە مایەی پێکەنینە کە بوترێ لافاوەکە لەو سەردەمەدا هەموو شارستانێتییەکانی لەناوبردووە.

بەم پێیە و لە ڕوانگەی مێژووییەوە دەتوانرێ لەوە دڵنیا بین کە گێڕانەوەی لافاوەکە بەو شێوەیەی تەورات پێشکەشی دەکات بە شێوەیەکی لەگەڵ زانیارییە

نوێیەکان ناکۆکە. بوونی دوو گێڕانەوە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤەکان دەسکاریی کتێبە پیرۆزەکانیان کردووە.

## گێڕانەوەی لافاوەکە لە قورئاندا

قورئان گێڕانەوەیەکی گشتگیری جیاواز دەخاتەڕوو و لە ڕوانگەی مێژووییشەوە هیچ ڕەخنەیەك ناورووژێنێ.

قورئان لەبارەی لافاوەکەوە گێڕانەوەیەکی بەردەوام و یەکپارچە پێشکەش ناکات. چەندان سورەت هەن باس لەو سزایە دەکەن کە بە سەر گەلی نوحدا هات. بەڵام لە هەموو گێڕانەوەکان تێروتەسەلتر لە سورەتی (هود)دایە لە ئایەتەکانی ٢٥ بۆ ٤٩.. سورەتی (نوح)یش بە شێوەیەکی تایبەت باس لە ئامۆژگاریی نوح بۆ گەلەکەی دەکات، ئایەتەکانی ١٠٥ بۆ ١١٥ی سورەتی (الشعراء)یش هەر هەمان بابەت دووپات دەکاتەوە.

لە کاتێکدا تەورات باس لە لافاوێکی جیهانی دەکات بۆ سزادادانی سەرجەم مرۆڤایەتیی بێباوەڕ، قورئان بە پێچەوانەوە ئاماژە بۆ چەندان سزا دەکات کە داباریوەتە سەر گروپگەلی دیاریکراو.

ئایەتەکانی ٣٥ بۆ ٣٩ سورەتی (الفرقان) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن:

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيرًا (٣٥) فَقُلْنَا اذْهَبَا إِلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَدَمَّرْنَاهُمْ تَدْمِيرًا (٣٦) وَقَوْمَ نُوحٍ لَمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ أَغْرَقْنَاهُمْ وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ آيَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا (٣٧) وَعَادًا وَثَمُودَ

وَأَصْحَابَ الرَّسِّ وَقُرُونًا بَيْنَ ذَلِكَ كَثِيرًا (٣٨) وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ الْأَمْثَالَ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا (٣٩)﴾

بەڵام ئایەتەکانی ٥٩ بۆ ٩٣ی سورەتی (الاعراف) باس لەو سزایانە دەکات کە دووچاری گەلەکانی (نوح و عاد و سەمود و سەدوم و مەدیەن) بووە.

بەم پێیە قورئان کارەساتی لافاوەکە وەکو سزایەك کە بە شێوەیەکی تایبەت بەسەر نەتەوەی نوحدا هاتووە دەخاتەڕوو: ئەمەش یەکەم جیاوازیی بنەڕەتی نێوان هەر دوو گێڕانەوەکەیە.

بەڵام جیاوازیی جەوهەریی دووەم بریتییە لەوەی کە قورئان بە پێچەوانەی تەوراتەوە زەمەنی لافاوەکە دیاری ناکات و هیچ ئاماژەیەکیش لەبارەی ماوەی کارەساتەکە بە دەستەوە نادات.

بەڵام هۆکارەکانی لافاوەکە لە هەر دوو گێڕانەوەدا لە یەکەوە نزیکە. گێڕانەوەی کەهەنووتی تەورات (التکوین ٧ ، ١١) باس لە دوو هۆکار دەکات و دەڵێ: ((لەو ڕۆژەدا کانیاوەکان لە کەلێنێکی قووڵەوە هەڵقوڵان و هەورەکانی ئاسمانیش کرانەوە)). بەڵام قورئان لە دوو ئایەتی ١١و١٢ی سورەتی (القمر) ئەمە دیاری دەکات:

﴿فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ (١١) وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ (١٢)﴾

قورئان بە شێوەیەکی ئاشکرا ناوەڕۆکی کەشتییەکە و ئەوەی تێیدایە دیاری دەکات. خودا فەرمانی بە نوح کرد لە کەشتییەکەدا هەموو ئەوانە دابنێ کە دوای لافاوەکە دەژین و نوحیش ئەم فەرمانەی بە ئەمانەتەوە جێبەجێ کرد.

ئایەتی ٤٠ی سورەتی (هود):

﴿احْمِلْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ (٤٠)﴾

مەبەست لە (من سبق عليه القول) واتە ئەو کەسەی لە خێزانەکە دوورخراوەتەوە کە کوڕە نەفرەتلێکراوەکەی نوحە، ئایەتی ٤٥ و ٤٦ی هەمان سورەت پێمان دەڵێ کە لاڵانەوەی نوح لە خودا هیچ لە مەسەلەکەی نەگۆڕی. قورئان ئاماژە بۆ ئەوانەی سەر کەشتییەکە دەکات کە جگە لە خاوخێزانی نوح ژمارەیەکی کەمی ئیمانداران بوون.

تەورات ئاماژە بەوانە لە نێوان سەرنشینانی کەشتییەکە ناکات. لە ڕاستیدا تەورات لەبارەی ناوەڕۆکی کەشتییەکەوە سێ ڕیوایەت دەخاتەڕوو:

- بە پێی ریوایەتی کەهەنووتی: نوح و خێزانەکەی بێ هیچ هاوێرێك، لە هەر جۆرێکیش جووتێك.

- بە پێی ریوایەتی یەهودی: جیاکارییەك هەیە لە لایەك لە نێوان گیانلەبەرە پاکەکان و باڵندەکان، لە لایەکی ترەوە لەنێوان گیانلەبەر پیسەکان (کەشتییەکە حەوت جووتی لە جۆری یەکەم تێدابووە، نێر و مێ، لە جۆری دووەمیش تەنها یەك جووت).

- بەپێی ریوایەتە دەسکاریکراوەکانی یەهوی (التكوين ٧,٨): جووتێك لە هەر جۆرێکی پاك و پیس.

بەڵام گێڕانەوەی فیعلی لافاوەکە کە لە ئایەتەکانی ٤١ بۆ ٤٩ی سورەتی (هود) و ئایەتەکانی ٢٣ بۆ ٣٠ سورەتی (المؤمنون) و گێڕانەوەی تەوراتدایە جیاوازییەکی ئەوتۆ کە دەلالەتێکی تایبەتی هەبێ ناخەنە ڕوو:

تەورات دەڵێ ئەو شوێنەی کەشتییەکە لەنگەری لێ گرت چیای ئارارات بوو، بەڵام قورئان دەڵێ چیای جودی بوو (ئایەتی ٤٤ی سورەتی هود). ئەم چیایەش بریتییە لە لوتکە چیاکانی ئارارات لە ئەرمینیا (باکوری ئێستای کوردستان ـ و.کوردی)، بەڵام هیچ شتێك نییە بیسەلمێنێ کە مرۆڤ بۆ ئەوەی سازان لەنێوان دوو ڕیوایەتەکە چێ بکەن دەسکاری ناوەکانیان نەکردووە. (ر.بلاشیر) جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە: بە ڕای ئەم نووسەرە بارستەیەکی چیایی بەم ناوە لە دوورگەی عەرەبی هەیە. بەڵام ڕەنگە ڕێککەوتنی ناوەکان کارێکی دروستکراو بێت.

لە کۆتاییدا، جیاوازی لە نێوان ڕیوایەتەکانی قورئان و ڕیوایەتەکانی تەوراتدا هەیە و گرینگیشن. هەندێ لەم جیاوازییانە لە هەر پشکنینێکی ڕەخنەکارانە ڕزگاریان دەبێ چونکە لەوێدا پێدراوە بابەتییەکان بزرن. بەڵام ئەگەر لە توانادا هەبوو لێکۆڵینەوە و دڵنیایی لە پێدراوەکانی کتێبە پیرۆزەکان بکرێ ئەوەش بە هاوکاریی پێدراوی دڵنیاوە ئەوا تەواو ڕوون دەبێتەوە کە ڕیوایەتی تەورات لەبارەی لافاوەکەوە لە ڕووی کات و ماوەوە لەگەڵ دەسکەوتەکانی زانیاریی نوێدا وێك نایەتەوە.

بە پێچەوانەی ئەوەوە، ڕوون دەبێتەوە کە ڕیوایەتی قورئان لە هەر ڕەگەزێك خاڵییە کە ببێتە مایەی ڕەخنەی بابەتییانە. لە سەردەمی ڕیوایەتی تەوراتەوە تا

سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان ئایا خەڵك زانیاریگەلێکی وایان دەست کەوتووە کە ڕووناکاییەك بخاتە سەر ڕووداوێکی وەکو ئەمە؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر، لە پەیمانی کۆنەوە تا قورئان تاکە بەڵگەنامە کە لەبەر دەستی خەڵکدا بووە لەبارەی ئەم چیرۆکە کۆنەوە تەنها و بە دیاریکراوی تەورات بووە. ئەگەر هۆکارە مرۆییەکان نەتوانێ ئەو گۆڕانکارییان ڕاڤە بکات کە بە سەر ڕیوایەتەکاندا هاتووە بۆ ئەوەی لەگەڵ زانیارییە نوێیەکانی بسازێنێ ئەوا دەبێ ڕاڤەیەکی تر پەسند بکەین ئەویش ئەوەیە کە کتێبێکی تر هەیە لە لایەن خوداوە لە دوای تەوراتەوە نێردراوە.

## دەرچوونی موسا لە میسر

لەگەڵ دەرچوونی موسا لە میسر کە بریتییە لە قۆناغی یەکەم بەرەو جێگیربوون لە خاکی کەنعان ڕووبەڕووی ڕووداوێکی گەورەی گرینگ دەبینەوە، ڕووداوێکی مێژوویی حاشاهەڵنەگر، وێڕای ئەوەی بانگەشەگەلێك لێرە و لەوێ دەبینین کە دەیەوێ دارشتەیەکی ئەفسانەیی بەم ڕووداوە ببەخشێ بەڵام ڕووداوەکە دەچێتە نێو سیاقێکی زانراو و ناسراوەوە.

گێڕانەوەی دەرچوونی موسا لە میسر لە پەیمانی کۆن لەگەڵ گێڕانەوەی ڕۆیشتن لە بیابان دوای دەرچوونەکە و گێڕانەوەی ئەو هاوپەیمانێتییەی خودا لە چیای سینا بەرپای دەکات، ئەم سێ گێڕانەوەیە کتێبی دووەمی تەورات یان پێنج بەشەکەی موسا پێکدێنن. بێگومان قورئان شوێنێکی گەورەی بۆ گێڕانەوەی دەرچوونەکە تەرخان کردووە: گێڕانەوەی پەیوەندییەکانی موسا و هارونی برای لەگەڵ فیرعەون و گێڕانەوەی دەرچوون لە میسر لە زیاتر لە ١٠ سورەت بەدرێژی هەیە وەکو: الاعراف ، یونس ، طه ، الشعراء، یان بە گێڕانەوەی چڕوپڕتر یان تەنها بە باسکردنێکی سادە. ناوی فیرعەونیش کە کەسایەتییەکی سەنتەرە لە لایەنی میسرییەوە ٧٤ جار و لە ٢٧ سورەتی قورئان دووبارە بۆتەوە.

توێژینەوەی هەر دوو گێڕانەوەی دەرچوونەکە لە قورئان و تەورات بە شێوەیەکی تایبەت سەرنجڕاکێشە، جیاواز لەوەی لەبارەی لافاوەکەوە بینیمان، دوو گێڕانەوەکە لێرەدا سەبارەت بە ڕەگەزە بنجییەکان هاوڕێکن. بەدڵنیاییەوە هەندێ جیاوازی هەیە بەڵام گێڕانەوەی تەورات بەهایەکی مێژوویی مەزنی هەیە هەروەکو دواتر دەبینین، بە جۆرێك ئەو دەمانخاتە سەرەڕێی دۆزینەوەی

کەسایەتیی فیرعەون یان دروستتر کەسایەتیی هەردوو فیرعەونی پەیوەندار بە بابەتەکەوە، قورئان لەم گریمانەیەی کە لە تەوراتەوە دەست پیێ دەکات زانیاریی نویی پێیە، بۆ ئەم دوو سەرچاوە نووسراوەش ئەو پێدراوە نوێیانە دەخرێتەسەر کە زانستی ئارکیۆلۆژیای میسری دەیاندات بە دەستەوە. بەمە و بە پێکگرتنی قورئان و تەورات و زانیارییەکانی سەردەم دەگەینە ئەوەی ڕووداوەکە بە گوێرەی کتێبە پیرۆزەکان لە سیاقێکی مێژووییدا دیاری بکەین.

## دەرچوونەکە بە گوێرەی تەورات

گێڕانەوەکەی تەورات بە چوونی یەهود بۆ میسر لەگەڵ یەعقوب بۆ دیدەنی یوسف دەست پێ دەکات. ((پاشایەکی نوێ لە میسر هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی و یوسفی نەدەناسی.)) (الخروج ١ ، ٨)، ئەوە ماوەی چەوساندنەوە بوو، فیرعەون بنیاتنانی دوو شاری بەسەر یەهوددا سەپاندبوو شارەکانیش بەپێی تەورات ناویان (پیتۆم) و (ڕەمسیس) بوو. ئەم پاشایە بۆ ئەوەی زیادبوونی عیبرییەکان ڕابگرێ بەسەریدا سەپاندبوون کە دەبێ هەموو منداڵێکی کوڕ بخەنە ناو ڕووبارەوە. وێڕای ئەمەش بەڵام دایکی موسا توانی تا دوای سێ مانگ لە لەدایکبوونیشی موسا بشارێتەوە و بیپارێزێ، بەڵام لە کۆتاییی تەمەندا بڕیاری دا بیخاتە ناو سەبەتەیەك لە سەبەتەکانی کەناری ڕووبار. کچێکی فیرعەون دەیدۆزێتەوە و هەڵیدەگرێتەوە پاشان دەیداتەوە دەست دایکی بۆ ئەوەی شیری پێ بدات، ئەوەش دوای ئەوە هات کاتێ خوشکی موسا چاودێریی سەبەتەکەی دەکرد تاوەکو بزانێ کێ هەڵیدەگرێتەوە، وا خۆی نیشاندا کە نایناسێ و بە کچی

فیرعەونی گوت کە دایەنێك دەناسێ بۆ شیرپێدانی منداڵەکە، ئەم دایەنەش هەر دایکی منداڵەکە بوو. منداڵەکە وەکو منداڵەکانی فیرعەون مامەڵەی لەگەڵ دەکرا و ناوی لێنرا (موسا).

موسا بە گەنجێتی دەچێتە وڵاتی مەدیەن و لەوێ هاوسەرگیری دەکات و ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە. لەوێدا وردەکارییەکی گرینگ هەیە کاتێ بەشی (الخروج ٢ ، ٢٣) دەڵێ: ((لە میانەی ئەم ماوە درێژەدا پاشای میسر مرد)).

خودا فەرمان بە موسا دەکات بۆ دیداری فیرعەون بڕوات تاوەکو براکانی لە میسر دەربێنێ (گێڕانەوەی ئەم باسە لە ڕیوایەتی ڕووداوی (هەڵگیرسانی ئاگر). هاڕوون لە جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەدا یارمەتی براکەی دەدات. بۆیە هەر کە موسا دەگاتە خاکی میسر لەگەڵ براکەی دەچێتە لای فیرعەون..

فیرعەون داواکاری دەرچوونی یەهود تائیفەی موسا لە میسر ڕەت دەکاتەوە. خودا دووبارە بۆ موسا دەردەکەوێتەوە و فەرمانی پێ دەکات داواکارییەکەی دووبارە بکاتەوە. بەپێی تەورات ئەو کات تەمەنی موسا هەشتا ساڵ بووە. موسا بە جادووەوە بۆ فیرعەون دەیسەلمێنێ کە توانا و هێزی یاسابەدەری سەروو سروشتی هەیە، بەڵام ئەمە بەس نییە، ئەو کات خودا چەندان گورز لە میسر دەوەشێنێ: ئاوی ڕووبار دەبێتە خوێن، هێرشی بۆقەکان و مێشوولە و مێشەشین ، مردنی مەڕوماڵات و دەرکەوتنی لوو لەسەر پێستی مرۆڤ و گیانلەبەران و داباریینی تەزرە و کوللە و تاریکایی و مردنی منداڵی تازە لەدایکبوو، وێڕای ئەوەش فیرعەون ڕەتی دەکردەوە عیبرییەکان لە میسر دەرچن.

ئەو کات لە شاری ڕەمسیس هەڵدێن کە ژمارەیان (٦٠٠٠٠٠) پیاو بوو((بە بێ حیسابکردنی خێزانەکانیان)) (الخروج ١٢ ، ٣٧) — دواتر دەبینین ئەم ژمارەیە زیادەڕەوی تێدا کراوە — .. لەوێدا ((فیرعەون گالیسکە جەنگییەکەی سازدا و سوپای برد. (٦٠٠) گالیسکە لە باشترین گالیسکەکانی و هەموو ماشێنە جەنگییەکانی میسڕی برد کە ئەفسەرەکان لێیان دەخوڕی..ئیتر پاشای میسڕ کەوتە ڕاوەدووی ئیسڕائیلییە هەڵاتووەکان)) (الخروج ١٤ ، ٦ — ٨). میسڕییەکان لە کەنار دەریاوە دەگەنە گروپی موسا، کاتێ موسا داروەکازەکەی بەرز کردەوە دەریاکە لەبەردەمی کرایەوە و پیاوەکانی چوونە ناویەوە بێ ئەوەی قاچەکانیان تەڕبێت)). میسڕییەکان ڕاوەدوویان نان و ئەسپ و ماشێن و سوارەکانی فیرعەون چوونە ناو ئاوەکەوە)) (الخروج ١٣ ، ٢٣) ((ئاوی دەریاکە وەکو خۆی لێ هاتەوە و ماشێن و سوارەکانی هەموو سوپای فیرعەون کە چووبوونە ناو دەریاکەوە نقووم کرد و تاکە پیاوێکیشیان نەمایەوە)) (الخروج ١٤ — ٢٨ و ٢٩)..

دەقی بەشی (الخروج) تەواو ڕوونە. فیرعەون سەرکردەی ڕاوەدوونەرەکان بوو. بێگومان لەناویشچوو چونکە بەشی (الخروج) دیاری دەکات کە (تاکە پیاوێکیشیان نەمایەوە). زێدەباری ئەوەش تەورات ئەم وردەکارییەی لە (مزامیر داود)یش دووبارە کردۆتەوە: (المزمور ١٠٦ ئایەتی ١١ ، المزمور ١٣٦ لە ئایەتی ١٣ بۆ ١٥: ((ستایش بۆ ئەو خودایەی دەریای (البوص)ی کردە دوو لەت و وای کرد ئیسڕائیل بە ناوەندیدا بڕوات و فیرعەون و سوپاکەشی خستە ناو دەریای (البوص)ەوە)..بەپێی ڕیوایەتی تەورات کەواتە گومانی تێدا نییە کە فیرعەون لە دەریادا مردووە. تەورات وشەیەکیش لەبارەی تەرمی ئەم فیرعەونەوە ناڵێ..

## دەرچوونەکە بە گوێرەی قورئان

گێڕانەوەی قورئان لەبارەی دەرچوونەکەوە لە هێڵە گشتییەکانی لە گێڕانـەوەی تەورات دەچێ. دەبێ ئەم گێڕانەوەیە دووبارە بەیەکەوە ببەسترێتەوە چونکە لـە چەند ڕەگەزێکی پەرشوبڵاوی نێو چەند بڕگەیەکی قورئان پێکهاتووە. هاوشێوەی تـەورات، قورئـانیش نـاوی هـیچ کەسـێك نـاهێنێ کـە ڕێ بـدات بـە دیـاریکردنی کەسایەتیی ئەو فیرعەونەی لە کاتی دەرچوونەکە حوکمی میسری دەکرد. هـەموو ئەوەی دەیزانین ئەوەیە کە یەکێك لـە ئەنـدامانی ئەنجوومەنەکـەی فیرعـەون نـاوی هامان بووە و شەش جار ناوی لـە قورئانـدا هـاتووە: ئایەتـەکانی ٦ و ٨ و ٣٨ی سـوڕەتی (القصـص)، ئایەتـەکانی ٢٤و٣٦ی سـوڕەتی (غـافر)، ئایـەتی ٣٩ی سوڕەتی (العنكبوت).

فیرعەون چەوسێنەرەوەی یەهود:

ئایەتی ٦ی سوڕەتی (ابراهیم):

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنْجَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَلِكُمْ بَلَاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ (٦)﴾

ئایەتی ١٤١ی سوڕەتی (الاعراف)یش باسـی چەوسـاندنەوەی بـە هـەمان واژە دووبارە کردۆتەوە. بەڵام قورئان هاوشێوەی تەورات ئاماژە بە ناوی ئەو دوو شارە ناکات کە یەهود بە بێگار (سوغرە) بنیاتیان نا.

بەڵام ڕووداوی دانانی موسا لە لێواری ڕووبار لـە ئایەتـەکانی ٣٩و٤٠ی سـوڕەتی (طه) و ئایەتـەکانی ٧ بۆ ١٣ی سوڕەتی (القصـص) گێڕدراوەتـەوە. گێڕانـەوەی

قورئـان دەبێـژێت: خێزانـی فیرعـەون موسـایان هەڵگرتۆتـەوە. ئایەتـەکانی ٨و٩ی سورەتی (القصص) دەڵێ:

﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ (٨) وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰ أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (٩)﴾

کەلەپوری ئیسلامی دەڵێ کە (ئاسیا)ی هاوسەری فیرعـەون چاودێریی موسـای کـردووە. بـەڵام قورئـان نـاڵێ کـە هاوسـەری فیرعـەون هەڵیگرتۆتـەوە بـەڵکو خانەوادەکەی هەڵیانگرتۆتەوە.

بەڵام لاوێتیی موسا و مانەوەی لە خاکی مەدیـەن و هاوسـەرگیریکردنی، هـەموو ئەمانە لە ئایەتەکانی ١٣ بۆ ٢٨ی سورەتی (القصص) گێڕدراونەتەوە.

خوێنەر لە بەشی یەکەمی سـورەتی (طـه) و لـە ئایـەتی ٣٠ بـۆ ٣٥ی سـورەتی (القصص) ڕووداوی دەرکەوتنی ئاگر دەخوێنێتەوە.

قورئان هاوشێوەی تەورات بەدرێژی باسی ئەو ١٠ گورزە ناکات کە خـودا وەکـو سـزایەك لـە میسـری وەشـاند، بـەڵکو زۆر بـە کـورتی تـەنها باسـی پێـنج گـورز دەکات(ئایەتی ١٣٣ی سورەتی الاعراف) کە بریتیین لە لافـاو و کوللـە و ئەسـپێ و بۆق و خوێن.

قورئان ڕووداوی دەرچوون لـە میسـر دەگێڕێتـەوە بـێ ئـەوەی ئـەو دیاریکردنـە جوگرافییانەی باس بکات کە تەورات ئامـاژەی پـێ بکـات یـان باسـی ئـەو ژمارانـە بکات کە لە ڕیوایەتی تەوراتدا هاتووە کە باوەڕپێکردنی دژوارە. چۆن ٦٠٠٠٠٠ پیاو

بە خاوخێزانەوە بەپێی وتەی تەورات توانیویانە ماوەیەکی درێژ لە بیاباندا بمێننەوە؟!

سەبارەت بە مردنی فیرعەونیش کە ڕاوەدووی عیبرییەکانی دەنا قورئان بەم شێوەیە باسی دەکات: ئایەتی ٧٨ی سورەتی (طـه): ﴿فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِ فَغَشِيَهُمْ مِنَ الْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ (٧٨)﴾

ئەم ئایەتە دەڵێ: یەهود هەڵاتن و فیرعەونیش لەناوچوو بەڵام تەرمەکەی دۆزرایەوە، ئەوەش وردەکارییەکی گرینگە گێڕانەوەی تەورات ئاماژەی بۆ ناکات.

ئایەتی ٩٠ بۆ ٩٢ی سورەتی (یونس):

﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنْتُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ (٩٠) آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنْتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ (٩١) فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ (٩٢)﴾

ئەم برگەیە دوو دیاریکردن دەخوازێ:

(أ) گیانی دەسدرێژی و دوژمنایەتیی ئاماژەبۆکراو، ئەوەش بە تێڕوانین بەو هەوڵانەی موسا بۆ قەناعەت پێکردنی فیرعەون.

(ب) مەبەست لە ڕزگارکردنی فیرعەون جەستەیەتی، لەبەرئەوەی ئایەتی ٩٨ی سورەتی (هود) دیاری دەکات کە خودا بڕیاری سزای ئاگری بۆ فیرعەون و کەسوکارەکەی بڕیوەتەوە. ئایەتەکە دەڵێ:

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ (٩٨)﴾

کەواتە سەبارەت بەو بابەتانەی بەراوردکردن لەگەڵ پێدراوە مێژوویی و جوگرافیایی و شوێنەوارییەکان هەڵدەگرێ پێویستە تێبینی ئەوە بکرێ کە گێڕانەوەی قورئان و تەورات لەم خاڵانە لە یەکتر جیاوازن:

– قورئان ناوی شوێنەکان ناهێنێ، چ ئەو شارانەی عیبرییەکانی گروپی موسا بنیاتیان نا یان ئەوانەی لە کاتی دەرچوونەکە پێیدا ڕۆیشتن.

– قورئان باسی مردنی یەکێك لە فیرعەونەکان ناکات ئەو کاتەی موسا لە مەدیەن بوو.

– قورئان هیچ پێدراوێکی تایبەت بە تەمەنی موسا نادات بە دەستەوە ئەو کاتەی لەگەڵ فیرعەون قسەی کرد.

– قورئان باسی هیچ ژمارەیەکی دیاریکراو سەبارەت بە گروپی موسا ناکات کە تەورات ژمارەکەی زۆر گەورە کردووە و گەیاندوویەتییە ژمارەیەکی نامەعقوڵ (٦٠٠٠٠٠ پیاو بە خاووخێزانیانەوە گروپێکی زیاتر لە دوو ملیۆنی دروست دەکەن).

– تەورات هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە تایبەت بێت بە دۆزینەوەی تەرمی فیرعەون دوای مردنی.

خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیشیان ئەمانەن:

– قورئان چەوساندنەوەی یەهودی گروپی موسا لە لایەن فیرعەونەوە تەئکید دەکاتەوە.

– هەر دوو گێڕانەوەکە ناوی پاشای میسری تێدا نییە.

– قورئانیش تەئکید لە مردنی فیرعەون دوای دەرچوونی لە میسر دەکاتەوە.

## بەراوردکردنێك لەنێوان پێدراوەکانی کتێبە پیرۆزەکان و زانیارییە نوێیەکان

گێڕانەوەکانی قورئان و تەورات تایبەت بە مانەوەی (بنی اسرائیل) لە میسر و دەرچوونیان لێی هەندێ لایەن دەخاتەڕوو کە دەکرێ ببێتە بابەتی بەراوردکاری لەگەڵ زانیارییە نوێیەکان. قسەی هەق ئەوەیە کە ئەمە دەکرێ بەڵام بە شێوەیەکی وەکیەك نا، بە جۆرێك کە هەندێ لایەن بڕێك گرفت دەورووژێنێ لە کاتێکدا لایەنی تر هەن هیچ ماددەیەکی لێتوێژینەوەیان لێ شین نابێ.

### ١- توێژینەوەیەك دوای وردەکاریی گێڕانەوەکان:

### عیبرییەکان لە میسر

وا دەردەکەوێ کە بە ڕاستی بتوانین بڵێین: عیبرییەکان بە درێژایی ٤٠٠ یان ٤٣٠ساڵ لە میسر ماونەتەوە بێ ئەوەی بکەوینە هەڵەیەکی گەورەوە، بە پێی ئەوەی لە تەوراتدا نووسراوە (التکوین ١٥ ، ١٣ — الخروج ١٢ ، ٤٠) — مانەوەیان بە نیشتەجێبوونی (یوسف کوڕی یەعقوب) و براکانی لە میسر دەست پێ دەکات، ئەوەی بە ماوەیەکی زۆر دوای سەردەمی ئیبراهیم بووە. بێجگە لە تەورات کە هەر ئەو زانیارییانە دەدات کە تازە خستمانە ڕوو، قورئانیش کە ئاماژە بۆ ئەم نیشتەجێبوونە دەکات بێ ئەوەی کەمترین ئاماژەی زەمەنی بۆ بەدوایەکداهاتنی ڕووداوەکان بکات، ئێمە جگە لەم دووانە هیچ بەڵگەنامەیەکی ترمان لەبەردەستدا نییە کە بتوانێ ئەم خاڵەمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

لە (پ.مونتی p.montet)ەوە بۆ (دانیل رۆپس Daniel Rops)، پسپۆڕان ئێستا پێیان وایە دوای تێڕوانین لە هەموو ئەگەرەکان بزاوتی (هیکسۆس) لە سەدەی ١٧ی پێش زایین هاوکات بووە لەگەڵ گەیشتنی یوسف و کەسوکارەکەی. لە شاری (ئەفاریس) لە دەلتا شا هیکسۆس پێشوازییەکی جوانی لە یوسف و براکانی کردووە.

ئەم خەملاندنە بە دڵنیاییەوە بە ڕوونی دیارە ناکۆکە لەگەڵ ئەوەی کتێبی پاشایانی یەکەم لە تەورات(٦ ، ١) پێمان دەڵێ، ئەو کتێبە دەرچوون لە میسر بە ٤٨٠ ساڵ بەر لە بنیاتنانی پەرستگای سلێمان (لە ٩٧١ی پێش زایین) دیاری دەکات. کەواتە ئەم خەملاندنە دەرچوون لە میسر بە نزیکەی ١٤٥٠ ساڵ بەر لە زایین دیاری دەکات. بەم جۆرە دەبێ چوون بۆ ناو میسر لەنێوان (١٨٨٠ ١٨٥٠)ی پێش زایین ڕوویدابێت. بەڵام ئەمە بە دیاریکراوی ئەم ماوەیەیە کە ئێستا وا گریمان دەکرێ ئیبراهیمی تێدا ژیاوە و بە نزیکەی ٢٥٠ ساڵ لە یوسف دوورە، ئەم باوەڕەی ئەمڕۆش پشت بە پێدراوەکانی تری دەبەستێ. بەم پێیە ئەم برگەیەی کتێبی پاشاکانی یەکەم لە تەورات لە تێڕوانینی زنجیرەی زەمەنی ڕووداوەکان پەسندکراو نییە. دواتر دەبینین کە ئەم تیۆرەی لێرە داکۆکی لێ دەکەین ناتوانرێ پەلپی لێ بگیرێ جگە لەو بەرهەڵستییەی دەکرێ لەم کتێبی پاشایانی یەکەمەوە هەڵێنجرێ، بەڵام نەبوونی وردەکاریی ڕوون تێیدا تایبەت بە پێدراوەکانی زنجیرەی زەمەنی ڕووداوەکان هیچ نرخێکی بۆ ناهێڵێتەوە.

ئەو شوێنەوارانەی عیبرییەکان وەکو نیشانەیەك بۆ مانەوەیان لە میسر بەجێیان هێشتووە زۆر لێڵە ئەگەر پێدراوەکانی کتێبە پیرۆزەکانی لێ هاوێر بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بەڵگەنامەی هیرۆگلیفی هەیە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات گوایە لە

میسرِ دەستەیەك لە كرێكاران دۆزراوەتەوە بە ناوی (ئەپیرۆ) یان (هاپیرو) یان (هابیرو). هەندێك وای دەبینین، جا هەڵە بن یان ڕاست، ئەوانە عیبرییەكانن.بەم ناوە ئاماژە كراوە بۆ كرێكارانی بنیاتنان و كرێكارە كشتوكاڵییەكان و كرێكارانی تریٚ ڕنین..هتد.. لە كوێوە هاتوون؟ وەڵامدانەوەی ئەمە بە ڕاستی دژوارە. هەروەكو باوكە دیڤۆ دەبێژێت: ((ئەوان سەر بە دانیشتووانی وڵات نین و ناسنامەشیان لە هیچ چینێكی كۆمەڵگادا نییە و یەك كار و یەك ڕەوشیان نییە.)).

نووسراوێكی سەردەمی (تحتمسی سێیەم)ی هەیە بە (سیاس) ناویان دێنیٚ. زانراوە كە (ئەمونوفیسی دووەم) لە سەدەی پازدەی پێش زایین ٣٦٠٠ كەسی لێیان وەكو بەندكراو لە كەنعانەوە هێناوە، ئەوان بەشێكی بەرچاو لە دانیشتووانی شام (سوریا و فەڵەستین) پێكدێنا هەروەك باوكە دیڤۆ دەڵیٚ. لە دەوروبەری ١٣٠٠ ی پێش زایین و لە سەردەمی دەسەڵاتی (سیتی یەكەم)دا هەر ئەم ئەبیرۆیانەی كەنعان پشێوییان لە ناوچەی (بیت – شیان) نایەوە. لە سەردەمی دەسەڵاتی (ڕەمسیسی دووەم)دا هەیانبوو لە كانەبەرد یان گواستنەوەی مێخەكان بۆ كارەكانی فیرعەون ئیشیان دەكرد(دەروازە گەورەكانی ڕەمسیس میامون). لە تەوراتیشەوە باسی ئەوە كراوە كە عیبرییەكان لە سەردەمی دەسەڵاتی ڕەمسیسی دووەمدا شاری ڕەمسیس(رع – مسیس)ی پایتەختی باكوریان بنیاتناوە.نووسراوە میسرییەكان دوا جار ئاماژە بۆ ئەم ئەبیرۆیانە لە سەدەی دوازدەی پێش زایین لە سەردەمی دەسەڵاتی ڕەمسیسی سێیەمدا دەكەن.

ئەم ئەبیرۆیانە تەنها لە میسر باس نەكراون. ئایا واژەكە تەنها بەسەر عیبرییەكاندا دەچەسپیٚ؟ لەوانەیە سوودبەخش بێت ئەگەر باسی ئەوە بكەین كە

ڕەنگە وشەکە یەکەم جار ئاماژەی بۆ ئەو کرێکارانە کردبێت کە بە بێگار ئیش دەکەن ئەوەش بێ ئەوەی هیچ بیرۆکەیەك لەبارەی ئەسڵیانەوە هەبێت، دواتر ئەم وشەیە وەك سیفەتێکی پیشەیی بەکارهێنرا.

بابەتەکە هەرچییەك بێت ئەوا لە سەردەمی ڕەمسیسی دووەم (بەپێی وتەی تەورات) عیبرییەکان یان ئەبیرۆ (بەپێی دەقەکانی هیرۆگلیفی)ئەو کارە گەورانەیان جێبەجێ کردووە کە فیرعەون فەرمانی پێکردوون و دەشکرێ بگوترێ ئەوان لە کارپێکردنی زۆرەملێیانە بەشداریان کردووە. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ڕەمسیسی دووەم یەهودی دەچاوساندەوە: هەردوو شاری (ڕەمسیس) و (بیتوم) کە لە بەشی (الخروج) باس کراون دەکەونە بەشی ڕۆژهەڵاتی دەلتای نیل. (تانیس) و (قەنطیر) کە ٢٥ کیلۆمەتر لە یەکتر دوورن هاوشێوەی ئەم دوو شارە کۆنەن. لەوێدا پایتەختی باکور هەبوو کە ڕەمسیسی دووەم بنیاتی ناوە. ڕەمسیسی دووەمیش فیرعەونی یاخییە.

موسا لەم چوارچێوەیەدا بەوەلەد بوو. پێشتر ئەو بارودۆخەمان بینی کە چۆن لە ڕووبارەکە ڕزگاری بوو، ناوەکەشی میسرییە. (پ. مۆنتی) ئەمەی بە باشی لە کتێبەکەیدا (میسر و تەورات) سەلماندووە، (مسو Msew) یان (مس Mesy) دوو ناون لە فەرهەنگی ناوی کەسەکان لە زمانی هیرۆگلیفی (ڕانك Ranke)و ،(موسا)ش گواستنەوەی ئەم ناوەیە لە قورئان.

## بەڵاکانی میسر

لەژێر ئەم ناوەدا، تەورات ئاماژە بۆ ١٠ سزا دەکات کە خودا بەسەر دانیشتووانی میسری داباراند، هەروەها وردەکاریی زۆر لەبارەی هەر بەڵایەك لەم بەڵایانە باس دەکات. بەڵام قورئان تەنها ئاماژە بە پێنج لەم سزایانە دەکات و زۆرێکیشیان هەر زیادەیەکە لە چەند دیاردەیەکی سروشتی کە بریتین لە لافاو و کولله و ئەسپێ و بۆق و خوێن.

بەڵام بڵاوبوونەوەی کولله و بۆق لە تەوراتدا باس کراوە. هەروەك باسی ئاوی ڕووبارەکانیش دەکات کە گۆڕاون بۆ خوێن و هەموو وڵاتیان نقووم کردووە. بەڵام قورئان ئاماژە بۆ خوێن دەکات و هەموو وردەکارییەکی زێدەی تری دوور دەخاتەوە. سەبارەت بەم خوێنە دەکرێ گریمانەی زۆر بوترێ.

بەڵام گورز و بەڵاکانی تر(مێشووله و مێشەشینە و لووی پێست و تەزرە و تاریکایی و مردنی منداڵی تازە لەدایکبوو و مەڕوماڵات) کە تەورات وەسفیان دەکات لە بنچینەی جیاوازەوە دێن، هەروەك حاڵی ڕیوایەتی لافاوەکە کە کۆبوونەوەی چەند ڕەگەزێکی سەرچاوەگەلی جیاواز دروست بووە.

### ڕێڕەوی دەرچوونەکە:

قورئان هیچ ئاماژەیەك لەبارەی ڕێڕەوەکە نادات بەدەستەوە لە کاتێکدا تەورات زۆر بەوردی ئاماژە بە ڕێڕەوەکە دەکات. هەر یەك لە باوکە دیڤۆ و پ.مۆنتی لێکۆڵینەوەیان لەم ڕێڕەوە کردووە. وا گریمان دەکرێ کە خاڵی سەرەتای

دەرچوون لە تانیس — قەنتیرەوە بێت. بەڵام سەبارەت بە پاشماوەی ڕێگاکە لە هیچ شوێنێك شوێنەوارێکی ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە کە ڕیواتەکەی تەورات تەئکید بکاتەوە، هەروەکو لە تواناشدا نییە ئەو شوێنە دیاری بکرێ کە تێیدا دەریا کراوەتەوە تاوەکو گروپەکەی موسا بڕۆن.

## پەرجوو( معجزە )ی دەریا :

هەندێك وا گریمانەیان کردووە کە بە کاریگەریی هەندێ هۆکاری گەردوونی یان زەمینیی پەیوەست بە تەقینەوەیەکی گڕکانێکی دوورەوە داکشانێك ڕوویداوە، بەپێی ئەم وتەیە عیبرییەکانیش کشانەوەی ئاوی دەریایان قۆستۆتەوە، میسرییەکانیش کە ڕاوەدوویان دەنان بە هۆی هەڵکشانی ئاوی دەریاوە نقووم بوون..بەڵام ئەمە هەموو تەنها گریمانەیە و بەس.

## ٢- شوێنی دەرچوونەکە لە ساڵنامە فیرعەونییەکان :

سەبارەت بە دیاریکردنی مێژووی دەرچوونەکە دەکرێ بە شێوەیەکی نرخدار بگەینە چەند پێدراوێکی ئیجابی. زۆر لەمێژە (منبتاح) بە جێنشین و جێگرەوەی فیرعەون (ڕەمسیسی دووەم) دادەنرێ کە لە سەردەمی ئەودا موسا لە میسر دەرچوو. (ماسپیرۆ)ی شوێنەوارناسی بەناوبانگی میسری لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە کتێبەکەیدا بە ناوی (ڕێبەری سەردانکەری مۆزەخانەی قاهیرە) (١٩٠٠) نووسیویەتی: منبتاح (بە پێی وتەیەکی پێشینان ئەسڵی ئەسکەندەرییە، فیرعەونی سەردەمی دەرچوونەکەیە، واتە ئەوەی لە دەریادا لەناوچوو.) نەمتوانی

ئەو بەڵگەنامانە بەدەست بێنم کە ماسپیرۆ ئەم ڕایەی خۆی لەسەر دامەزراندووە بەڵام جیددییەتی نووسەر بەسەرماندا دەسەپێنێ کە نرخێکی گەورە بۆ قسەکەی دابنێین.

ئەگەر (پ.مۆنتی) لێ هەڵاوێرین، بەڕاستی ئەو شوێنەوارناسە میسرییانە یان پسپۆڕانەی تەفسیری تەورات کەمن کە لەو بەڵگەنامانەیان کۆڵیوەتەوە کە لەوانەیە لە قازانج یان دژی ئەم گریمانەیەن. بەڵکو بە پێچەوانەوە لەم دەیانەی دواییدا، گەشەسەندنی گریمانەگەلێکمان بینی کە هەر یەکێکیان لەویتر جیاوازە، وا دەردەکەوێ کە ئەم گریمانانە ئامانجی تەرحکردنیان هەر بۆ ئەوە بووە بەدەم سازانی وردەکارییەکی گێڕانەوەکانی کتێبە پیرۆزەکان بێت، ئەوانەی ئەم گریمانانەیان تەرحکردووە بایەخیان بە لایەنەکانی تری ئەم کتێبانە نەداوە. بەم جۆرە دەرکەوتنی ئەم گریمانەیە یان ئەویتر دەبینین کە وا دەردەکەوێ لەگەڵ لایەنێکی ڕیوایەتێك ساز و تەبایە بێ ئەوەی خاوەنی ئەم گریمانەیە خۆی ماندوو بکات و بەراوردی بکات بە پێدراوەکانی تری کتێبە پیرۆزەکان، لە هەمان کات پێککگرتنی بە هەموو ئەو پێدراوانەی مێژوو و شوێنەوارناسی و هتد...دەیخەنەڕوو.

لە سەیرترینی ئەو گریمانانە ئەو گریمانەیەی(ج.دی میلی)ە (١٩٦٠) کە لافی ئەوە لێ دەدات گوایە توانیویەتی کاتی دەرچوونەکە دیاری بکات کە بریتییە لە ٩ی نیسانی ساڵی ١٤٩٥ی پێش زایین، ئەوەش تەنها لە ڕێی حیسابی ساڵنامەکان. بەم پێیە (تحتمسی دووەم) کە لەم مێژووەدا پاشا بوو دەبێتە فیرعەونی سەردەمی دەرچوونەکە. لەبەرئەوەی مۆمیای تحتمسی دووەم وەسفی لووی پێست(أورام جلدیە)ی لەسەر نووسراوە، نووسەر بە (بەڵەکی) وەسفی دەکات — بێ ئەوەی هۆی ئەوە بزانین —، لەبەرئەوەش کە یەکێك لەو بەڵایانەی

بەسەر میسردا هات و تەورات باسی دەكات بریتی لە لیری پێست (طفح جلدی) بۆیە گریمانەكە دەبێتە شتێكی بڕواپێكراو. ئەم بیناكردنە سەیرە هەرگیز مەسەلەكانی تری ڕیوایەتی تەورات ڕەچاو ناكات بەتایبەتی ئاماژەی تەورات بۆ شاری ڕەمسیس، ئەو ئاماژەیەی هەموو گریمانەكان لەبارەی دیاریكردنی مێژووی دەرچوونەكە پووچەڵ دەكاتەوە بەر لەوەی یەكێك لە ڕەعامسەكان ببێتە پاشای میسر.

سەبارەت بە لووەكانی پێستی تحتمسی دووەم هیچ شتێك نییە پاساوی بەڵگەبوونی بهێنێتەوە لەسەر ئەوەی كە ئەم پاشای میسرە فیرعەونی سەردەمی دەرچوونەكەیە، لەبەرئەوەی تحتمسی سێیەمی كوڕی و ئەمینوفیسی دووەمی نەوەی، تووشی لووی پێست ببوون، هەندێك كردوٚتە گریمانەی بوونی نەخۆشی لەم خانەوادەیە. بەم پێیە گریمانەی ئەوەی تحتمسی دووەم فیرعەونی دەرچوونەكەیە گریمانەیەكە ناكرێ داكۆكی لێ بكرێ.

هەروەها ئەو گریمانەیەی (دانییل ڕۆپس) لە كتێبەكەیدا بە ناوونیشانی (گەلی تەورات) هێناویەتەوە كە تێیدا ڕۆڵی فیرعەونی دەرچوونەكە دەداتە ئەمینوفیسی دووەم، وا دەردەكەوێ كە بنچینەی گریمانەكەی لەوەی پێشوو پتەوتر نییە. بە بەڵگەی ئەوەی كە تحتمسی سێیەمی باوكی زۆر نەتەوەپەرست بووە، دانییل ڕۆپس ئەمینوفیسی دووەم دەكاتە چەوسێنەرەوەی عیبرییەكان و خەسووەكەی شاژن(حتشبسوت)ی بەناوبانگ موسای هەڵگرتۆتەوە بێ ئەوەی هۆكارێك بۆ ئەوە بزانین.

بەڵام باوکە دیڤۆ لە کتێبەکەیدا(مێژووی کۆنی ئیسرائیل) گریمانەکەی کە دەڵێ فیرعەونەکە ڕەمسیسی دووەم بووە لەسەر بناغەیەکی پتەوتر دادەنێ. ئەگەرچی ئەو گریمانەیە لەگەڵ هەموو خاڵەکانی ڕیوایەتی تەورات تێک ناکاتەوە بەڵام گریمانەیەکە بەهای پێدراوێکی سەرەکی هەیە کە بریتییە لە بنیاتنانی هەردوو شاری ڕەمسیس و بیتوم کە لە دەقی تەوراتدا باس کراون. بەم پێیە ناکرێ وا دابنرێ کە دەرچوونەکە بەر لە دەسەڵات گرتنە دەستی ڕەمسیسی دووەم ڕوویداوە، ئەوەش ڕووداوێکە ساڵنامەکانی دریتۆن و ڤاندییە بە ساڵی ١٣٠١ی پێش زایینی دیاری کردووە، هەروەها ساڵنامەی ڕۆتۆن بە ساڵی ١٢٩٠ی پێش زایینی دیاری کردووە. ئەو دوو گریمانەیەی پێشتر باسمان کرد لەبەر هۆیەکی زەروری ڕەت دەکرێنەوە ئەویش ئەوەیە کە ڕەمسیسی دووەم فیرعەونی چەوساندنەوەیە کە تەورات باسی دەکات.

بە ڕای باوکە دیڤۆ دەرچوونەکە لە نیوەی یەکەم یان ناوەڕاستی دەسەڵاتی ڕەمسیس ڕووی داوە. دیاریکردنی ئەم مێژووە لە لایەن باوکە دیڤۆوە تەواو ناوردە: ئەو بۆیە ئاماژە بەم ماوە دەکات تا کاتی پێویست بداتە گروپی موسا لە خاکی کەنعان جێگیر بێت و منبتاحی جێنشینی ڕەمسیسی دووەم بتوانێ بەنی ئیسرائیل ملکەچ بکات، شایەتی ئەمەش ئەو پەیکەرانەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی پێنجەمی دەسەڵاتەکەی.

دەکرێ بە دوو بەڵگە بەرهەڵستی ئەم گریمانەیە بکەین:

(أ) تەورات لە بەشی (الخروج ٢ ، ٢٣) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پاشای میسر لە دەمی مانەوەی موسا لە مەدیەن مردووە. بەشی (الخروج) باسی ئەوە دەکات

کە ئەو پاشایە هەر دوو شاری ڕەمسیس و بیتوم بە بێگار (سوخرە) بە عیبرییەکان دروست کرد. ئەو ڕەمسیسی دووەمە. بەم پێیە نابێ دەرچوونەکە ڕوویدا بێت مەگەر لە سەردەمی جێنشینی ئەم پاشایە نەبێت. بەڵام باوکە دیڤۆ دەڵێ ئەو گومانی هەیە لە سەرچاوەکەی تەورات بۆ ئایەتی ٢٣ی ئیصحاحی دووەمی بەشی (الخروج).

(ب) ئەوەی مایەی سەرسامیی زیاترە ئەوەیە کە باوکە دیڤۆ کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی کتێبی پیرۆزە پێی وایە کە فیرعەون لە کاتی ڕاوەدوونانی هەڵاتووەکان مردووە، ئەوەش وردەکارییەکە وا دەکات ڕوودانی دەرچوونەکە لە زەمەنێکی تر ئەستەم بێت مەگەر لە کۆتاییی دەسەڵاتێك.

لە ڕاستیدا ئێمە پێویستە ئەوە دووبارە بکەینەوە کە هیچ گومانێکی تێدا نییە کە فیرعەون لە کاتی ئەم ڕاوەدوونانە مردووە. لەم خاڵەدا هەردوو ئیصحاحی ١٣ و ١٤ی بەشی الخروج یەکلاکەرەوەن: (فیرعەون گالیسکەکەی ئامادەکرد و سوپاکەی برد...) (١٤ ، ٦)..(پاشای میسر ڕاوەدووی ئیسرائیلییەکانی نا کە بە دەست بەرزکراوەیی دەرچوون) (١٤ ، ٨)..(ئاوەکە وەکو خۆی لێهاتەوە و هەموو ئەو سوپایەی فیرعەونی نقووم کرد کە بە دوایاندا چووبوونە ناو دەریاوە. کەسیان لێ نەمایەوە)(١٤ ، ٢٨ – ٢٩)..زیاتر لەوەش (المزمور)ی ١٣٦ی داوود مردنی فیرعەون دووپات دەکاتەوە کە بۆ یەهودە سەری کەچ کردووە...ئەو (یەهوە)ی فیرعەون و سوپاکەی خستە ناو دەریای (البوص)ەوە) (١٣٦ ، ١٥).

کەواتە ئەو کاتەی فیرعەون لە خاکی مەدیەن بووە فیرعەونێك مردووە و یەکێکی تریش لە کاتی دەرچوونەکەدا مردووە. کەواتە بۆ موسا یەك فیرعەون

نەبووە بەڵکو دوو فیرعەون بووە: فیرعەونێکی چەوساندنەوە و فیرعەنێکی دەرچوون لە میسر. بەم پێیە گریمانەی باوکە دیڤۆ کە دەڵێ یەك فیرعەون بووە کە بریتییە لە ڕەمسیسی دووەم مایەی ڕەزامەندی نییە چونکە هەموو شتێك ڕوون ناکاتەوە. بابەتەکانی داهاتووش بەڵگەی زیاتری دژ بەم گریمانەیە تێدایە.

## ٣- ڕەمسیسی دووەم فیرعەونی چەوساندنەوە – منبتاح فیرعەونی دەرچوون:

(پ.مۆنتی) بە شێوەیەکی دروست کەلەپوری ئەسکەندەریی یەکەمی بەکارهێناوە کە ماسپیرۆ ئامارەی بۆ کردووە کە زۆر دوای ئەوە لە کەلەپوری کلاسیکیی مەسیحی دەیبینین. (پ.مۆنتی) ئەم تیۆرە لە کتێبی (میسر و تەورات) دەخاتە ڕوو، لەوێدا بەڵگەی زیاتر هەیە کە پاڵپشتی دەکات بە تایبەتی ئەوەی ڕیوایەتی قورئان هێناویەتی بەڵام ئەم زانا بەناوبانگەی بواری شوێنەوار هەرگیز ئامارەی بۆ ناکات.. بەر لەوەی گفتوگۆی لەبارەوە بکەین با بگەڕێینەوە بۆ تەورات. بەشی الخروج ئامارەیەکی تێدایە بۆ وشەی ڕەمسیس ئەگەرچی ناوی فیرعەون نەهاتووە و ڕەمسیسیش لە تەورات ناوی یەکێك لەو شارە باسکراوانەیە کە بە کاری بێگارانەی عیبرانییەکان دروست کراوە. ئەمڕۆش ئەوە زانراوە کە ئەو دوو شارە لە ناوچەی تانیس – قەنتیری بەشی ڕۆژهەڵاتی دەلتای نیل بوونە کە لەوێدا ڕەمسیس پایتەختی باکوری دامەزراندووە. بێگومان بەر لە ڕەمسیسیش لەم ناوچەیەدا بینایەی تریش هەبووە بەڵام گۆڕانی ئەم ناوچەیە بۆ شوێنێکی گرینگ بۆ ئەم پاشایە دەگەڕێتەوە. لەوەدا ئەو هەڵکۆڵینانەی لەم دەیانەی دوایی

لەوێدا کراون بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەن. ئەم پاشایە عیبرییە بەکۆیلەکراوەکانی لە بنیاتنانی ئەم پایتەختەدا بەکارهێناوە.

ئەمڕۆ خوێندنەوەی ناوی ڕەمسیس لە تەورات کەس سەرسام ناکات: لەوەتەی (شامبلیون) سەدە و نیوێك لەمەوبەر کلیلی پیتە هیرۆگلیفییەکانی دۆزیوەتەوە وشەکە بڵاو بۆتەوە..ئەمڕۆ ڕاهاتووین لەسەر خوێندنەوەی ئەم ناوە و گۆکردنی لەگەڵ زانینی واتاکەی. بەڵام پێویستە وێنای ئەوە بکەین کە پیتە هیرۆگلیفییەکان لە سەدەی سێیەمی پێش زایین ون بوون و ناوی ڕەمسیسیش تەنها لە تەورات و هەندێ کتێبی یۆنانی و لاتینی کە ناوەکەیان کەم و زۆر شێواندبوو پارێزرابوو، بۆ نموونە تاسیت بەم جۆرە لە ساڵنامەکەیەوە لەبارەی ڕەمسیسەوە دەدوێ.. بەڵام تەورات بەوپەڕی وردییەوە ناوی ڕەمسیسی پاراستووە و لە پێنج بەشەکەی موسا چوار جار ناوی دەهێنێ(التکوین ٤٧ ، ١١ الخروج ١، ١١و١٢ ، ٣٧ العدد ٣٣، ٣و٣٣، ٥).

کەواتە تەورات لە نوسخە عیبری و یۆنانی و لاتینییەکەیدا بە شێوەیەکی جوان ناوی ڕەمسیسی پاراستووە.

کەواتە ئەو پێدراوانەی پێشوو ئەمانە دەسەلمێنێ:

(أ) ناکرێ دەرچوونەکە وێنا بکرێ بەر لە گەیشتنی یەکێك لە ڕەمسیسەکان بۆ دەسەڵات لە میسر.

(ب) موسا لە سەردەمی ڕەمسیسی دووەم بنیاتنەری هەردوو شاری ڕەمسیس و بیتوم لەدایك بووە.

(ج) ئەو کاتەی موسا لە خاکی مەدیەن بوو ئەو فیرعەونەی حوکمی میسری دەکرد مرد. پاشماوەی بەسەرهاتی موسا دەکەوێتە دەسەڵاتی منبتاح جێنشینی ئەم پاشایە.

بەڵکو لەوە زیاتریش، تەورات ڕەگەزێکی تری زۆر گرینگ لە دیاریکردنی کاتی دەرچوونەکە لە ساڵنامە فیرعەونییەکانەوە دەهێنێ: مەبەست ئەو ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تەمەنی موسا ٨٠ ساڵ بووە کاتێ بە فەرمانی خودا هەوڵیدا فیرعەون براکانی ئازاد بکات: ((تەمەنی موسا ٨٠ ساڵ و هارون ٨٣ ساڵ بوو کاتێ لەگەڵ فیرعەون دوان))(الخروج ٧,٧). تەورات ئەوەشمان پێ دەڵێ کە ئەو فیرعەونەی موسا لە سەردەمی وی لەدایك بوو ئەو کاتە مرد کە موسا لە وڵاتی مەدیەن بوو، ئەمەش وێڕای ئەوەی ڕیوایەتی تەورات بێ ئەوەی بە گۆڕانی ناوی پاشا بکات لە گێڕانەوە بەردەوام دەبێت. کەواتە ئەو دوو برگەیەی تەورات کۆی ماوەی دەسەڵاتی هەردوو پاشاکە لەخۆدەگرێ کە موسا لە سەردەمی ئەواندا ژیاوە و بریتییە لە ٨٠ ساڵ.

بەڵام دەزانین کە ڕەمسیسی دووەم بۆ ماوەی ٦٧ ساڵ حوکمی کردووە(لە ١٣٠١ی تا ١٢٣٥ پێش زایین بەپێی ساڵنامەی دریتۆن و فاندییە یان لە ١٢٩٠ تا ١٢٢٤ی پێش زایین بەپێی ساڵنامەی ڕوتون)..سەبارەت بە منبتاحی جێنشینی شوێنەوارناسانی میسری ناتوانن ماوەیەکی دیاریکراوی دەسەڵاتەکەی بدەن بە دەستەوە بەڵام لە ١٠ ساڵ کەمتر نییە، چونکە چەند بەڵگەیەك هەن لەبارەی ساڵی دەیەمی دەسەڵاتەکەی، هەروەك باوکە دیڤۆ ئامارەی بۆ دەکات. بەڵام مانیتون بیست ساڵ بۆ دەسەڵاتەکەی دادەنێ.. بە نیسبەت منبتاحەوە دریتون و فاندییەش دوو ئەگەر دەڵێن: یان ئەوەتا لە ساڵی ١٢٣٤ ەوە ١٠ ساڵ حوکمی

کردووە، یان بەپێی قسەی ڕوتـون بـۆ مـاوەی بیسـت سـاڵ لـە ١٢٢٤ەوە تـاوەکو ١٢٠٤ی پێش زایین حوکمی کـردووە. شوێنەوارناسـانی میسـری لـەبارەی کۆتـاییی حوکمی منبتاحەوە هیچ شتێك نازانن: هەموو ئەوەی دەزانرێ ئەوەیە کە میسر بـۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك گرفتاری چەندان تەنگژەی ترسناکی ناوەخۆیی بوو.

ئەگەرچـی سـاڵنامەکانی دەسـەڵات ورد نـین بـەڵام بەدرێـژاییی دەوڵـەتی هـیچ ماوەیەکی تر نییە کە دوو دەسەڵاتی یەك بە دوای یەك بتوانێ بگاتـە هەشـتا سـاڵ یان تێیپەڕێنێ جگە لە ماوەی ڕەمسیسی دووەم و منبتـاح. پێدراوەکانی تـەورات تایبەت بە تەمـەنی موسـا کـاتێ دەسـتی کـرد بـە ئـازادکردنی براکـانی، نیشـانەی بەدوای یەکداهاتنی دەسـەڵاتی ڕەمسیسـی دووەم و منبتاحـە. هـەموو شـتێك ڕێ بەوە دەدات بـیر لـەوە بکەینـەوە کـە موسـا لـە سـەرەتای دەسـەڵاتی ڕەمسیسـی دووەم لەدایك بووە، کاتێکیش دوای ٦٧ ساڵ مرد ئەو لە مەدیەن بوو، دوای ئەوە موسـا لـە بەرانبـەر منبتـاحی کـوڕ و جێنشـینی ڕەمسـیس بوویـە داکۆکیکـار لـە عیبرییەکان. ئەگەر منبتاح بیست ساڵ حوکمی کردبێت ئـەو ڕووداوانـە لـە نیـوەی دووەمـی دەسـەڵاتەکەی ڕوویانـداوە، ئـەوەش بـەپێی بـیروڕای ڕۆتـون تـەواو ڕێـی تێدەچێ. لە کۆتاییی دەسـەڵاتی منبتـاحیش موسـا عیبرییـەکانی لـە میسـر بـردە دەرێ و فیرعـەونیش لـە کـاتی ڕاوەدوونانیـان گیـانی لەدەسـت دا، قورئـان و تەوراتیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن.

ئەم ڕوونکردنەوەیە تەواو ڕێك دەکەوێ لەگەڵ زانیارییـەکانی کتێبـە پیرۆزەکـان لـەبارەی بێشـکەی موسـا و هەڵگرتنـەوەی لەلایـەن خانـەوادەی فیرعەونـەوە. ئاشکرایە کە ڕەمسیسی دووەم لە دەمی مردنیدا بەتەمەن بووە. هەندێك وتوویانـە تەمەنی ٩٠ یان ١٠٠ سـاڵ بـووە. بـەم پێیـە لـە سـەرەتای دەسـەڵاتەکەی کـە ٦٧

ساڵی خایاندووە تەمەنی ٢٣ یان ٣٣ ساڵ بووە.لەم تەمەنەدا دەکرێ خێزاندار بووبێت و لێرەدا هیچ ناسازییەك نییە لەگەڵ ئەو قسەیەی قورئان کە دەڵێ (یەکێك لە ئەندامانی خانەوادەی فیرعەون) موسایان لە کەناری ڕووباری نیل لەناو بێشکەیەکدا دۆزیەوە و هاوسەری فیرعەون داوای لە شووەکەی کرد بە زیندوویی بیهێڵێتەوە. بەڵام تەورات دەڵێ کە کچەکەی فیرعەون دۆزیتیەوە.بە تێڕوانین لە تەمەنی ڕەمسیسی دووەم لە سەرەتای دەسەڵاتیدا تەواو ڕێی تێدەچێ ئەگەر کچێکی هەبووبێت ئەو موسای دۆزیبێتەوە، کەواتە لەم خاڵەدا ڕیوایەتی قورئان و ڕیوایەتی تەورات هەرگیز ناکۆك نین.

لێرەدا گریمانەی داڕێژراو بە شێوەیەکی ڕەها لەگەڵ قورئاندا هاوڕێکە. بەڵام بە پێچەوانەوە، تەنها لەگەڵ بڕگەیەکی تەوراتدا ناکۆکە ئەویش بریتییە لە ئایەتی یەکەمی ئیصحاحی شەشەم لە بەشی الملوك (ئەوەش بەشێك نییە لە تەورات و پێویستە ئاماژە بەمە بکرێ). ئەم بڕگەیە مایەی مشتومڕێکی زۆرە و باوکە دیڤۆش پێدراوەکانی زنجیرەی ڕووداوەکانی ئەم نووسراوەی پەیمانی کۆن ڕەت دەکاتەوە کە کاتی دەرچوون لە میسر بە نیسبەت بنیاتنانی پەرستگەی سولەیمانەوە دیاری دەکات. لەبەرئەوەی ئەم بڕگەیە پارێزی لێ دەکرێ بۆیە ئەوەش دەبێتە ئەوەی بەهای بەڵگەی یەکلاکەرەوەی پێ بدرێ لە دژی ئەو تیۆرەی ئێمە لێرەدا خستمانەڕوو.

## گرفتی پەیکەری ساڵی پێنجەمی منبتاح:

هەندێك رایان وایە کە لەوانەیە لە دەقی پەیکەری بەناوبانگی ساڵی پێنجەمی دەسەڵاتی منبتاح پەڵپێك هەبێت لەسەر ئەو پرسەی لێرە لەبارەی دەرچوون لە میسرِ خرایەڕوو کە ئەویش بە دوا کاری سەردەمی دەسەڵاتی ئەم فیرعەونە دادەنرێ.

ئەم پەیکەرە گرینگایەتییەکی گەورەی هەیە چونکە تاکە بەڵگەنامەی ناسراوی هیرۆگلیفییە کە تێیدا ئاماژە بۆ وشەی (ئیسرائیل) دەکرێ. ئەم پەیکەرە لە (طیبة) لە پەرستگەیەکی فیرعەون دۆزراوەتەوە و مێژووەکەی بە بەشی یەکەمی دەسەڵاتی منبتاح دەخەملێنرێ. ئەم بەڵگەنامەیە ئاماژە بۆ زنجیرەیەك دەکات کە فیرعەون بەسەر دراوسێیەکانی میسرِ بەدەستی هێناوە بە تایبەتی لە کۆتایی بەڵگەنامەکە ئاماژە دەکات بە سەرکەوتن بەسەر (ئیسرائیل کە سڕدرایەوە و تۆوی نەما..). بە پشتبەستن بەمە هەندێك دەڵێن کە بوونی وشەی (ئیسرائیل) ئەوە لەخۆدەگرێ کە یەهود لە ساڵی پێنجەمی دەسەڵاتی منبتاح لە خاکی کەنعان بووینە و دەرچوونی عیبرییەکانیش لە میسرِ بەر لەم کاتە ڕوویداوە.

وا پێناچێ ئەم پەڵپە قەبووڵکراو بێت، ئەمە وا دەگەیەنێ کە ماتووڵ عیبرییەکان لە میسرِ هەبوون کەواتە یەهود لە خاکی کەنعان نەبوون، ئەمەش مەسەلەیەکە ڕێی تێناچێ. وێڕای ئەوەی باوکە دیڤۆ لایەنگری دۆزی ڕەمسیسی دووەمە، لە کتێبەکەیدا (مێژووی کۆنی ئیسرائیل) سەبارەت بە نیشتەجێبوون لە خاکی کەنعاندا نووسیویەتی: ((سەبارەت بە باشوور ئەوا مێژووی جێگیربوونی ئەو گروپانەی سەر بە عیبرییەکان بوون لە ناوچەی (قادش) دیاریکراو نییە و ئەوە بەر

لە دەرچوون لە میسرە.)). کەواتە ئەو پێی وایە جێگیربوونی هەندێ گروپ کە لە کاتێکی غەیری کاتی دەرچوونی گروپی موسا لە میسر ئەوانیش لە میسر دەرچوونە شتێکی مەعقولە..(ئەبیرۆ) یان (هابیرۆ) کە هەندێك پێیان وایە ئیسرائیلییەکانن بەر لە رەمسیسی دووەم لە شام بوونە واتە بەر لە دەرچوون: بەپێی یەکێك لە بەڵگەنامەکان ئەمینوفیسی دووەم کۆمەڵێك دیلی هێناوە کە ٣٦٠٠ کەس بوونە و وەکو بێگار لە میسر بەکاریهێناون. هەروەها لە سەردەمی سیتی یەکەم ژمارەیەکی زۆریان لە خاکی کەنعان هەبوون بە جۆرێك لە ناچەی بیت – شیان پشێوییان نایەوە، (پ.مۆنتی) لە کتێبەکەیدا (میسر و تەورات) باسی ئەمە دەکات. بەم پێیە تەواو مەعقولێ دێتە بەرچاو کە منبتاح ئەم رەگەزانەی لەسەر سنووری وڵاتەکەی سزادابێت لە کاتێکدا لە ناوەوەی وڵاتدا هەمیشە ئەوانە هەبوون کە دواتر لە دەوری موسا خڕبوونەوە بۆ ئەوەی لە میسر رابکەن. بەم پێیەش پەیکەری ساڵی پێنجەمی منبتاح هەرگیز هیچ ناکۆکییەکی لەگەڵ ئەم گریمانەیەی لێرە خرایەڕوو نییە.

زیاتر لەوەش دەرکەوتنی وشەی (ئیسرائیل) لە مێژووی گەلی یەهودی هەرگیز پەیوەست نییە بە جێگیربوونی کۆمەڵی موسا لە خاکی کەنعان. بنجی وشەکە بەم شێوەیە:

بەپێی بەشی التکوین (٣٢، ٢٩) ئیسرائیل ناوی دووەمی یەعقوب کوڕی ئیسحاق و نەوەی ئیبراهیمە. بە گوێرەی قسەی ئەوانەی لەبارەی تەرجەمەی مەسکونی پەیمانی کۆنیان نووسیوە(١٩٧٥) رەنگە واتاکەی بریتی بێت لە: (تاوەکو خودا بەهێز دەرکەوێ). دوای ئەوەی ناوەکە بەسەر پیاوێکدا سەپا،

مایەی سەرسوڕمان نییە کە دواتر وەکو زیندووهێشتنەوەی یادی باوکی یەکەم وەسفی تەواوی کۆمەڵێکی پێ بکرێ.

کەواتە ناوی ئیسرائیل زۆر پێش موسا دەرکەوتووە، واتە سەتان ساڵ بەر لەو..ئەوەی کە ببینین ناوەکە لەسەر پەیکەرێك هەیە کە مێژووەکەی بۆ فیرعەون منبتاح دەگەڕێتەوە شتێکی سەیر نییە. ئەم ئاماژەیە بە هیچ بارێك نابێتە بەڵگەیەك بە قازانجی مێژووی دەرچوونی موسا بەر لە ساڵی پێنجەمی دەسەڵاتی منبتاح. لە ڕاستیدا کاتێ پەیکەرەکە ئاماژە بۆ کۆمەڵێك دەکات و ناوی دەنێ (ئیسرائیل) ناتوانێ ئاماژە بە جێگیربوونێکی سیاسییانەی ئەو کۆمەڵەیە بکات چونکە ئەم تۆمارکردنە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی بیستویەکی پێش زایین کە مەملەکەتی ئیسرائیل دروست نەببوو تا سەدەی دەیەمی پێش زایین. کەواتە ئەوان ئەو کات تەنێ گروپێکی مرۆیی بوون.

لە سەردەمی ئێستادا ئەوە زانراوە کە ماوەیەکی درێژ لە دروستبوون لەنێوان هەشت یان نۆ سەدە پێش دەرکەوتنی ئیسرائیل لە مێژوودا کەوتۆتەوە. ئەم ماوەیە بەوە مۆرکی گرتبوو کە کۆمەڵە نیوە — دەشتەکییەکانی هەموو ناوچەکە سەقامگیر بوون، لەوانیش بە تایبەت ئەموری و ئارامییەکان، هەروەها بە دەرکەوتنی باوانی یەکەمی نێو ئەم کۆمەڵانە مۆرکی گرتبوو لەنێویاندا ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب — ئیسرائیل. ناوی ئیسرائیل وەکو ئاماژەیەك بۆ کۆمەڵی بەرایی بەکارهاتووە کە بریتییە لە تۆوی کەسایەتییەکی سیاسی دوای دەسەڵاتی منبتاح دەرکەوت بە جۆرێك مەملەکەتی ئیسرائیل لە ٩٣١ی پێش زایین تاوەکو ٧٢١ی زایینی بەردەوام بوو.

## ٤- باسکردنی مردنی فیرعەون لە کاتی دەرچوونەکە لە لایەن کتێبە پیرۆزەکانەوە:

مردنی فیرعەون لە کاتی دەرچوونەکە خاڵێکی زۆر گرینگی گێڕانەوەکانی قورئان و تەوراتە. ئەوەش لە دەقەکاندا بەوپەڕی ڕوونی دەردەکەوێ. سەبارەت بە تەورات مردنی فیرعەون تەنها لە پێنج بەشەکەی موسا باس نەکراوە بەڵکو لە (مزامیر داود)یش باس کراوە: لە لاپەڕەکانی پێشوو ژێدەرەکانی ئەمەمان ڕوون کردۆتەوە.

ئەوەی زۆر مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە نووسەرە مەسیحییەکان لە بەرانبەر مردنی ئەم فیرعەونەدا بێدەنگن. باوکە دیڤۆ بەوە داکۆکی لە دۆزەکە دەکا کە دەڵێ دەرچوون لە میسر لە بەشی یەکەم یان نیوەی دەسەڵاتی ڕەمسیسی دووەم ڕووی داوە، هەرگیز ئەوەی لەبەر چاو نەگرتووە کە ئەم فیرعەونە لە کاتی ڕاوەدوونان مردووە، ئەوەش واتای ئەوەیە — گریمانەکان هەرچییەك بن — ڕووداوەکە نابێ قەومابێت تەنها لە کۆتایی دەسەڵاتدا نەبێ. لە کتێبەکەیدا (مێژووی کۆنی ئیسرائیل) وا دەرناکەوێ کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی کتێبی پیرۆز لە قودس کەمترین بایەخ بداتە ناسازی نێوان ئەو دۆزەی بەرگری لێ دەکات و پێدراوەکانی دوو بەشەکەی تەورات.

بەڵام (پ.مۆنتی) لە کتێبەکەیدا (میسر و تەورات) کاتی دەرچوونەکە لە سەردەمی منبتاح دیاری دەکات بەڵام بە یەك وشەش باسی مردنی فیرعەون ناکات کە سەرۆکی ڕاوەدوونەرەکان بوو.

ئەم هەڵوێستە سەیرە جیاوازە لەگەڵ هەڵوێستی یەهود: ئایەتی ١٥ی مزموری داود ژمارە ١٣٦ کە ستایشی خودا دەکات چونکە((فیرعەون و سوپاکەی فرێدایە ناوی دەریای البوصەوە)) باسی زۆرێك لە سروتەکانیان دەکات. ئەوان هاورێکیی نێوان ئەم ئایەتە و برگەی الخروج(١٤، ٢٨و ٢٩) دەزانن کە دەڵێ: ((ئاوەکە وەکو خۆی لێهاتەوە و ئامراز و سوارەکانی هەموو سوپای فیرعەونی داپۆشی کە بەدوایانەوە چووبوونە ناو دەریاوە و کەسیان لێ نەمایەوە.)). بە رای ئەوان کەمترین گومان لەوەدا نییە کە ئەم فیرعەونە لەگەڵ سوپاکەیدا لەناوچووە. هەمان ئەم دەقانە لە کتێبەکانی تەوراتی مەسیحی هەن.

نووسەرە مەسیحییەکان بەئەنقەست و پێچەوانەی هەموو روونییەك، مردنی فیرعەون دوور دەخەنەوە. بەڵام لەمە زیاتر، هەندێکیان باسی ئەم ئاماژەیە دەکەن کە لە قورئاندا هاتووە بەوەش داوا لە خوێنەران دەکەن کردەیەکی نزیکخستنەوەی سەیر ئەنجام بدەن.بەم جۆرە دەتوانین لەو وەرگێرانەی تەورات کە لەژێر سەرپەرشتیی قوتابخانەی کتێبی پیرۆز لە قودس ئەنجام دراوە ئەم لێدوانەی باوکە کوروایيە — کە مامۆستایە لەم قوتابخانەیە — سەبارەت بە مردنی فیرعەون بخوێنینەوە، دەڵێ:

((قورئان ئاماژەی بۆ دەکات(واتە مردنی فیرعەون) (لە ئایەتەکانی ٩٠ بۆ ٩٢ی سورەتی یونس). بەپێی کەلەپوری میللی بێت فیرعەون بە سوپاکەیەوە قوتدراوە(ئەمەش دەقی پیرۆز نایڵێ) ئێستا ئەو لە ژێر دەریا نیشتەجێ بووە و فەرمانرەوایی مەملەکەتی مرۆڤی دەریا دەکات واتە گۆلکی دەریا)) واتە فەقمە..

ئەو خوێنەرەی شارەزای ناوەڕۆکی قورئان نییە لەم حاڵەتەدا پەیوەندییەك لەنێوان قسەی قورئان کە ناکۆکە لەگەڵ دەقی تەورات و ئەم خورافە پێکەنیناوییە دروست دەکات کە هەروەك دەوترێ لە ئەفسانەی میللییەوە سەرچاوەی گرتووە و لە لێدوانەکەدا دوای ئاماژەکردن بۆ قورئان پەنجەی بۆ ڕاکێشراوە.

ڕاستیی وتەکەی قورئان سەبارەت بەم بابەتە هیچ پەیوەندییەکی بەم بابەتەوە نییە کە ئەم کتێبە هێمای بۆ دەکات: ئایەتەکانی ٩٠ بۆ ٩٢ی سوڕەتی یونس دەڵێن کە بەنی ئیسرائیل کاتێ فیرعەون و سوپاکەی ڕاویان دەنان ئەوان لە دەریاکە پەڕینەوە و فیرعەونیش لەناو دەریا لە سەرەمەرگدا هاواری دەکرد: ﴿آمَنْتُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ (٩٠)﴾ خوداش وەڵامی دایەوە: ﴿آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنْتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ (٩١) فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ (٩٢)﴾

سەبارەت بە مردنی فیرعەون هەر ئەمەیە هەموو ناوەڕۆکی ئەم سوڕەتە. نە لەم سوڕەتە و نە لە ئایەتی هیچ سوڕەتێکی تردا شتێك هەیە پەیوەندی هەبێت بەو وەهمانەی نووسەر لەبارەی تەوراتەوە زەقی کردوونەتەوە. دەقی قورئان بە سادەیی و بە شێوەیەکی تەواو ڕوون دەڵێ کە جەستەی فیرعەون ڕزگارکراوە و ئەوەش پێدراوێکی سەرەکییە.

لەو سەردەمەی قورئان لە ڕێی موحەممەدەوە (درودی خوای لێ بێت) گەیشتە خەڵك تەرمی هەموو ئەو فیرعەونانەی کە خەڵك لە سەردەمی ئێستادا بە ڕاست یان هەڵە گومانیان هەیە لەوەی پەیوەندییان هەبووە بە دەرچوونەکەوە لە گۆڕستانەکانی شیوی پاشایان لە (طيبة)ی کەنارەکەی تری نیل بەرامبەر شاری (أقصر)ی ئێستا نێژرابوون. لە سەردەمی موحەممەددا (درودی خوای لێ بێت)

هەموو شتێك لەم بارەیەوە نەزانراو بوو و ئەو تەرمانەش نەدۆزرانەوە تەنها لە کۆتاییی سەدەی نۆزدە نەبێ. هەروەکو قورئان دەڵێت جەستەی ئەم فیرعەونە ڕزگارکراوە. ئەم فیرعەونە هەر کام بێت ئێستا لە هۆڵی مۆمیاکراوەکانی پاشاییە لە مۆزەخانەی میسری لە قاهیرە و سەردانکەران دەتوانن ببینن. کەواتە واقع تەواو جیاوازە لەو ئەفسانە پێکەنیناوییەی باوکە کورواییە بە هەڵە بە قورئان گرێداوە.

## ٥- مۆمیای منبتاحی فیرعەون:

لە ساڵی ١٨٩٨ (لۆریت Loret) لە شیوی پاشایان لە (طیبة) مۆمیای منبتاح کوڕی ڕەمسیسی دووەمی دۆزیەوە، هەموو شتێك ڕێ بەوە دەدات کە باوەڕ بکەین ئەوە فیرعەونی دەرچوونەکەیە — لێرەوە مۆمیاکە بۆ قاهیرە گوێزرایەوە و (ئەلیۆت سمیس) لە ٨ی تەمووزی ١٩٠٧ بەستەرەکانی کردەوە.

(ئەلیۆت سمیس Elliot smith) لە کتێبەکەیدا (مۆمیای پاشایی The Royal Mummies) (١٩١٢) وەسفی پرۆتۆکۆلی ئەم پرۆسەیە و پشکنینی جەستەکە دەکات. ئەو کات پاراستنی مۆمیاکە گونجاو بوو ئەگەرچی دواتر لە هەندێ خاڵدا بەرەو خراپبوون ڕۆیشت. لەم مێژووەوە مۆمیاکە بە سەر و سینگ دەرخراوی لە مۆزەخانەی قاهیرەدا بۆ سەردانکەران نمایش کراوە، بەڵام بەشەکەی دیکەی جەستەی بە پارچە کوتاڵێك داپۆشراوە بە جۆرێك تا ئەم دواییە مۆزەخانەکەش وێنەی فۆتۆگرافی تەواوی جەستەی مۆمیاکەی نەبوو جگە لەو وێنانەی لە کتێبەکەی ئەلیۆتدا هەبووە(١٩١٢)..

لە حوزەیرانی ١٩٧٥ دەسەڵاتدارانی باڵای میسر ڕێیان پێدام دیراسەی بەشەکانی جەستەی فیرعەون بکەم کە تا ئەو کاتە داپۆشرا بوو هەروەها ڕێشیان پێدام هەندێ وێنەی بگرم. کاتێ بەراوردێك کرا لەنێوان دۆخی ئێستای مۆمیاکە لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە ٦٠ ساڵ لەمەوبەر بەجوانی ڕوون بۆوە کە دۆخی مۆمیاکە بەرەو خراپبوون چووە و بەشێکی ون بووە. هەندێکی بە هۆی دەستی مرۆڤ و هەندێکی تری بە هۆی زەمەنەوە زەرەرمەند بووە.

هۆکاری ئەم خراپبوونە سروشتییەش بە گۆڕانی دۆخی پاراستنی مۆمیاکەوە تەواو ڕوون دەبێتەوە لەوەتەی لە کۆتایی سەدەی نۆزەوە لە گۆڕێکی گۆڕستانی شاری (طيبة) دۆزراوەتەوە کە بۆ ماوەی زیاتر لە سێ هەزار ساڵ لەوێ بووە. ئێستاش لەژێر پارێزبەندێکی شووشەیی سادە نمایش کراوە کە بە شێوەیەکی تەواو لە کەشی دەرەوە جیای ناکاتەوە و ڕێگە لە پیسبوونی بە تەنۆلکەی میکرۆباوی ناگرێت، هەروەها دووچاری جیاوازیی پلەکانی گەرمی دەبێ کە بە هۆی شێداریی وەرزییەوە تووشی دەبێ. لەبەر هەموو ئەم هۆیانە مۆمیاکە تەواو دوورە لەو دۆخەی کە توانی بۆ ماوەی سێ هەزار ساڵ خۆی لەو هۆکارانەی خراپبوون بپارێزێ. بەستەرەکان و سیفەتی مانەوە لە ناوەندێکی داخراوی وەك گۆڕی لە دەست داوە کە لەوێ پلەی گەرما جێگیرتر و هەوا کەم شێدارترە لە کەشی هەندێ کاتی شاری قاهیرە. بێگومان لە گۆڕەکانی (گیبە)ی دووچاری کێشەی مارومێروو و گۆڕدزەکان بووە کە ئەوانەش بوونەتە هۆی هەندێ زیان، بەڵام وێڕای ئەمانەش وەك دەردەکەوێ دۆخەکە لەمڕۆ گونجاوتر بووە.

لە کاتی پشکنینی ئەم مۆمیایە لە حوزەیرانی ١٩٧٥ بە دەسپێشخەریی خۆم دەستم بە هەندێ لێکۆڵینەوەی تایبەت کرد. هەردوو دکتۆر(مەلیجی) و

(ڕەمسیس)یش بە تیشکی سینی لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکییان کرد. لە هەمان کاتیش د.مستەفا مەنیلاوی بە هۆی درزێک لە دیواری قەفەسەی سینگەوە لێکۆڵینەوەیەکی لە ناوەوەی قەفەسەی سینگ و سک کرد، بەوەش یەکەم لێکۆڵینەوە بە دووربینی ناوەکی لەسەر مۆمیاکە ئەنجام درا. بەوەش زۆر وردەکاریی گرینگی ناو جەستەکە بینرا و وێنەی گیرا.

ئەوەی دەکرێ لەم لێکۆڵینەوەیە هەڵێنجرێ بریتییە لە تێبینی کردنی چەندان ئافەتی گەورە لەگەڵ کەلێنێك لە جەستەکەدا — ڕەنگە هەندێکیان کوشندە بن — بێ ئەوەی بتوانین بڵێین کە هەندێکیان پێش یان دوای مردنی فیرعەون ڕووی داوە. ئەم فیرعەونە یان بەپێی ڕیوایەتەکانی کتێبە پیرۆزەکان بە هۆی نقومبوونەوە خنکاوە، یان بە هۆی شکانی زۆر توندەوە کە بەر لە قووتدانی دەریاکە ڕووی داوە مردووە یان لەوانەیە بە هۆی هەردوو هۆکارەوە بووبێت.

بەستنەوەی ئەم هەموو ئافەتە بەو خراپبوونەی باسی هۆکارەکانمان کرد وا دەکات پاراستنی ئەم جەستە مۆمیاکراوە لە داهاتوودا دژوار بێت گەربێتوو ڕێوشوێنی پێویست بۆ ڕزگارکردنی لە ئایندەیەکی زۆر نزیك نەگیرێتەبەر. ئەم ڕێوشوێنانە لە لەدەسچوونی تاکە شایەتی ماددی تاوەکو ئەمڕۆمان دووردەخاتەوە. شایەت لەسەر مردنی فیرعەونی دەرچوونەکە و لەسەر ئەو ڕزگاربوونەی خودا بۆ جەستەکەی ویستی.

ئەوەی هەمیشە مایەی ئومێدە ئەوەیە مرۆڤ کاربکات بۆ پاراستنی شایەتەکانی مێژووی، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە شتێکی لەمە گرینگترە: ئەو شایەتییەکی ماددییە لە جەستەیەکی مۆمیاکراوی کەسێك کە موسای ناسیوە و دژایەتیی داواکارییەکانی کردووە و ڕاوەدووی ناوە و لە کاتی ئەو ڕاوەدوونانەدا مردووە.

خوداش تەرمەکەی لە لەناوچوونی تەواو پاراستووە بۆ ئەوەی ببێتە نیشانە و بەڵگەیەك بۆ خەڵك هەروەك لە قورئاندا نووسراوە.

چ ڕوونکردنەوەیەکی جوانی ئایەتەکانی قورئانە ئەوەی تایبەتە بە جەستەی فیرعەون کە هۆڵی مۆمیاکراوە پاشاییەکانی خانەی شوێنەواری قاهیرە بە هەموو ئەوانەی دەبەخشێ کە دەیانەوێ لە پێدراوەکانی دۆزینەوە نوێیەکان بە دوای بەڵگەی ڕاست و دروستیی کتێبە پیرۆزەکاندا بگەڕێن!

## قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر و زانستی نوێ

قورئان تاکە ژێدەری عەقیدە و شەریعەت نییە لە ئیسلام. بەڵکو سوننەتی پێغەمبەر لە کردەوە و وتەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) سەرچاوەی دووەمە کە زاناکان بە بایەخیان بە دەسخستنی بۆتە تەواوکەری سەرچاوەی یەکەم، تەنانەت لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەریش وێڕای دوای کۆچی دواییکردنی. زانیارییەکانی ئەم سەرچاوەیە تەنها پشتی بە گواستنەوەی زارەکی دەبەست. بۆیە ئەوانەی ئەم قسە و کردەوانانەیان لە دەقدا کۆکردۆتەوە لێکۆڵینەوەی سەختیان ئەنجام داوە وەکو کۆکردنەوەی ڕووداوەکانی هەر بە سەرهاتێکی ڕابردوو. بۆیە خەمی یەکەم لە کارە قورسەکەیاندا یەکەم خاڵ بریتی بووە لە وردبینبوون لە تۆمارکردنی ئەم زانیارییانە کە تایبەتن بە هەر ڕووداوێکی ژیانی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) و هەر وتەیەك لە وتەکانی، بەڵگەش بۆ ئەم بایەخپێدانە لە ڕووی وردبوون و تۆمارکردنی ئەو فەرموودانە ئەوان هاتوون ناوی هەموو ئەو کەسانەیان هێناوە کە وتە و کردەوەکانی پێغەمبەریان(درودی خوای لێ بێت) گواستۆتەوە، ئەوەش بە هەڵکشان بۆ یەکەم کەس لەوانەی ڕاستەوخۆ فەرموودەکەیان لە موحەممەدەوە(درودی خوای لێ بێت) وەرگرتووە، ئەوەش بە ئامانجی ئاشکراکردنی دۆخی گێڕەرەوە(الراوی) لە هەموو زنجیرەی گێڕانەوەکەدا و دوورکەوتنەوە لەو ڕاوییانەی شایەتی ڕەوشتی باش و ڕاستگۆییان بۆ نادرێ یان هەر شتێکی تر کە لە نیشانەکانی لاوازیی ڕاوی بێت و ببێتە هۆی پشت پێ نەبەستنی لەو فەرموودەیەی لە ڕێی ئەوەوە گێڕدراوەتەوە. لەوەشدا زانایانی ئیسلام لەوەی لە پێغەمبەرەکەیان (درودی خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە بێوێنەن.

بەم جۆرە کۆمەڵێك وتە و کردەوەی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) دەرکەوت و ئێستا لە زانستە ئیسلامییەکاندا بە (زانستی فەرموودە) دەناسرێ. ئەگەرچی وشەی (الحدیث) ڕەنگە تەنها ئاماژە بێت بۆ وتە بەلام ڕیواتەکانی تایبەت بە کردەوەکانی پێغەمبەریش (درودی خوای لێ بێت) دەگرێتەوە.

یەکەم کۆمەڵە فەرموودە ڕاستەوخۆ دەیان ساڵ دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) بلاوکرایەوە. بڕی ئەو فەرموودانەی لە سەدەی یەکەمی دوای کۆچی دوایی کردنی کۆکرانەوە دیاریکراو بوو، گەورەترین کۆمەڵە فەرموودە دوای زیاتر لە دوو سەدە بەسەر کۆچی دوایی کردنی دەرکەوت کە فراوانترین و متمانەپێکراوترین زانیاری کۆکردۆتەوە، بە شێوەیەکی گشتی (صحیح البخاری) بە ڕاستترین کتێب دوای قورئان دادەنرێ. (هوداس Houdas) و (مارسی Marcais) لە ساڵانی ١٩٠٣ و ١٩١٤ لەژێر ناونیشانی (فەرموودە ئیسلامییەکان) تەرجەمەی فەرەنسییان کردووە. لەم ساڵانەی دواییش چاپێکی عەرەبی لەگەڵ تەرجەمەی ئینگلیزی لە لایەن دکتۆر محەمەد حەسەن خان لە زانکۆی ئیسلامی مەدینەی منەووەرە خرایە بازاڕەوە. بەم پێیە ئەوانەی عەرەبی نازانن دەتوانن بە زمانی تر شارەزای فەرموودەکان بن. بەلام لە بەرامبەر بەهای هەندێ تەرجەمەی ڕۆژئاواییەکان وریایی پێویستە بە تەرجەمەی فەرەنسیشەوە، هەندێ کات خوێنەر دەتوانێ شتی ناڕاست و پێچەوانەی ڕاستییەکانی تێدا بدۆزێتەوە، کە هەندێکیان تەئویل و لێکدانەوەن نەك تەرجەمەیەکی ڕاستەقینە، بەڵکو هەندێ جار بەلاڕێدابردنی گەورەی واتای ڕاستینەی فەرموودەکە هەیە تا ئاستێك وای لێ دەکات شتێك بڵێ کە مەبەستی نییە.

لێرەدا وا دەبینین کە گونجاو بێت بەراوردێك لەنێوان کۆمەڵە فەرموودەکان و ئینجیلەکاندا بکەین لە ڕووی بنجی ئەو دەقانەی تێیاندایە: سیفەتێکی هاوبەش لەنێوان هەموویاندا هەیە لەو ڕووەوەی کە ئەم فەرموودانە و ئینجیلەکان هەموویان بە قەڵەمی کەسانێك نووسراون کە بە چاوی خۆیان ئەو ڕووداوانەیان نەبینیوە کە گواستوویانەتەوە، هەروەها دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بە سەر ئەو ڕووداوانەی باسیان لێوە دەکات دەرکەوتوون. هەروەها کۆمەڵە فەرموودەکان وەکو ئینجیلەکان وایە لەو ڕووەوەی کە هەموویان بە ڕاست و دروست دانەنراون، بۆیە پسپۆڕانی بواری فەرموودە تەنها ژمارەیەکی کەمیان بە کۆی ڕا پەسندکردووە، وا دەبێ لە یەك کۆمەڵە فەرموودە لە پاڵ فەرموودەی دروستدا، فەرموودەی گومانلێکراو یان ڕەتکراوە هەبێ.

بەڵام بە پێچەوانەی ئینجیلە یاساییەکان کە نەکەوتۆتە بەر ڕەخنە و پەلپ لێگرتن وێڕای ئەوەی بە قەڵەمی کەسانێك نووسراون کە بە چاوی خۆیان ئەو ڕووداوانەیان نەبینیوە کە گواستوویانەتەوە کەچی کۆمەڵە فەرموودەکان تەنانەت ئەوانەشی کە بە تایبەت بە ڕاست دادەنرێن لەلایەن مامۆستایانی هزری ئیسلامییەوە کەوتوونەتە بەر نەشتەری پشکنینی ڕەخنەی قووڵ بۆ دیاریکردنی ئاستی پەسندکردن و کارپێکردنیان. بەڵام کتێبی بنەڕەتی کە قورئانە هەمیشە بەو سەرچاوەیە ماوەتەوە کە ناکرێ لەبارەی ڕاستودروستییەوە ببێتە جێی مشتومڕ، چونکە ئەو لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لێ بێت) بە شێوەیەکی کۆڕایی و بێ پچڕان گواستراوەتەوە و لە سەردەمی ژیانی خۆیدا بە قەڵەمی کەسانێك نووسراوەتەوە کە هەموویان شایەتی ئەو ڕووداوانە بوون کە تۆماریان کردووە. بەراوردێکم کرد لەنێوان ئەو سەرنجانەی لە لێکۆڵینەوەی فەرموودەکان دەستم کەوت لەگەڵ ئەو سەرنجانەی پێشتر سەبارەت بە قورئان و زانستی نوێ

خستمنەڕوو. ئاکامی ئەم بەراوردە زۆر گرینگ بوو: چونکە جیاوازییەکە زۆر ڕوون و سەرسوڕهێنەر بوو لەنێوان وردی و دروستی زانیارییە قورئانییەکان لە حاڵەتی بەراوردکردنی بە پێدراوەکانی زانستی نوێ هەر کاتێك ئەو زانیاریيانە تايبەت بن بە زانستە گەردوونییەکان لەگەڵ ئەگەری ڕەخنەی ڕوون بۆ هەندێ زانیاریی فەرموودەکان پەیوەست بە بابەتگەلێك کە دەچێتە ناخی مەیدانی زانستییەوە، بابەتی لێکۆڵینەوەکەشمان لێرەدا هەر ئەم فەرموودانەن.

ئەم بەراوردکردنە هەڵینام ئەم سەرنجە دەرببڕم: ئەگەر قورئان سروشی بێگومانی خودا نەبێ چۆن موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) چواردە سەدە لەمەوبەر توانی باسی ڕاستیگەلێکی زانستی لە قورئاندا باس بکات کە تەنها پێشکەوتنی زانستی لە سەدە نوێیەکانی توانی بیاندۆزێتەوە؟ ئەمەش پێچەوانەی ئەو فەرموودانەی کە ئاماژەیان بۆ هەندێ بابەتی زانستی کردووە کە شیاوی ڕەخنەلێگرتن و گومانە؟ من کاتێ ئاماژە بۆ هەندێ لەم فەرموودانە دەکەم تەنها ئەم فەرموودانەم گەرەکە کە بە شێوەیەکی گشتی بە ڕاست دانراون وەکو فەرموودەکانی (صحيح البخاري)..بەلام لێرەدا ئەوەشم لەبیرناچێت کە زانا پسپۆڕەکانی فەرموودەناسی لە کۆی ئەو فەرموودانەی (الظنية الثبوت)ن ئەو فەرموودانەیان پۆلێن کردووە کە شیاوی ڕەخنەلێگرتنن، ئەو فەرموودانە و ئەوانەشیان لێك جیاکردۆتەوە کە لە کۆی فەرموودە (القطعية)کان پۆلێن کراون، سەبارەت بە فەرموودەکانی (الظنية الثبوت) ئەوەیان ڕەچاو کردووە کە بە قەڵەمی کەسانێك نووسراون کە پشتیان بە گواستنەوەی زارەکی بەستووە، بەمەش لە ئاکامی هەڵەی ئەو ڕاوییانەی ئەم فەرموودانەیان بە ڕێگای هەواڵی (آحاد)ەوە گواستۆتەوە وردییان کەم دەبێتەوە، ئەوانەی توانای تەواوی

لەبەرکردنی ئەوەی بیستوویانە نەبووە و ئاگاداری دۆخی ئەو قسەیەش نەبوون کە گواستوویانەتەوە.

بەم جۆرە سەر لە نوێ لامان یەکلادەبێتەوە کە ڕاستییە زانستییەکانی قورئان هەر وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە، هەموویان بەڵگەی ئەوەن کە دەقەکانی قورئان دەقگەلێکن دەستی مرۆڤی تێدا نییە و بێگومان سروشی خودایی، ئەوەش پێچەوانەی دەقی فەرموودە(الظنیة)کان لە (أخبار الآحاد) کە لە ڕووی (الثبوت)ەوە ناگرێ بگاتە ئاستی سروشی خودا کە (متواتر)ە، ئەوەش بە هۆی ئەوەی ڕەنگە هەڵەی ڕاوییەکانی تێ بکەوێ. سەرباری هەموو ئەوەش لەوانەیە فەرموودەکە ڕاست بێت و گومانی تێدا نەبێت بەڵام ماتووڵ لەبارەی بابەتێکی دونیاییە کە پەیوەندی بە ئایینەوە نییە ئەو کات هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) و کەسێکی تر، لەوبارەوە لە زاری پێغەمبەرەوە(درودی خوای لێ بێت) لە (صحیح المسلم)دا هاتووە: ((إذا أمرتکم بشيء من دینکم فخذوا به، وإذا أمرتکم بشيء من رأيي فإنما أنا بشر)) هەروەها (السرخسي) لە (أصول)ەکەیدا لە زاری پێغەمبەری (درودی خوای لێ بێت) گواستۆتەوە: ((إذا أتیتکم بشيء من أمر دینکم فاعملوا به، وإذا أتیتکم بشيء من أمر دنیاکم فأنتم أعلم بأمر دنیاکم))، بە شێوەیەکی گشتی خودی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) پشتیوانی لە سەرنجەکانمان دەکات و دانی بەو جیاوازییانەدا ناوە کە لە نێوان بابەتە زانستییە بێگومانەکانی قورئان کە زانستی نوێ پاڵپشتی کردووە و هەندێ لەو بابەتانەی فەرموودەدا هەیە کە وەحی نییە کاتێ فەرموودەکە پەیوەست بێت بە کارێك لە کارەکانی دونیا کە ڕەنگە هەندێ جار لەگەڵ ڕاستییەکانی زانستی نوێ تێك نەکاتەوە، ئەوەش زیان بە پایەی

پێغەمبەریێتی یان مرۆیی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) ناگەیەنێ بەلام لە هەموو بارێکدا سوودبەخشە چونکە لەم بابەتانەدا وێنەیەکمان دەداتێ لەبارەی تێگەیشتنەکانی ئەو سەردەمە و ڕاوبۆچوونیان سەبارەت بە هەندێ بابەتی زانستییانە.

لە دیارترین ئەو فەرموودە دونیاییە نائاینییە (الظنیانە) ژمارەیەك لەو فەرموودانەن کە پەیوەستن بە پزیشکییەوە بە زانینی ئەوەی کە قورئان بە شێوەیەکی تایبەت هیچ ئاماژەیەکی هونەرییمانمان نادانێ لەبارەی پیشەی پزیشکایەتی جگە لەو ئاماژە پێکردنەی لە ئایەتی ٦٩ی سوڕەتی (النحل)دا نەبێ کە دەڵێ لە هەنگویندا چارەسەر هەیە بەلام بە بێ ئەوەی ڕوونکردنەوەی زیاتر بدات، بەلام فەرموودەکان ئەم جۆرە بابەتانەیان زۆر تێدایە. بەم جۆرە لە صحیح البخاری بەشێکی تایبەت هەیە بە پزیشکایەتی. زێدەباری ئەوە فەرموودەی تری تایبەت بە چارەسەر هەن کە ئاوێتەی بەشەکانی تری صحیح البخاری کراون. لێرەدا هیچ گومانێك نییە کە ئەم لاپەڕانە گەلێك فەرموودەی (الظنیة)یان تێدایە، ئەگەرچی ئەم بابەتە پەیوەستە بە کاروباری دونیای نائایینییەوە، لەوبارەوەش پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) وتوویەتی: ((فأنتم أعلم بأمور دنیاکم)).. بەلام بە تێڕوانینی ئێمە کۆی گشتی ئەم فەرموودانە کە پەیوەستن بە بابەتە پزیشکییەکانەوە زۆر گرینگن چونکە بیرۆکەی ئەو سەردەمەمان لەبارەی ئەم بابەتە پزیشکییە جیاوازانەوە پێ دەدەن.

بەم جۆرە لەم فەرموودانەدا بیرۆکەگەلێك لەبارەی ئازار و چاوپیسی و جادوو و توانای ڕزگاربوون لە شوێنەوارەکانی جادوو کەشف دەکەین، دەبێ بشزانین کە لێرەدا قەدەغەکردنێك هەیە لەوەی بە بەکارهێنانی قورئان بۆ ئەم مەبەستە پارە

پەیدا بکەین، هەروەها فەرموودەیەکیش هەیە هێما بۆ ئەوە دەکات کە هەندێ خورما لە ئەنجامەکانی جادوو دەتپارێزێ و هەروەها دەشکرێ دژی پێوەدانە ژەهراوییەکان بەکاربهێنرێ.

ئەمە و پێویست ناکات سەرسام بین کاتێ لەبارەی سەردەمێکەوە دەدوێین کە توانا هونەری و دەرمانسازییەکانی تێیدا سنوردار بوون، ئەگەر بینیمان لەوێدا ئامۆژگاری هەیە بۆ پەنابردنە بەر هەندێ ڕێوشوێنی پێویست یان چارەسەری سروشتی وەك: خوێنبەردان و کەڵەشاخ و داخکردن و سەرتاشین دژی ئەسپێ و بەکارهێنانی شیری حوشتر و هەندێ دەنکۆڵەی وەکو ڕەشکە و هەندێ ڕووەکی وەکو(القسط الهندی) و خۆڵەمێشی حەسیر لەو سوودانەی بۆ ڕاگرتنی خوێنبەربوون هەیەتی، چونکە لە بارودۆخی دژواردا دەبێ هەموو هۆکارێکی شیاو بەکاربهێنرێ کە ڕەنگە بە ڕاستی سوودبەخش بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە لای ئێمەوە ئامۆژگاریکردن بە خواردنەوەی میزی حوشتر بۆ چارەسەرکردنی هەندێ حاڵەت بیرۆکەیەکی باش و قەبووڵکراو نییە.

هەروەها لە سەردەمی ئێستاماندا وا دەردەکەوێ سەخت بێت هەندێ ڕوونکردنەوەی پەیوەست بە زانستی نەخۆشییەکان قەبووڵ بکرێن، ئەوەش وەکو ئەم ڕوونکردنەوانە:

(أ) لەبارەی (بنچینەی تا)وە چوار دەق هەیە کە پێی وایە (الحمى هى من فيح جهنم – تا لە هاڵاویی دۆزەخەوەیە) – كتاب الطب، بەشی ٢٨، لاپەڕە ٤١٦.

(ب) قسەیەك هەیە سەبارەت بە (بوونی چارەسەر بۆ هەموو نەخۆشییەك) لە فەرموودەدا هاتووە کە: ((لم ينزل الله داء إلا وأنزل له علاجا))– كتاب الطب – بەشی ١، لاپەڕە ٣٩٥، لەو فەرموودەیەی باسی مێش دەکات ڕوونکردنەوەیەك

هەیە بۆ ئەم تێگەیشتنە: ((إذا وقع الذباب في إناء أحدكم فليغمسه كله، ثم ليطرحه، فأن في أحد جناحيه داء و في الاخر شفاء))- كتاب الطب، بەشی ٥٨، لاپەڕە ٤٥٢، كتاب بدء الخلق، باسی ٥٤، بەشەكانی ١٥و١٦، لاپەڕە ٣٣٥.

(ج) قسەیەك هەیە سەبارەت بە (لەبارچوون) لە كاتی بینینی جۆرە مارێكی دیاریكراو كە دەبێتە هۆی (كوێربوون)یش، ئەمەش لە باسی (بدء الخلق) لە هەردوو بەشی ١٣و١٤ لە لاپەڕەكانی ٣٣٠ — ٣٣٥دا هاتووە.

(د) هەروەها لەبارەی خوێنبەربوونی جیا لە سوڕی مانگانە، لە (كتاب الحيض) لە باسی شەشەم لە (صحيح البخاري)دا دوو فەرموودە لەبارەی خوێنبەربوونی دەرەوەی سوڕی مانگانە(بەشی ٢١، ٢٨)دا هاتووە. ئەم دوو فەرموودەیە تایبەتن بە دوو ئافرەت، فەرموودەیەكیان تەئكید لەوە دەكاتەوە كە خوێنبەربوونەكە بە هۆی دەمارێكەوەیە، بەڵام فەرموودەكە لەبارەی ماكەكانەوە هیچ ڕوونكردنەوەیەكی نەداوینەتێ، حاڵەتەكەی تر باسی ئافرەتێكە ماوەی حەوت ساڵ جیا لە خوێنی بێنوێژی خوێنی لێ دەڕوات، لەم بارەوەش فەرموودەكە هەر تەئكید لەوە دەكاتەوە كە خوێن لێ ڕۆیشتنەكە بە هۆی دەمارەوەیە. دەكرێ چەند گریمانەیەك بڵێین لەبارەی هۆكاری ڕاستەقینەی ئەم تێكچوونانە بەڵام بۆ دڵنیابوونەوە لەم دیاریكردنە كە ڕەنگە ڕاستیش بێت زانینی ئەو بەڵگەیەی ئەو كات پشتی پێ بەستووە دژوارە.

(ه) هەروەها وتەیەك هەیە لەبارەی (نەتەنینەوەی هەندێ نەخۆشی)، ئەوەش لە چەند شوێنێكی (صحيح البخاري)دا هەیە، جارێك لە كاتی قسەكردن لەبارەی هەندێ حاڵەتی تایبەتەوە وەكو: گولی، تاعون، گەڕی حوشتر، جارێكی تریش بە شێوەیەكی گشتی. بەڵام ئەو وتانە لەبارەی ئەو حاڵەتە تایبەتانەوە هەندێ قسەی

پێچەوانەی تری لەگەڵدا دێن. بەم جۆرە هەندێ فەرموودەی تر هەن ئامۆژگاری دەکات کە نەچینە ئەو شوێنانەی تاعونی لێیە، هەروەها ئامۆژگاریمان دەکات بەخێرایی لە کەسی گول ڕابکەین.

لە هەموو ئەوانە ئەوەمان دەست دەکەوێ کە دەتوانین بڵێین هەندێ فەرموودە هەیە لە بابەتی پزیشکایەتی و چارەسەرکردن لە ڕووی زانستییەوە قەبووڵکراو نییە و گومان سێبەری بەسەردا کردووە، سەرباری ئەوەش پەیوەستن بە کاروباری دونیاوە نەك بابەتی ئاین. سوودی ئاماژەپێکردنیشی تەنها بۆ بەراوردکردنیەتی لەگەڵ دەقە زانستییەکانی قورئان کە لێکۆڵینەوەیان سەلماندوویەتی کە: هەرگیز لەوەدا شتێکی ناڕاستی تێدا نییە، بۆیە ئەم بەراوردکارییە سوودێکی گەورەی هەبوو چونکە هەروەك بینیمان گەواهی بۆ قورئان دەدات کە سروشی خودایە و گومانی تێدا نییە و دەبێ مرۆڤ دان بەمەدا بنێت.

زێدەباری ئەم نموونانەی فەرموودە کە لە پێشەوە باسمان کرد کە لە بابەتی پزیشکایەتی و چارەسەر لە ڕووی زانستییەوە قەبووڵکراو نەبوو، هەندێ فەرموودەی تریشمان هەیە کە لە(أخبار الأحاد)ن و پەیوەندییان بە کاروباری ئاینەوە نییە بەڵام دەکرێنە تەفسیر بۆ هەندێ ئایەتی قورئان لەبارەی گەردوون و خولگەی خۆر و قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلە کە لەم سەردەمەماندا ناکرێ وەکو تەفسیری ئایەتەکان قەبووڵ بکرێن.

بەم چەشنە پێشتر لە باسی ئایەتە زانستییەکان لەبارەی خۆرەوە دەرکەوت کە ﴿تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا﴾ ئایەتی ٣٨ی سورەتی(یس)، بۆمان ڕوون بووەوە کە ئەوە لە سەیروسەمەرەکانی زانیارییە گەردوونییەکانی قورئانە کە تەنها لە زانستی نوێدا دۆزراوەتەوە.بەڵام فەرموودەیەك هەیە کە ڕەنگە بە تەفسیری ئایەتە

قورئانییەکە دابنرێ پێی وایە کە (کاتێ خۆر ئاوا بوو ئەوا لەژێر عەرشی خودادا کڕنووش دەبات و مۆڵەتی لێ وەردەگرێ کە بە ڕێگەی خۆیدا بگەڕێتەوە و دووبارە کڕنووش بباتەوە. لە کۆتاییدا دەگەڕێتەوە ئەو شوێنەی لێوەی هاتووە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ هەڵبێتەوە). دەقی ئەسڵی ئەم فەرموودەیە لە بابەتی (بدء الخلق)ی (صحیح البخاری)دا هاتووە. ئەگەرچی ئەم فەرموودەیە لێڵە و وەرگێڕانی دژوارە بەڵام وێنەیەکی مەجازی لەخۆدەگرێ کە زانیاریی تایبەت بە (خولگەی خۆر بە دەوری زەوی) تێدایە کە لە ڕواڵەتیدا لەگەڵ زانستی نوێدا ناگونجێ کە پێچەوانەکەی سەلماندووە. ئەم فەرموودەیە لە واتای دیاریدا دەردەکەوێ کە لە (ظني) زیاترە و لە (أخبار ألآحاد)یشە هەروەك لە زانستی فەرموودەدا هاتووە، هەر فەرموودەیەکیش وەها بوو سوودی بۆ (العلم القطعي) نییە.

هەمان شت سەبارەت بە قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلەش وایە، بڕگەیەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە بە شێوەیەکی سەیر کاتە پێویستەکانی گەشەسەندنی کۆرپەلە لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا دیاری دەکات، ئەوەش هەر لە هەمان باسی (بدء الخلق) لە (صحیح البخاری)دا هاتووە، قۆناغێك هەیە بە چل ڕۆژ دیاری کراوە کە تێیدا توخمە پێکهێنەرەکانی مرۆڤ کۆدەبێتەوە، پاشان قۆناغێکی تر وەکو ئەوەی پێشوو کۆرپەلە دەبێتە(علقة)، پاشان قۆناغی سێیەم لە ماوەی چل ڕۆژی تردا دەبێتە کوتە گۆشتێك(مضغة). پاشان دوای ئەوە فریشتە دێت بۆ دیاریکردنی ئایندەی ئەم مرۆڤە، پاشان ڕۆحی بە بەردا دەکرێ، وەسفکردنی گەشەکردنی کۆرپەلە لەم فەرموودە (الظني)ەدا لەگەڵ زانیارییە زانستییە نوێیەکاندا تێك ناکاتەوە. بەڵام دەقی قورئان لەمبارەیەوە سەبارەت بەو دیاریکردنە زەمەنییە بێدەنگ بووە کە مایەی هیچ ڕەخنەیەك نییە.

لە ڕاستیدا پێویستە خوێنەر بزانێ کە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) لە کاتی مردنیدا بۆ دوو کۆمەڵە دابەش بوو:

— لە لایەك ژمارەیەکی زۆر ئیماندار هەبوون کە قورئانیان لەبەر بوو و بەردەوام وەکو پێغەمبەریان(درودی خوای لێ بێت) دەخوێندەوە. زێدەباری ئەوەش تەواوی قورئان تۆمار کرابوو، ئەم تۆمارکردنەش لە سەردەمی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت)و بە فەرمانی وی کرابوو.

— لە لایەکی تریشەوە هاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) و ئیمانداران ئەوانەی بە چاوی سەر ڕەفتار و گفتاری ویان دیتبوو هەموو ئەوانەیان لە یادگەی خۆیان لەبەرکردبوو و سەرباری قورئان بۆ ناسینی عەقیدە و شەریعەت پشتیان پێ دەبەست.

بەڵام زۆری نەبرد ئەم ڕێنماییانەی قورئان و پێغەمبەر لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) لە دوو کۆمەڵەی جیا کۆکرانەوە. کۆمەڵەی یەکەم بریتی بوو لە دەقەکانی قورئان کە بە شێوەیەکی فەرمی لە سەردەمی هەردوو خەلیفەکان ئەبوبەکر و عوسمان کۆکرایەوە بەتایبەتی لە خەلافەتی ئەمەی دوایی دوا دەقی قورئان بەسەر هەموو هەرێم و شارە ئیسلامییەکان گشتێندرا. هەموو ئەوەش لەنێوان ساڵی دوازدە و ساڵی بیستوچواری کۆچی بە ئاگاداری هەموو شایەتەیانەکان لەوەی بیستوویانە و لەبەریان کردووە یان تۆماریان کردووە ئەنجام دراوە.

سەبارەت بە فەرموودەش یەکەم کۆمەڵە فەرموودە چل ساڵ دوای کۆچکردن(ی پێغەمبەر لە مەککەوە بۆ مەدینە) دەرکەوت.

لێرە بە پێویستی دەزانین کە جەخت لە پێکنەچوونی ئەم دوو کۆمەڵەیە بکەینەوە: قورئان و فەرموودە، جا لە ڕوانگەی ئەدەبییەوە بێت، یان هەندێ کات لە ڕوانگەی ناوەڕۆکیان لەبارەی هەندێ بابەتی زانستییانەوە. بەم جۆرە ئەستەمە هیچ بەراوردێك لەنێوان شێوازی قورئان و شێوازی فەرموودە بکرێ، هەروەها ئەگەر ئێمە ناوەڕۆکی دەقەکانی قورئان و ناوەڕۆکی دەقەکانی فەرموودەمان لەو بابەتانەی پەیوەندییان بە زانستەکانەوە هەیە نەك عەقیدە و یاسادانان بەیەکەوە بەراورد کرد و، لەگەڵ پێدراوەکانی زانستی نوێ پێکمان گرتن ئەوا بە ڕاستی جیاوازییەکانی نێوانیان واقوڕماومان دەکەن:

یەکەم: لە لایەکەوە بیروباوەڕی زانستیی قورئانی هەندێ کات لە ڕواڵەتیدا قەبووڵکراو نەبووە، بەڵام کاتێ لەژێر ڕۆشنایی زانیارییە نوێیە نەگۆڕەکان لێی کۆڵراوەتەوە دەرکەوت کە پێدراوی زانستی وای تێدایە کە زانست لە سەردەمی نوێدا تەنێ توانیویەتی حەقیقەتەکەی بسەلمێنێ.

دووەم: لە لایەکی ترەوە سەبارەت بە هەندێ دەقی فەرموودە کە پەیوەستە بە بابەتە زانستییەکان و هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینەوە نییە ئەوا هەندێ ڕاوبۆچوونی تێدایە کە ئەمڕۆ لە ڕووی زانستییەوە قەبووڵکراو نییە، بەڵام وا دەردەکەوێ بۆمان کە ئەم فەرموودانە گوزارشت لە تێگەیشتنەکانی ئەو سەردەمە لەبارەی ئەم بابەتانەوە دەکەن، تەنانەت ئەگەر لەوەشدا ڕاست بن کە وەپاڵ خودی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) دراون. ئەم ڕاوبۆچوونە دونیاییانە خزێنراونەتە نێو کۆمەڵێك دەقەوە کە پەیوەستن بە عەقیدە و شەریعەتی ئیسلامی کە هەمووان کۆکن لەسەر دانانان بە دروستبوونیان و مشتومڕنەکردن لەبارەیانەوە.

دواجار ئەو جیاوازییانەی پێی گەیشتین سەبارەت بە کاروبارە زانستییە دونیاییەکانی نێوان قورئان و فەرموودە خودی موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) پشتیوانی لێ دەکات کاتێ دەڵێ: ((کاتێ بە شتێکی ئاینەکەتان فەرمانم پێکردن ئەنجامی بدەن، ئەگەریش سەبارەت بە شتێك لە رای خۆم فەرمانم پێکردن ئەوا من مرۆڤم.)). لە ریوایەتێکی تریشدا هاتووە: ((ئەگەر شتێکم لەبارەی کاروباری دونیاکەتانەوە باس کرد ئەوا ئێوە خۆتان شارەزاترن بە کاروباری دونیاتانەوە.)).

بەم جۆرە کۆتایی بەم بەراوردکردنەی نێوان قورئان و فەرموودە لە کاروبارە زانستییە دونیاییەکان دێنین و جەخت لەوە دەکەینەوە کە ئەم جیاوازییانە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەیسەلمێنێ کە: قورئان سروشێکی نووسراوی گومان لێ نەکراوە، بۆیە لە هەموو هەڵەیەکی زانستی لەم جۆرە پارێزراوە. بەلام قسەی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) لەبارەی ئەم کاروبارە دونیاییانە کە سروشی تێدا نییە تەنانەت ئەگەر وەپاڵدرانەکەی ڕاستودروست بێت ئەوا هەر قسەی مرۆڤە هەڵە دەکا و دەشپێکێ ئەوەش هەر بە پێی قسەی خودی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) کە پێشتر ئاماژەی پێدرا، بۆیە جیاکاری لەسەر ئەم بنچینەیە لەنێوان قسەی قورئان و قسە مرۆییە دونیاییەکانی موحەممەد جیاکارییەکی پێویستە و هێزە بۆ قورئانیش و تەئکیدکردنەوەیە لەوەی کە سروشێکە جێی گومان نییە، هەروەها هێزیشە بۆ خودی موحەممەدیش(درودی خوای لێ بێت) ئەوەش بەوەی کە بەڵگەیەکە بۆ ڕاستگۆیی ئەو لە گواستنەوەی وتەکانی خودا لە ڕێی وەحیەوە کە تەواو لە قسەی مرۆڤ جودایە، ئەوەش وەکو بەڕاست زانینی ئەو وتەی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت): ((ئەگەر بە پێی ڕاوبۆچوونی خۆم شتێکم پێ گوتن ئەوا منیش مرۆڤم))..

## دوماهییەکی گشتی

لە کۆتاییی ئەم توێژینەوەیەدا بە ڕوونی دەردەکەوێ کە ڕای باو لە وڵاتەکەماندا کە پێداگری لەسەر دەکرێ لەبارەی دەقی ئەو کتێبە پیرۆزانەی ئەمڕۆ لەبەردەستماندایە لەگەڵ واقیع تێك ناکاتەوە. بینیمان لە چ دۆخ و لە چ سەردەمێك و بە چ ڕێگایەك کۆکراوەتەوە و نووسینی ئەو توخمانەی پەیمانی کۆن و ئینجیلەکان و قورئانی لێ پێکهاتووە گواستراوەتەوە، لەبەرئەوەی دۆخی لەدایکبوونی ئەم سێ کتێبە تەواو لێك جیاواز بووە بۆیە ئاکامی زۆر گرینگی پەیوەست بە ڕاستودروستیی دەقەکان و هەندێ لایەنی ناوەڕۆکیانی لێ کەوتۆتەوە.

پەیمانی کۆن لە کۆمەڵێك دانراوی ئەدەبی پێکهاتووە. بە نزیکەیی لە ماوەی نۆ سەدە بەرهەم هاتووە، لە کۆمەڵێك دەقی زۆر لێك دوور و جودا پێکهاتووە و مرۆڤ بە درێژایی ساڵەکان دەسکاری کردووە، هەندێ بەش بۆ هەندێ بەشی تر کە پێشتر هەبووە زیادکراوە، بە جۆرێك ئەمڕۆ هەندێ کات ناسینەوەی سەرچاوەی ئەم دەقانە زۆر دژوارە.

ئامانجی ئینجیلەکان لە ڕێی گێڕانەوەی کردەوە و وتەکانی مەسیح بەو ڕێنماییانەی ویستوویەتی دوای تەواوبوونی پەیامەکەی لەسەر زەوی بۆیان بەجێ بهێڵێ بریتی بووە لە ناساندنی مرۆڤ، شتی خراپ ئەوەیە کە ئینجیلەکان بە پێنووسی ئەو کەسانە نەنووسراوە کە خۆیان ئەو ڕووداوانەیان بینیوە کە گێڕاویانەتەوە. بە سادەیی بریتییە لە گوزارشتی قسەبێژان بە ناوی تائیفە یەهودییە مەسیحییە جیاوازەکان لەو زانیارییانەی ئەو تائیفانە سەبارەت بە ژیانی گشتیی مەسیح هەیانبووە ئەوەش لە شێوەی قسەی زارەکی یان نووسراوی

دەماودەم کە دوای ئەوەی ڕۆڵی ناوەندگیری لە نێوان کەلەپوری زارەکی و دەقی کۆتایی دەگێڕا ئەمڕۆ نەماون.

لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا دەبێ ئەمڕۆ بڕوانینە نووسراوە یەهودییە — مەسیحییەکان، ئەگەریش بمانەوێ بابەتی بین دەبێ واز لە تێگەیشتییە تەفسیرییە کلاسیکییەکان بێنین.

ئاکامی حەتمی فرەیی سەرچاوەکان بریتی بوو لەو ناسازی و ناکۆکییانەی چەندان نموونەمان لەبارەوە هێنایەوە. لەبەرئەوەی نووسەرانی ئینجیلەکان لە بەرانبەر مەسیحدا هەمان شارەزووی زلکردنی هەندێ شتیان وەکو نووسەرانی ئەدەبی داستان لە سەدەکانی ناوەڕاست بەرامبەر داستانە لیریکیە پاڵەوانێتییەکان هەبوو بۆیە ئەنجامی ئەمە ئەوە بوو کە ڕووداوەکان لای هەر ڕاوییەك بە شێوەیەکی تایبەت خراوەتە ڕوو، بۆیە ڕاستودروستیی ئەو شتانەی گێڕدراونەتەوە لە زۆر حاڵەتدا زۆر جێی گومانە. لەم دۆخەدا هەندێ وتە لە نووسراوە یەهودی مەسیحییەکان کە ڕەنگە پەیوەندییەکیان بە زانیارییە نوێیەکانەوە هەبێ پێویستە بە پارێزییەوە بتوێژرێتەوە.

ناسازی و شتی نامەعقوڵ و ناکۆکی لەگەڵ پێدراوەکانی زانست لەگەڵ هەموو ئەوانەی پێشوو بەتەواوی ڕوون دەبێتەوە. بەڵام حەپەسانی مەسیحییەکان ئەو کاتە بە ڕاستی گەورە دەبێ کە پەی بە هەموو ئەمانە دەبەن، هەوڵ و کۆششی زۆرێك لەو نووسەرە ڕەسمییانە قووڵ و بەردەوام بووە کە تا ئەو کاتە داویانە بۆ شاردنەوەی ئەو شتانەی بە هۆی توێژینەوە نوێیەکان بە ئاسانی ڕوون دەبنەوە، ئەو شتانەی ئەو نووسەرانە لەژێر ناونیشانی پاڵەوانێتیی جەدەلییانەی زیرەکانەی ڕۆچوو لە ڕۆمانسییەتی ستایشکارانە شاردوویانەتەوە. چەند نموونەیەکمان دا بە دەستەوە کە هێمای بۆ ئەم عەقڵییەتە دەکرد بەتایبەتی سەبارەت بە هەر دوو ڕەچەڵەکی مەسیح

لە ئینجیلەکانی متی و لوقا کە لە ڕووی زانستییەوە ناساز و ڕەتکراوە بوو. ئینجیلی یوحناش بە هۆی جیاوازییە زۆر گرینگەکانی لە سێ ئینجیلەکەی تر بە شێوەیەکی تایبەت سەرنجی بە لای خۆیدا ڕاکێشابوو بە تایبەت ئەوەی پەیوەستە بەو کەلێنەی سەبارەت بە دامەزراندنی قوربانی پیرۆز نەزانراو بوو.

* * *

هاتنەخوارەوەی قورئان مێژوویەکی هەیە تەواو جیاوازە لە مێژووی پەیمانی کۆن و ئینجیلەکان. هاتنەخوارەوەی ماوەی بیست ساڵی خایاندووە و لەگەڵ هاتنی جیبریل بۆ لای موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) و هێنانی قورئان موسڵمانەکان لەبەریان دەکرد بەڵکو تەنانەت لە سەردەمی ژیانی موحەممەدیشدا(درودی خوای لێ بێت) بە نووسین تۆمارکراوە. کۆکردنەوەکانی دواتری قورئان کە لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا کرا سوودی وەرگرت لەو چاودێرییەی ئەوانەی دەقەکەیان لەبەر بوو ئەنجامیاندا، دوای ئەوەی لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئاندا فێری ببوون و دواتریش بەردەوام دەیانخوێندەوە. ئاشکراشە کە دەقەکە لەو سەردەمەوە بە شێوەیەکی ورد بە پارێزراوی ماوەتەوە. قورئان گرفتی پەیوەست بە ڕاستودروستی نییە.

قورئان نەك هەر خاڵییە لە ناسازییەکانی گێڕانەوە کە ئەوە سیفەتێکی زەقی سەرجەم دارشتەکانی ئینجیلەکانە، بەڵکو بۆ هەر کەسێك کە بابەتییانە و لەژێر ڕۆشنایی زانستدا بیتوێژێتەوە مۆرکی تایبەتی خۆی دەردەخات کە بریتییە لە سازانی تەواو لەگەڵ پێدراوە زانستییە نوێیەکان. بەڵکو لەمە زیاتریش هەروەکو ساغمان کردەوە، خوێنەر هەندێ وتەی زانستی وای تێدا دەدۆزێتەوە کە ئەستەمە وێنای ئەوە بکرێ مرۆڤێك لە سەردەمی موحەممەددا(درودی خوای لێ بێت)

توانیویـەتی دایبنـێ، بـەم پێیـە زانیارییـە زانسـتییە نوێیـەکان ڕێ دەدات بـە تێگەیشتنی هەندێ ئایەتی قورئان کە تا ئێستا تەفسیرێکی دروستی بۆ نەکراوە.

بەراوردکردنی ژمارەیەك لە ڕیوایەتەکانی تەورات لەگەڵ ڕیوایەتی هـەمان بابـەت لە قورئـان جیاوازییـە بنەڕەتییـەکانی نێـوان قسـە ناپەسـندکراوەکانی تـەورات لـە ڕووی زانستییەوە و وتەکانی قورئان کـە تـەواو لەگـەڵ پێـدراوە نوێیـەکانی سـاز و کۆکـە دەردەخـات: لـە میانــەی هــەردوو ڕیوایــەتی خولّقانــدن و لافاوەکــەوە بەڵگەیەکمان لەسەر ئەمە بینی. لە کاتێکدا لە دەقی قورئان سەبارەت بە مێـژووی دەرچوونی موسا زانیارییەکی بەنرخ دەبینین کە دەخرێتە پاڵ ڕیوایەتی تـەورات و وا دەکـات هــەردوو ڕیوایەتەکـە تــەواو کـۆك و سـاز بێـت لەگـەڵ پێـدراوەکانی شوێنەوارناسی کە ڕێ دەدات بە دیاریکردنی سەردەمی موسا، بەڵام سـەبارەت بـە بابــەتی تــرەوە جیــاوازی زۆر گــرینگ دەبیــنین کــە هــەموو ئــەو بانگەشــانە دەپووچێنێتەوە کە کەمترین بەڵگەشیان نییـە گوایـە موحەممـەد(درودی خـوای لێ بێت) قورئانی لە تەوراتەوە وەرگرتووە.

مرۆڤ ناتوانێ وێنـای ئـەوە بکـات کـە زۆرێـك لـە وتـە زانسـتییەکان لـە دانـراوی مـرۆڤن، ئەمـەش بـە هـۆی دۆخـی زانیارییـەکان لـە سـەردەمی موحەممـەد(درودی خوای لێ بێت). بۆیە تەواو ڕەوایە کە وەها تەماشای قورئان بکرێت کە گوزارشـتی وەحییــە لــە خــواوە و دەبــێ شــوێن و پایەیــەکی تایبــەتی بــدرێتێ چــونکە ڕاستودروستی بابەتێکە ناکرێ گومـانی لێ بکـرێ بـە جۆرێـك لـەخۆگرتنی پێـدراوە زانستییە لێکۆڵراوەکانی ئەم سەردەمەمان وا دەردەخات کە گژبەری(تحدی)ی هەر تەفسیرێکی وەزعی دەکات. بە ڕاستی ئەو تەقەلایانە نەزۆکن کە هـەوڵ دەدات کـە تەنها بە پشتبەستن بە ئیعتیباراتی ماددی تەفسیرێك بۆ قورئان بدۆزێتەوە......

– شەوی ٢٠١٦/٤/١٣ لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بوومەوە...

# ناومرۆك




لــەم کتێبــەدا؛ د.مــۆریس بۆکــای لــە ڕێــی چــەند لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەی بەراوردکارییانە لە نێوان هەر سێ کتێبــی ئاسمــانی: (تــەورات و ئینجیــل و قورئــان) و (زانســتی نوێ)دا دەیسەلمێنی کە دووانەکەی یەکەم دەستی مرۆڤیان گەیشتووتێ و هەڵە و ناسازی و زانیاریی چەوتی کەوتووتێ، بەڵام قورئان دەستێکی پاك پاراستوویەتی و دەسکاریی مرۆڤ نەیشێواندووە، هاوڕێکی زانستە و هیچ دەقێکی تێدا نییە پێچەوانەی زانستی نوێ بوەستێتەوە، بۆیە ناچێتە عەقڵەوە کەسێك کە لە ژینگەیەکی دوور لە زانست پەروەردە بووبێت بتوانێت کتێبێك دابنێ کە دوای زیاتر لە چواردە سەدە هیچ بڕگەیەکی تێدا نەبێ دژ بە زانست بوەستێتەوە، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە قورئان دانراوی خودایە و هیچ پەیوەندییەکی بە دانان و داڕشتنی (موحەممەد)ی پێغەمبەرەوە نییە.. (وەرگێڕ)

نرخی: 10000 د.ع.

Designed by CMYK Studio